ZANYAR bookstore

چاپی سێیەم

# ڕۆڵی زانایانی موسوڵمان لە پێشکەوتنە زانستییەکاندا



نووسینی:

د. کاوە فەرەج سەعدون








کــتێبخــانـەی زانیار
ZNYAR BOOKSTORE

ناوی کتێب : رۆڵی زانایانی موسوڵمان لە پێشکەوتنە زانستییەکاندا

نووسینی : د. کاوە فەرەج سەعدون

بەرگ : ئیبراهیم ساڵح

تیراژ : ١٠٠٠ دانە

نۆبەتی چاپ : یەکەم

شوێنی چاپ : ئێران





Zanyar Bookshop
for printing and publishing
Sulaimany - Piramerd St.



کتێبخانەی زانیار
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
سلێمانی - شەقامی پیرەمێرد

07501121801 07702222460 07702233946

Zanyar Bookshop
Zanyar_bookshop
Zanyarbook@yahoo.com

# رۆڵی زانایانی موسوڵمان
# له پێشکه‌وتنه زانستییه‌کاندا

نووسینی:
د. کاوه فه‌ره‌ج سه‌عدون

چاپی سێیه‌م
١٤٤٠ی کۆچی – ٢٠١٩ی زایینی
پوخته‌کراوه و بۆی زیادکراوه

# رۆڵی زانایانی موسوڵمان لە پێشکەوتنە زانستییەکاندا

نووسینی: د. کاوە فەرەج سەعدون

ژمارەی سپاردن: (٨٣٥)ی ساڵی (٢٠٠٧)ی پێدراوە

نۆرەی چاپ: سێیەم

ساڵی چاپ: ١٤٤٠ك - ٢٠١٩ز

چاپ وبڵاوکردنەوەی: کتێبخانەی زانیار

# پێشکەش بێت بە:

- زانا کۆڵنەدەرەکانی مێژووە پرشنگدارەکەمان، ئەوانەی ساتێکی تەمەنیان بەفیڕۆ نەدا تەنها لەرێی زانست و زانیارییدا نەبێت.
- بەو کەسە بەوویژدان و وەفادارانەش کە رۆڵی بێوێنەی ئەوانیان فەرامۆش نەکردووە وهەمیشە لەیادیانە.
- بەوانەی شانازی بە مێژوو و باوباپیرانی خۆیانەوە دەکەن وگوێنادەنە تانە وتەشەری بێوەفایان.
- بەهەموو کەسێك کە بەدوای راستیدا دەگەڕێت.

# پێشەکی چاپی سێیەم

یەکەم چاپی ئەم کتێبە لەلایەن پرۆژەی تیشکەوە بڵاوکرایەوە، چاپی دووەمیش لەلایەن کتێبخانەی ساراوە لە سلێمانی بڵاوکرایەوە، ئێستاش لەبەر بوونی داواکاری لەسەر ئەم بەرهەمە چاپی سێیەمی دەکەوێتە بەردەست خوێنەران.

لەم چاپەدا پێداچوونەوەم کردووە بۆ بابەتەکان لەرووی زانستیەوە و پاکنووسیشم کردۆتەوە لەرووی زمانەوانی و هەڵەکانی چاپەوە، هەندێك زیادکردنیشم کردووە لەو شوێنانەی پێویست بووبێت، لەرووی شێوازی چاپکردنیشەوە بە دیزاینێکی نوێوە دەکەوێتە بەردەستی خوێنەران.

لەراستیدا بابەتی رۆڵی زانا موسوڵمانەکان لە مێژوودا بەگشتی و لەبابەتی پێشکەوتنی زانستیشدا بەتایبەتی یەکێکە لەو بابەتانەی گرنگی خۆی پێنەدراوە، وبەتایبەتیش بە زمانی کوردی بەرهەمی زۆر کەم هەیە لەم بوارەدا، دەرخستنی ئەو رۆڵە گەورەیەی زانا موسوڵمانەکان بینییان لە پێشخستنی زانست لە هەموو بوارەکاندا خۆی لەخۆیدا ئەو گومانەش دەڕەوێنێتەوە کە هەندێك لە نەزان و نەفامەکان دەیانەوێت بیوروژێنن کە ئیسلام هانی زانست و پێشکەوتن نادات و مرۆڤ بەرەو دواوە دەباتەوە.

کاتێك دەڕوانینە سەدە زێڕینەکانی مێژووی شارستانییەتی ئیسلامی، بەتایبەتی لەسەدەی هەشتەم تا سەدەی پانزەیەمی زایینی و دواتریش، دەبینین موسوڵمانان پێشەنگی زانست و پێشکەوتن بوون لەجیهاندا، و ئەو هەوڵانەی ئەمان بوو کە بووە مایەی برەودان بە ڕەوڕەوەی زانست و پێشکەوتن لە هەموو جیهاندا، دانراو وداهێنراوەکانی زانایانی موسوڵمان

مایەی سوود گەیاندن بوو لەهەموو جیهاندا و یەکێك بوو لە پاڵنەرە گەورەکان بۆ پێشکەوتنی زانستی لای میللەتانی سەر زەوی بەگشتی.

بەتایبەتیتریش پێشکەوتنی زانستی ئەمڕۆ لە جیهاندا زانا موسوڵمانەکان بناغە بۆ دانەری بوون، وگەورەترین کاریگەرییان هەبوو لەسەر ڕۆژئاواییەکان بۆ بەرەوپێش چوون و گرتنی ڕێبازی زانستی، ئەویش بە دانپێدانانی خۆیان لە نووسینەکانیاندا.

پاش خوێندنەوەی ئەم کتێبە چەندین زانیاری گرنگی ترت لەم بارەوە بۆ ڕووندەبێتەوە.

# پێشەکی چاپی یەکەم

**سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری جیهان، درووود و سەلام بۆ سەر گیانی پێشەوای مرۆڤایەتی محمد (ﷺ) ........**

بەهۆی جۆری کارەکەمەوە (وەك پزیشکێك) و تێکەڵاویم لەگەڵ ئەو کەسانەی کە لەبواری زانستیدا کاردەکەن، زۆر جار دووچاری ئەو گفتووگۆیە دەبمەوە کە گوایە موسوڵمانان هیچ جۆرە رۆڵێکیان نەبووە لە پێشکەوتنی زانستیدا و زانایەکی ئەوتۆیان تێدا هەڵنەکەوتووە کە جێدەستی دیار بێت و رۆڵێکی بەرچاوی هەبووبێت لە بەرەوپێش بردنی زانست و مەعریفەدا، زۆر کەسیش ئەم ووتەیە دەکاتە بەهانەیەك بۆ رەخنە گرتن لە ئاینی ئیسلام خۆی کە گوایە مرۆڤ هان نادات بۆ زانست و دۆزینەوە و گەڕان بەدوای نهێنیەکانی گەردووندا، و باری دواکەوتووی ئەمڕۆی جیهانی ئیسلامی لەزانستدا دەکەنە بەڵگە لەسەر ئەم ووتەیەیان.

بێگومان ئەم بۆچوونانە نەزانییەکی گەورە لەخۆ دەگرێت سەبارەت بە مێژووی گەشە کردنی زانست و مێژووی دۆزینەوە زانستییەکان، چونکە ئەوەی تەنها زانیارییەکی کەمیشی دەربارەی ئەو مێژووە هەبێت بە هیچ جۆرێك ئەو راستییە پشتگوێ ناخات کە موسوڵمانان مێژوویەکی درەوشاوەیان هەبووە لە بواری زانستەکان و پێشکەوتنیاندا، وبۆ ماوەی چەند سەدەیەك تەنها زانا موسوڵمانەکان رابەرانی دۆزینەوە وپێشکەوتنە زانستییەکان بوون لە هەموو بوارە زانستییەکاندا، وتا ئەمڕۆش جێدەستیان بە ئاشکرا دیارە وزانایانی بەوویژدانی ئەمڕۆش دانیان بەم راستییەدا ناوە.

لەلایەکی تـرەوە ئەوانەشـی کـە کـەمێك لـەم بوارەیـان بیسـتووە، بـە تایبەتی لەرێی پرۆگرامـەکانی خوێندنـەوە، لەبەرئـەوەی ئـەم پرۆگرۆزامانـە لەلایـەن کەسـانی نەتەوەپەرسـتی عەرەبـەوە دانـراون (بـە تایبـەتی لـە سەردەمی رژێمی بەعسدا)، ئـەم دەسـتکەوتانەیان تەسـك کردۆتـەوە وبـە تـەنها بـە دەسـتکەوتی نەتـەوەی عـەرەبی دادەنـێن، ورۆڵـی ئـەو سـەدان زانایەی تر لە میللەتـەکانی تـری وەك (تـورك و فـارس و کـورد و بەربـەر) وئەوانی تریان فەرامۆش کردووە، هەربۆیە خەڵکانی لای خۆمـانیش رەتـی ئەم بابەتە دەدەنەوە وبە چاوێکی گاڵتەجاریی سەیری دەکەن.

لـە گفتوگۆیەکمـدا لەگـەڵ کەسـێکی مارکسـیزمدا بـە شـێوەیەکی گاڵتەجاریی دەیـووت: کەسـێك نـەبووە لـە مێـژووی ئیسـلامدا داهێنـانێکی زانستی هـەبێت، تـۆ باسـی (عەبباسـی کـوڕی فـەرناس) و (حەسـەن بـین ئەلهەیسەم) بـۆ مـن مەکـە چـونکە ئەمانـە عـەرەب بـوون وسـەرکەوتووش نەبوون؟!

جـا مـن بـۆ رەتدانـەوەی ئـەم ووتانـە ودەرخسـتنی راسـتییەکان لەمبارەیەوە بڕیاری دانانی ئەم کتێبەمدا، کە باسی رۆڵـی دەیـان وسـەدان زانای موسوڵمان دەکات لە مێژووی پێشکەوتن ودۆزینەوە زانسـتییەکاندا، ومنەتباریی زانستی نوێی ئەمڕۆش بۆ هەوڵەکانی ئەوان دەردەخات.

زانسـت وەك زۆرێـك لـە زانایـان وفەیلەسـووفەکان دەڵـێن بریتییـە لـە یەکەیەکی کامڵ ولـە چـەند بەشێکی یـەکتری تەواوکـەر پێکدێت، زانست شـتێکی جیهانیـە ومـوڵکی چـەند کەسـانێك یـان نەتەوەیـەك یـان چـەند نەتەوەیـەك نییـە، بـەڵکو مـوڵکی هـەموو مرۆڤایەتیـە هـەر لـە سـەرەتای پەیدابوونی ئادەمیزادەکانەوە، کـە بـە هـەوڵی هـەموو مرۆڤـەکان پێکـەوە

گەشەی کردووە ویەکەکانی تەواوبووە، وگەشتۆتە ئەو قۆناغەی کە ئەمڕۆ پێی گەیشتووە، کەواتە پێشکەوتنی زانستی هەوڵێکی بە کۆمەڵی مرۆڤەکان بووە ومەبەست پێی بریتی بووە لە باشتر کردن وئاسان کردنی ژیان وگوزەرانی مرۆڤەکان، بەم پێیە هەوڵی زانا موسوڵمانەکان لەم بوارەدا قۆناغێکی گرنگ بووە لە مێژووی زانستدا ویەکێکە لەوبناغانەی کە زانستی ئەمڕۆی لەسەر دامەزراوە.

لەبەر گرنگی ئەم بابەتە لە دەرخستنی زنجیرەی سروشتیی ئەو هەنگاوانەی کە بوونە هۆی دۆزینەوەی راستیيە زانستیيەکان ودەستکەوتە تەکنەلۆجیەکان دەبینین لەهەموو لایەکی جیهاندا گرنگیەکی تەواوی پێدەدرێت، کە خۆی دەبینێتەوە لە دامەزراندنی بەشەکان ودەزگا ئەکادیمیەکان لەم بوارەدا لە زوربەی زانکۆکانی جیهاندا، ودەرکردنی زیاتر لە ١٠٠ بڵاوکراوەی دەوری تایبەتمەند لەبواری مێژووی زانستدا، هەروەها بەستنی کۆنگرە نێودەوڵەتیەکان لەسەر مێژووی زانست وتەکنەلۆجیا بە شێوەیەکی دەوری هەموو٣ بۆ ٤ ساڵێك لە ساڵی (١٩٢٩)ی زایینیەوە، کە تا ئێستا گەشتۆتە ٢٢ کۆنگرە کە یەکێکیان لە شاری (قودس)ی پیرۆز بەسترا لە ساڵی (١٩٥٣ن)دا، لەگەڵ ئەمانەدا چالاکیەکی چڕوپڕ هەیە لەهەموو لایەکی جیهاندا بۆ وەرگێڕان وبڵاوکردنەوە وزیندووکردنەوەی کەلەپووری زانست وبەرهەمی کەسە ناودارەکانی لەهەموو لقەکانی مەعریفەدا.

ئێمەی موسوڵمان باوەڕمان وایە کە یەکێك لە رووەکانی بەخشندەیی خوای پەروەردگار ئەوەیە کە رێزێکی گەورەی لە موسوڵمانان ناوە بەوەی لەناویاندا چەندین زانای بلیمەت وهەڵکەوتوو وخاوەن داهێنان

دەرکەوتوون، کە بوونە مەشخەڵ، وچرای شارستانێتی مرۆڤایەتیان بۆ ماوەیەکی دوور ودرێژ پرشنگدار کرد، وەك ووتمان ئەمە بووە هۆی ئەوەی زۆرێك لە کەسانی خاوەن وویژدان کە دوای ئەوان سوودیان لە کارەکانیان وەرگرت دانبنێن بە لەپێش دەستی وفەزڵی گەورەیان بەسەر پێشکەوتنە زانستییەکانی ئەمڕۆماندا، ئەم هەڵکەوتووە موسوڵمانانە لە نەتەوەکانی: عەرەب وکورد وفارس وتورك وهیندی وبەربەر، وچەندینی تر بوون، کە چەندین سەرکەوتنیان بۆ ئیسلام تۆمار کرد، وئەوەیان دووپات کردەوە وتەئکید کرد کە ئیسلام ئاین وشارستانیەتێکە هیچ کەسێکی تر ناتوانێت هاوشێوەی بێت لە گەورەیی ومرۆڤدۆستیدا.

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەرچاوەکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام، دەبینین بانگەواز دەکات بۆ یەکسانی لە ئەرك ومافەکاندا، وبۆ ئازادی مرۆڤ، وهەروەها بۆ زانست لەبەرئەوەی کە بناغەیەکی سەرەکی جێبەجێکردنی پەروەردەی راست ودروستە کە ئامانجی بانگەوازی ئیسلامیە، ئیسلام یەکەم لایەنە کە بانگەوازی کرد بۆ فێربوونی زانست وگەڕان ولێکۆڵینەوە، بەرزترین هاندانی تێدایە بۆ داهێنانکاریی ودۆزینەوە، وپەردە لابردن لەسەر شاراوەکان، وڕوانین وسەرنجدان لە دروستکراوانی ئاسمان وزەوی، ئەوەندە بەسە یەکەم ئایەتی قورئان کە هاتە خوار فەرمووی: ﴿إِقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ﴾ (العلق:١)، واتە: بخوێنە بەناوی ئەو پەروەردگارەت کە دروستکەرە.

زۆر فەرموودەی پێغەمبەریش (ﷺ) هەیە لەسەر واجب بوونی فێربوونی زانست وهەوڵدان تیایدا وبەدەست هێنانی، هەروەها قورئان کەسانی زانای جیاکردۆتەوە لە خەڵکانی تر وپلەی بەرز کردوونەتەوە کە

دەفەرموێت: ﴿يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ (المجادلة:١١)، واتە: خودا پایەی ئەو کەسانە بەرز دەکاتەوە لەئێوە کە بڕوایان هێناوە وئەوانەی کە زانستیان پێبەخشراوە بەچەند پلەیەك پایەیان بەرزدەکاتەوە.

هەروەها کاربەدەستان وبەڕێوەبەرانی وولآت لە چاخە ئیسلامیەکاندا گرنگی زۆریاندا بە زانست وزانایان، ئەو ژینگە ئیسلامییە بوو بەبناغەیەك بۆ گەشەکردنی زانستیی لەهەموو بوارەکانی زانست ومەعریفەدا، زانستەکان پێشکەوتنی گەورەیان بەخۆیانەوە بینی: زانستی پزیشکی پێشکەوت وپلەی بەرزبووەوە کە لەپێشدا لەسەر ئەفسانە وخورافات وەستابوو، کشتوکاڵ وپیشەسازی وبازرگانی ودام ودەزگا جۆراوجۆرەکان پێشکەوتنی گەورەیان بەخۆوە بینی، بەم شێوەیە ئوممەتی ئیسلامی لە چالاکییە بیریاریی وژیرییەکاندا وەك: ئاوەدان کردنەوە وزانستەکان وهونەر ... گەیشتنە پلەیەکی ئەوەندە بەرز کە بوونە هۆی کارکردنە سەر شارستانیەتەکانی تری دوای خۆیان وفاکتەرێکی سەرەکی بەرەوپێش بردنیان بوون.

ئەم بلیمەتە موسوڵمانانە ئەو لەپێش دەستیانەیان وداهێنانەکانیان یان لەژێر کاریگەریی راستەوخۆی دەقە شەرعیەکاندا بوو، یان هاندەریان ئەودەقە ئاینیە پیرۆزانە بوون کە بەگشتی هانی بەدەستهێنانی زانست وکارکردن دەدەن، کەواتە دەستکەوتەکانیان دەگەڕێتەوە بۆ ئاینی پیرۆزی ئیسلام وکۆمەڵگەکەی ودەوڵەتەکەی، ئەم زانایانە لە زۆرێك لە بوارە زانستیەکاندا هەڵکەوتوو بوون، دەیانبینین هەڵکەوتوو بوون لە زانستە ئاینیەکان وشەریعەت ویاساداناندا، لە حیکمەت وبیریاریی

ئەدەبدا، هەروەها لە زانستە سروشتیە جۆراوجۆرەکانیشدا، وەك: گەردوونزانی وپزیشکی وزیندەوەرزانی وفیزیا وکیمیا وبیرکاری وهەندەسە وجوگرافیا وفەلسەفە وکۆمەڵناسی و....هتد، کارە شارستانیەکانیان باشترین شایەتە لەسەر بەرهەمی بەپیتی ژیرییان لە بوارەکانی زانست وکارکردندا.

لەلایەکی ترەوە ئەم هەوڵە زانستیانەی موسوڵمانان لە کاتێکدا بوو کە زوربەی شارستانیەتەکانی ئەو سەردەمە باوەڕیان بە خورافە وئەفسانە هەبووە وەك شتێکی بەڵگە نەوویست وچووبووە ناخی بیروباوەڕیانەوە، بۆ نموونە یەکێك لە شارەستانیەتە ناسراوەکان لەو سەردەمانەدا شارستانیەتی چینییەکان بوو، بیروباوەڕ وبۆچوونی چینییەکان دەربارەی گەردوون ئەوەبووە کە: ٢ هێز هەیە فەرمانڕەوایی جیهان دەکەن، یەکەمیانکە ناوی (ین Yin)ە وهێزێکی نێگەتیڤانەی مێینەی تاریکە، وئەوی تریان ناوی (یان Yan)ە کە هێزێکی پۆزەتیڤانەی نێرینەی رووناکە، ئەم ٢ هێزەن کە کۆنترۆڵی جیهانیان کردووە ودیاردە سروشتیەکانیش لە ئەنجامی کارلێکی نێوان ئەم دووانەدا دروست دەبێت، هەربۆیە بیروباوەڕی چینییەکان زیاتر بەرەو سیحر وجادووگەری دەچوو، ئەویش بە مەبەستی بەکارهێنانی سیحر بۆ راگرتنی هاوسەنگی نێوان ئەم ٢ هێزە، بە مەبەستی بارینی بارانی پێویست بۆ کشتوکاڵ وبەخێوکردنی مەڕوماڵات.

دەربارەی مرۆڤیش باوەڕیان وابووە کە دوو رۆح (گیان)ی هەیە (Two Souls)، یەکەمیان لەکاتی دووگیانیدا ولەسکی دایکدا بۆ منداڵەکە دروست دەبێت وگیانێکی ئاژەڵییە (Animal Soul) کە لە

کاتی مردندا لەگەڵ لاشەدا دەچێتە گۆڕەوە، ودەتوانرێت خۆراکی پێبدرێت بە پێشکەش کردنی قوربانی بۆ مردووەکان، وبە بەردەوامی دەچێت بەناخی زەویدا تا لە جیهانێکی ژێرینەی نادیاردا جێگیر دەبێت، گیانەکەی تریش پێیاندەووت گیانی روحی (Spiritual Soul) کە لە کاتی لەدایکبووندا دروست دەبێت ولەکاتی مردندا بەرزدەبێتەوە بۆ ئاسمان ولەناو ئەستێرەکاندا دەژی؟!!.

با زیاتر باسی بیروباوەڕ وبۆچوونی میللەتانی تری ئەو سەردەمانەش نەکەین!! چونکە هەرچی ئاینەکان هەبوون هەموویان کەوتبوونە ناو زۆنگاوی بتپەرستییەوە، ئاینی بوزی کە رێژەیەکی ئێجگار زۆری خەڵکی رۆژهەلات وناوەراستی ئاسیا هەڵگری بوون بووبووە بتپەرستییەکی تەواو بۆ پەیکەرەکانی (بووزا)، هەروەها لە هیندستان لەو کاتانەدا (بە تایبەت پێش هاتنی ئیسلام) وەك مێژوونووسان باسی دەکەن زیاتر لە ٣٣٠ ملیۆن بت وپەیکەر هەبووە کە خەڵکی پەرستوویانە، بەشێوەیەك کە هەمووشتێکی جوان وسەرنجراکێش وهەموو لایەنێکی ژیان پەیکەرێکی بۆ دروستدەکرا ودەپەرسترا!!!

سەبارەت بە بارودۆخی ئەورووپاش، با گوێ لە نووسەری ئینگلیزی (Robert Briffault) بگرین کە لە کتێبی ( The Making of Humanity) (لا ١٦٤)دا باسی بارودۆخیان دەکات لەو کاتانەدا کە دەڵێت:

{شەوێکی دەیجوور وتاریك باڵی بەسەر ئەورووپادا کێشا لە سەدەی پێنجەم تا سەدەی دەیەمی زایینی، وەحشیگەریی وهەمەجیەتی ئەوکاتە زۆر خراپتر بووە لە هەمەجیەتی سەردەمانی پێشتر، چونکە ئەورووپا زۆرتر لە لاشەیەکی بۆگەنی شارستانیەتێکی گەورە دەچوو، کە

بنـەماكانى ئـەم شارسـتانیەتە وونبـوو بـوون ونـەمابوون، ئـەو وولآتـە گەورانەش كە ئەم شارستانیەتە لە كۆندا لەناویاندا گەشەی كرد وگەیشتە لوتكـە وەك: ئیتالّیـا وفەرەنسـا، بووبوونـە نێچـیری كاولكـاری وفـەوزا وداروخان}، هەر لە دووتوێی ئەم كتێبەشدا نموونەی زۆر زیـاتر دەبینـین لەسـەر دواكـەوتوویی گـەلانی ئەوسـەردەمانەی هاوسـەردەمی شارستانییەتی ئیسلامی بەگشتی وئەورووپا وڕۆژئاوا بە تایبەتی.

ئەمانە چەند نموونەیەك بوون لە حاڵ وبیروباوەڕی ئـەو نەتەوانـەی تـر لەسەردەمی ئیسـلامیدا، لـە كاتێكدا كـە زانـا موسـوڵمانەكان گـەورەترین دەستكەوت وداهێنانانیـان دەكرد لـە بوارەكـانی بیركـاری وفیزیـا وكیمیـا وپزیشـكی وزیندەوەرزانیـدا، وپـەردەیان لەسـەر نهێنییـەكانی گـەردوون ولەشی مرۆڤـ هەڵدەدایەوە.

دەسـتكەوت وداهێنانـە زانسـتییەكانی هـەر نەتەوەیـەك ڕوویەكـە لـە ڕووەكانی شارستانییەتەكەی، زانستیش پێویستی بە مێژوویـەك هەیـە كـە قۆناغەكانی گەشە كردنی، وژیاننامە وكـاری پیـاوانی وپێشـەواپانی تۆمـار بكات، تەنها ئەوەندە بـەس نییـە كـە ئاگـاداری ژیاننامـە وداهێنانـەكانیان بـبین لـە بـوارە زانسـتییەكاندا، بـەڵكودەبێت ئەمـە هانـدەر بێـت بـۆ بەرەوپێش بردنی خۆزگەكان وهەوڵەكانمان لە ڕێگای زانست وكاركردندا.

گـرنگترین شـتێك لـە مێـژووی میللەتانـدا بریتییـە لـە دەسـتكەوتە شارستانیەكانی وەك: بەردەوام بـوون لەسـەر ڕێگـە وڕێبـازێكی ڕاسـت لـە ژیانـدا، وچەسـپاندنی دادپـەروەری، وپێشـكەوتن لـە بـواری زانسـت وكاركردندا.

ئەوەی بە وویژدانەوە بڕوانێتـە ئـەم لایەنانـەی شارسـتانێتی ئیسـلامی دەبینێت بێوێنەیە لە دەستكەوتەكانیدا، بۆیە پێویستە ئەم دەسـتكەوتانە بخرێنـەڕوو بەتایبـەتی لـە بـواری داهێنانـە زانسـتییەكاندا، پێشـكەوتنی زانستی ئەمڕۆش لەزۆر بواریدا منەتباری زانا سەرمەشقە موسوڵمانەكانە.

لەلایەکی ترەوە موسوڵمانان سوودیان لە زانیارییەکانی میللەتانی پێش خۆیان وەرگرت وپاراستیان لە فەرتان، وهەروەها بەرەوپێشیشیان برد، لەوانە نەتەوەکانی: فارس وهیندستان وچین ویۆنان وڕۆمانیەکان، خاڵێکی پرشنگداری مێژووە زانستییەکەیانە کە زانیاریی کەسیان بە کەم نەزانیوە (وەك زۆرێك لە کەسان ومیللەتانی تر سپڵە وبێوەفا نەبوون) وسوودیان لێوەرگرتووە، دەتوانین بڵێین موسوڵمانان زانستی گەورەیان داهێنا، ودۆزینەوەی نوێیان بۆ مرۆڤایەتی دەستەبەر کرد، وەك سەلمێنەرێکی ئەو ڕاستییەی کە ئاینی پیرۆزی ئیسلام گەورەترین ئاینە، کەواتە دەتوانین زانستی موسوڵمانان بە زانستێکی جیهانی وەسف بکەین، چونکە بەشداری میللەتان وزمانەکانی تری (وەك: سریانی وسەنسکریتی وفارسی وئیغریقی ولاتینی) تێدابووە ولە دواییشدا هەموو میللەتانی تری سەر زەوی سوودیان لێوەرگرتووە.

لێرەدا ووتەی ٢ بیریاری فەڕەنسی بە نموونە دێنمەوە لەسەر ڕۆڵی بەرزی موسوڵمانان لە پێشکەوتنە زانستییەکاندا، (کوندورسیە) دەڵێت: (زانستی موسوڵمانان بەردەوامبوون ودرێژەپێدەری پێشکەوتنی ڕووناکی ورووناکبیری بوو لە سەردەمانێکدا کە ئەفسانە وتاریکایی هەموو دونیای داگیر کردبوو)، هەروەها (مونتوکلا) دەڵێت: (لێکۆڵینەوەی مێژووی زانستی موسوڵمانان زۆر پێویستە نەك تەنها بۆ کێشانی تەواوی پێکهاتەکانی لەوحە مێژووییەکەی گەشەکردنی زانست، بەڵکو بۆ چەسپاندنی ڕووداوە مێژووییەکانی هەر لقێك لە لقەکانی زانست ومەعریفە)، هەروەها چەندین ناسراوی ڕۆژئاوایی تر هەمان بۆچوونیان هەیە وەك: (کوسین دوپرسیڤال، دیلەمبەر، ج. ج. سیدیو، ڕەسکا، کارپنسکی، و وایدمان).

ئیتر با دواکەوتوویی ئەمڕۆی جیهانی ئیسلامی نەکرێت بە بەڵگە بەسەر ئاینی ئیسلامەوە، چونکە لەو سەردەمانەی کە شەریعەت وپەیامی

ئیسلام حوکمڕان بوو وکاربەدەستان ومیللەتیش ملکەچی بوون (هەر لە سەرەتای هاتنی پەیامەکەوە تا چەندین سەدەش)، گەورەترین وەرچەرخان لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا ڕوویدا لە هەموو بوارەکانی مەدەنیەت وشارستانیەتدا، بواری زانستیش یەکێك بوو لە دیارترین دەستکەوتەکانی زانا موسوڵمانەکان ولە وڵاتی ئیسلامەوە زانست پرشنگی دەدا بۆ هەموو جیهان، کە انشاءالله کەمێکی لە دووتوێی ئەم کتێبەدا دەخەینە بەردەست.

بەڵام کاتێك موسوڵمانان دوور کەوتنەوە لە سەرچاوە پاکەکانی ئاینەکە وئامۆژگارییە خوداییەکانیان پشتگوێ خست لەم سەدانەی دواییدا، وگوێیان بە هۆکارەکانی پێشکەوتن نەدا وەك پێویست، تووشی نسکۆ بوون لە هەموو بوارەکاندا، و بەتایبەتی لە کاروانی پێشکەوتنی زانستی دواکەوتن ومیللەتانی تر بوونە سەرمەشقی ئەم بوارە چونکە هەموو هۆکارەکانی پێشکەوتنیان بۆ دەستەبەرکرد، لەگەڵ بوونی کەسانی دڵسۆز وبلیمەتدا.

من لەم کتێبەدا هەوڵ دەدەم بە یارمەتی پەروەردگار کەمێك لە دەستکەوتە زانستییەکانی زانا موسوڵمانەکان باس بکەم لە بوارە زانستییە جۆراوجۆرەکاندا، هەروەها دەرخستنی ژیاننامە وکارەکانی پۆلێك لە کەڵەزانایانی مێژووی ئیسلامی، دواتریش هێنانەوەی چەند نموونەیەك لە دانپێدانان وگەواهیدانی زانایانی ڕۆژئاوا بەم ڕاستییە.

هیوادارم ئەم کارە مایەی سوودی هەموو لایەك بێت وپەردەیەك لابدات لەسەر چاوی ئەوانەی چەواشە کراون، ودەمکوتکەرێکی چەواشەکارانیش بێت.

نووسەر

٢٠٠٧/٥/٢٠

شارستانییەتی ئیسلامی پێشڕەو بووە لە زانستەکانی: پزیشکی و ئەندازیاری و ماتماتیک وکیمیا وزانستی گەردوون وکشتوکاڵ وجیۆلۆجیا (زەویناسی) وئابوری وڕامیاری ... وهتد، تەنها ئەوەندە هەیە زۆربەی ئەوبابەتانە ناوە کۆنەکانیان گۆڕاون لەم سەردەمەدا، چونکە توێژەرانی (ئەورووپی) گۆڕیویانەتە سەر شێوەزاری خۆیان لەپاش ئەوەی ئەوان زانستەکەیان وەرگرت وتێیدا شارەزا وسەرکەوتوو بوون، وموسوڵمانان کەمتەرخەم بوون وزانستیان پشتگوێخست.

لە سەردەمە ئیسلامییەکاندا زانستی میکانیک پێی دەووترا (علم الحیل)، زانستی جوگرافیاش پێی دەووترا ڕۆژژمێری وولاتان (تقویم البلدان)، وزانستی کۆمەڵناسی پێدەوترا ئاوەدانییەکان (العمرانیات)، زانستی (جیۆلۆجیا) پێی دەووترا (زانستی بەرد وچینەکانی زەوی)، وزانستی فیزیاش پێی دەووترا (علم الطبیعة) سروشتزانی، موسوڵمانان پێشەنگ بوون لەم زانستانەدا.

یەکێك لە بەڵگەکان لەسەر پێشکەوتنی بواری زانستی لەلای موسوڵمانان ئەوەیە کە خەلیفەی عەبباسی (هارون الرشید) بەدیاری سەعاتێکی نارد بۆ (شارلەمان)ی پادشای فەرەنسا ونیوەی ئەورووپا لەوکاتەدا، کاتژمێرێکی ئاویی بوو وبەئاو ئیشی دەکرد، بەشێوەیەك عەقڵی خەڵکی ڕۆژئاوای ڕاکێشابوو، تەنانەت وایاندەزانی ئەمە (سیحرە)، یان جنۆکەی تێدایە!

لێرەدا پێم باشە هەندێك لە دەستکەوتەکانی زانایانی موسوڵمان لە زانستە جۆراوجۆرەکاندا بخەمەڕوو:

**بیرکاری:**

بناغەی زۆرێك لە زانستەكانی ئەمڕۆیە، ولەم بوارە چەندین كەسی بەناوبانگیان تێدا پەیدابوو وەك: خەواریزمی (٨٤٤ز كۆچی دوایی كردووە، و(ثابت بن قرة) (٩٠١ز مردووە، وبەتتانی (٩٢٩ز مردووە)، وخازینی بەسری (٩٦٠ز مردووە)، و(عمر بن ابراهیم الخیام) كە (١١٣٢ز مردووە، لە ئەندەلوسیش (مسلمة المجریطي) یان (مەدریدی) پەیدابوو(١٠٠٧ز مردووە، لە قوتابیەكانیشی (إبن السمح)ە كە (١٠٣٤ز مردووە، و(عامر الصفّار القرطبي) و(الكرماني) و(أمیة بن أبي الصلت) وغەیری ئەمانیش هەبوون، هەروەها (إبن طاهر البغدادي) خاوەنی كتێبی (التكملة في الحساب)، و(یحیي بن یعیش الأموي) كە خەڵكی ئەندەلوسە ولە دیمەشق ژیاوە لە سەدەی چواردەیەمی زاینیدا وخاوەنی كتێبی (مراسم الإنتساب في علوم الحساب)ە، و(الكاشي) خاوەنی كتێبی (مفتاح الحساب).

زانایانی موسوڵمان ژمارە هیندییەكانیان وەرگرت ورێكیانخستن وژمارە (سفر)یشیان داهێنا، ولەمانەوە بۆ هەموو جیهان گوێزرایەوە وتا ئەمڕۆش ماوە [١].

ئاسانكردنی ئەم سیستمی ژماردنە بۆ كردارە بیركارییەكان لە بەراورد كردنی ئەمدا لەگەڵ سیستمی ژماردنی ڕۆمانیدا بۆمان دەردەكەوێت، چونكە لەم سیستمە نوێیەی ژمارەكاندا (كە ئەوروپا لە موسوڵمانانەوە

---

[١] بڕوانە: (إسهام علماء المسلمین في الریاضیات)/ دانراوی (د. علي عبدالله الدفاع)/ لاپەڕە (٤٢)، هەروەها: (قصة الحضارة) بەرگی حەوتەم (بەشی ١٣) لاپەڕە (١٨٠)، هەروەها: بابەتی (أوائل المسلمین في العلوم التجریبیة: د. أحمد هجوان) لە ئینتەرنێتەوە وەرگیراوە.

فێری بوون) دەتوانرێت نرخی هەر ژمارەیەك تێیدا بگۆڕدرێت ئەگەر بێت وخانەکەی بگۆڕدرێت (لە خانەی یەکانەوە بۆ خانەی دەیان یان سەدان یان هەزاران یان ملیۆنەکان)، بەڵام دەبینین کە نرخی ژمارە لە سیستمی رۆمانیدا ناگۆڕدرێت بە گۆڕانی خانەکەی، بۆ نموونە ژمارە (٥) کە بە پیتی (V) تەعبیری لێدەکرێت هەرگیز ناتوانێت تەعبیر لە (٥٠ یان ٥٠٠ یان ٥٠٠٠) بکات ونرخەکەی جێگیرە، هەربۆیە ئەگەر بمانەوێت بنووسین (٢٨) بە ژمارە لاتینییەکان بەم شێوەیە: (XXVIII)، کە ئەورووپا تەنها ئەمەی دەناسی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، جا لێرەدا تەصەوری ئەو ئاڵۆزییە بکە کە هاوکێشە بیرکارییەکان تێیدەکەوتن (لە کۆکردنەوە ودەرکردن ولێکدان ودابەشکردن) لەکاتی بەکارهێنانی ئەم ژمارانەدا، ئەمە لە ژمارە بچووکەکاندا وایە، ئەی دەبێت لە ژمارە گەورەکانی وەك (هەزاران وملیۆنەکاندا) چۆن بووبێت؟!!

لێرەدا با ئەو راستیەمان لا روون بێت کە ئەو ژمارانەی ئێستا لە رۆژئاوا بەکاردێن لە داهێنانی خۆیان نییە، بەڵکو بنچینەکەی لە هیندستانەوەیە (بەهۆی شێوازی نووسینەکەیەوە بۆمان دەسەلمێت کە لە چەپەوە بۆ راستە).




گەشەکردنی ژمارەکان لە مێژوودا

موسـولّمانان وەریـانگرت وریّکیانخسـت وگەیاندیانـە هـەموو جیهـان، بەتایبەتیش ئەوروپایان رزگارکرد لە ئالّۆزی سیستمی ژمـاردنی رۆمـانی، کە ئەمە خـۆی لەخۆیدا مایـەی شانازیە وهۆکـاری پیّشـکەوتنی بیرکـاری بوولە داهاتوودا.

زانـای موسـولّمان (الیعقـوبی) لـە میّژووەکەیـدا (کـە سـالّی: ٢٦٩ك – ٨٧٢ز داینـاوە) شـیکاری ئـەو سیسـتمە نویّیـەی ژمـاردن دەکـات کـە موسولّمانان لە هیندیەکانەوە وەریانگرت ودەلّیّت: {ئەو ٩ هیّمـا هیندیـەی کە بناغەی هەموو حیساباتیّکە ئەمانـەن: (١، ٢، ٣، ٤، ٥، ٦، ٧، ٨، ٩)، یەکەمیان دەتوانیّت ١ بیّت یان ١٠ یان ١٠٠ یان ١٠٠٠ یان سـەد هـەزار یـان هەزار هەزار، وبەم شیّوەیە هەموو ژمارەکانی تریش سـەردەکەون، لەگـەلّ ئەمەشـدا خانـەی یـەك ناسـراوە وخانـەی دە وهـەموو خانـەکانی تـریش، ئەگەر خانەیەکیش بەتالّ بیّت وهیچ نەبیّت ئـەوا (سـفر)ی تیّـدادەنریّت کـە بە بازنەیەکی بچکۆلە هیّما دەکریّت}[٢].

لیّـرەدا ئـەم زانایـە ئامـاژە بـە هیّمایـەکی حیسـابی نـویّ دەدات کـە (سفر)ە وبریتییە لە گـەورەترین وچارەنوسسـازترین بنەمایـەك کـە ژیریـی مرۆڤ پیّیگەیشتووە لە بیرکاریدا وموسولّمانان دایانهیّنا، رۆژئـاواش بـەهیچ شیّوەیەك بەکارهیّنانی (سفر)یان نەزانیوە تـاوەکو لـەریّی موسـولّمانانەوە پیّیـان گەیشـت لـە سـەدەی دوانزەیـەمی زاینیـدا، هەربۆیـە میّـژوونووس (ئایر Eyre) دەلّیّت: {بیرۆکەی داهیّنـانی (سـفر) بریتییـە لـە یـەکیّك لـە گـەورەترین ئـەو دیارییـە زانسـتییانەی کـە موسـولّمانان پیّشکەشـی ئەوروپایان کرد}.

---

[٢] بروانە (تأريخ اليعقوبي).

(a) Cambridge, Univ. Lib. [illegible] (C)
(b) Wien, Oster. [illegible] 275 (V)
(c) München, Clm 18927 (O)
(d) München, Clm 13021 (M)
(e) Geneva, Bib. Univ. E III 28 (G)
(f) Milano, Ambr. A 3 sup. (A)
(g) Paris, Bib. Nat. lat. 16[illegible] (P)
(h) Oxford, Bod. Lib. Lyell 52 (I)
(i) Admont, Stiftsbib. frg. 4

ئەو هێما ژمارەییانەی کە لە دانراوە ئەوروپییەکان وزانکۆکانی ئەوروپادا بەکاردەهێنرا لە سەدەی دوانزەیەمی زایینییەوە، کە بە ئاشکرا سەرچاوە عەرەبیەکانیان دەناسرێنەوە

(a) Oxford, Bod. Lib. [illegible] sup. 26 ([illegible])
(b) Milano, Ambr. M [illegible] sup. ([illegible])
(c) Oxford, Bod. Lib. Lyell 52 (I)
(d) Vaticano, Bib. Ap. Reg. lat. [illegible] (T)
(e) Paris, Bib. Nat. lat. 7359 (N)
(f) Paris, Bib. Nat. lat. 15461 (P)
(g) Paris, Bib. Maz. 3642 (M)
(h) Paris, Bib. Nat. lat. 16[illegible] (U)
(i) Erfurt, Amplon. Qu [illegible] (A)
(j) Dresden, Sächs. Landesbib. C 80 (D)
(k) Salamanca, Bib. Univ. 2338 ([illegible])
(l) Vaticano, Bib. Ap. Pal. lat. 1393 (L)

نموونەیەکی تر لە هەمان خشتەکەی پێشتر

له سەدەی هەشتەمی زاینییەوە موسولمانان (سفر)یان بەكارهێناوە لە حیساب كردندا (هەروەك لە دەقەكەی پێشووی (الیعقوبي)دا دەبیینین)، پاشان زانا (الخوارزمي) هات وچۆنێتی بەكارهێنانی ژمارە نوێكانی شیكردەوە (بە ژمارە سفریشەوە)، ئەویش لە یەكێك لە لێكۆڵینەوەكانی (الخوارزمي)دا كە ئەوروپییەكان وەریانگێڕایە سەر زمانی لاتینی لە چارەكی یەكەمی سەدەی دوانزەدا لەژێرناونیشانی: (Algoritmi de Numero Indorum)، واتە خەوارزیمی لە هیندیەكانەوە.

هەر لێرەوە زاراوەی (Chiffre) لە (سفر)ەوە وەرگیرا (كە لە زمانە ئەوروپییەكاندا بەمانای هیچ یان بێنرخ دێت)، هەربۆیە (مارتن لوثە ر) ئەم زاراوەیەی بەكارهێنا بۆ تەعبیركردن لە بێهێزی قەشەكان لە بەردەم (پاپا)دا كە ووتی: ئەوان وەك (سفر) وان، لە سەدەی شانزەیەمدا ئەم زاراوەیە بەكارهێنرا بۆ تەعبیر كردن لە نووسینی تەم ومژاوی یان شیفرە، ودوایی بوو بە زاراوەی (Zero) بەواتای (سفر)[٣].

كەواتە دەبینین رۆژئاوا ئەم سیستمە نوێیەی ژمارەكانی لە موسولمانانەوە وەرگرت وبەستیانەوە بەناوی (خەواریزمی)یەوە، كە پاشان ئەم ناوەی دەستكاری كراو بوو بە (Algoritmi) پاشان (Algorismus) ودوایی كورت كرایەوە بۆ (Augrim)، كە ئەم ووشەیەی دوایی بووبە ناوی ئەم سیستمە دەبیە نوێیە.

ئەمانە هەمووی ئەو راستیە دەسەلمێنن كە رۆژئاوا بیركاری نوێیان لە موسولمانان وبە تایبەتیش لە كتێبەكەی خەواریزمیەوە وەرگرت،

---

[٣] بروانە (المرجع في الحضارة العربية الإسلامية) لاپەرە (٣٢٨).

وهــەروەها لــەو كتێبــە بیركاریانــەی تــریش كــە خــەواریزمی سەرچــاوەی سـەرەكیان بـوو، وەك كتێبـەكانی: (Carmen de Algorisme) كـە ئەسـكەندەر دی ڤیلا (Alexandre de villa) لـە (١٢٢٠ز) دانـاوە و(Algorismus Vulgaris) كـە جـۆنی هالیڤـاكس ( John of Halivax) لە (١٢٥٠ز) دایناوە، ئەم ٢ كتێبە تا رادەیەكی زۆر پشتیان بە كتێبەكـەی خـەواریزمی بەسـتووە لـە بیركاریـدا، هـەر ئـەم ٢ كتێبـە تـا چـەندین سـەدە سەرچـاوەی سـەرەكی فێركردنـی بیركـاری بـوون لـە رۆژئاوادا، تـا رۆژگـاری ئـەمڕۆشمان زمـانی ئینگلیـزی زاراوەی ئـەلگۆریزم (Algorithm) یان لۆگاریتم كە دەستكاری كراوێكی نـاوی خەواریزمییـە بـەكاردەهێنێت بـۆ تـەعبیركردن لـەو رێگـا دانراوانـەی كـە شـیكاری مەسەلەكانی بیركاری پێدەكرێت [٤].

زۆر كـەس بـە هەڵـە وادەزانێـت كـە ئـەو ژمارانـەی ئـەمڕۆ لـە جیهانـدا بەكاردێن عەرەبی نین، بـەڵام بـابزانین كـە هـەردوو جـۆرە ژمارەكـانی كـە لەمڕۆدا لە زوربـەی هـەرە زۆری وڵاتـانی دونیـادا بـەكاردێن موسـوڵمانان دایانهێناون، هەروەك باسمان كرد لەگەڵ فەتح كردنی زۆرێك لە بەشەكانی وڵاتی (سیند وهیندستان) موسـوڵمانان تێكـەڵاوی زانیارییـەكانیان بـوون وسوودیان وەرگرت لە شێوازی نووسـینی ژمارەكـان لـەلایان ولەسـەر ئـەم بناغەیە شێوازی نووسینی ژمارەكانیان لە رۆژهەڵاتی ئیسلامیدا داهێنا كـە بەم شێوەیەیە: (٠، ١، ٢، ٣، ٤، ٥، ٦، ٧، ٨، ٩) وپێیـدەووترێت (ژمـارە هیندییەكان)، وتـا ئـەمڕۆش ئـەم ژمارانـە لـە وڵاتـەكانی رۆژئـاوای ئاسـیا ورۆژهەڵاتی ئەفریقا بەكاردێن.

---

[٤] بڕوانە (المرجع في الحضارة العربية الإسلامية) لاپەڕە (٣٢٨-٣٢٩).

پاشـان ئـەم ژمارانـە چـوونە وولآتـەكانی رۆژئـاوای جیهـانی ئیسـلامی (مەغریبی عەرەبی وئیسپانیای ئەمڕۆ) وكەمێك گەشەیان كرد ودەستكاری كـران وبـەم شـێوەیەیان لێهـات: (0،1،2،3،4،5،6،7،8،9) وئێسـتا لـە جیهاندا پێیدەووترێت (ژمارە عەرەبییەكان)[٥].

تا ئەمڕۆش لە وولآتانی (تونس ومەغریب وجەزائیر) بەكاردێن، كەواتـە موسـوڵمانانی ئـەو ناوچـانە ئـەمڕۆ ژمارەكـانی باوبـاپیرانی موسـوڵمانیان بەكاردێنن وبا كەس وانەزانێت كە ژمارەی بێگانە بەكاردێنن.

رۆژئاواییـەكانیش ئـەم شـێوازی نووسـینەی ژمارەكانیـان لـە وولآتـانی رۆژئاوای ئیسلامییەوە وەرگرت بە تایبەتی لـەرێی ئەندەلوسـەوە، كەواتـە ئەوانن كە بە شێوازی موسوڵمانان ژمارەكانیـان دەنووسـن، وتـا رۆژگـاری ئەمڕۆش رۆژئاواییەكان بەم ژمارانە دەڵێن (ژمارە عەرەبییەكان).

كەواتە بـا بـە دڵنیاییـەوە بـابزانین ئـەو ژمارانـەی كـە ئـەمڕۆ لەهـەموو جیهانــــدا بــــەكاردێن كـــە بـــریتین لـــە (0،1،2،3،4،5،6،7،8،9) سەرچاوەكەیان موسوڵمانان بوون وژمارەی عەرەبین.

---

[٥] بڕوانە كتێبی (العلوم والهندسة في الحضارة الإسلامية) دانراوی (دۆناڵد ر. هیل) و وەرگێڕانـی (د. أحمد فؤاد باشا) لاپەڕە (٣٨)، بۆ سەلماندنی ئەم قسەیە لە بەرنامـەی ( **Microsoft word**)ی بـەناوبانگترین و گـەورەترین كۆمپانیـای بەرنامەرێـژیی كۆمپیوتـەریی رۆژئـاوا و جیهان (**Microsoft**) بچۆرە سـەر (**Tools**) و لـەوێ (**Options**) هەڵبـژێرە و پاشـان (**Complex Scripts**)، دەبینیت لە خوارەوە نووسراوە (**Numeral**) واتـە سیسـتمی ژمـارەیی بەرنامەكـە، دەبینیـت لـە هەڵبژاردنەكانـدا نوسـراوە (**Arabic**) واتـە سیسـتمی ژمـارەیی عـەرەبی (كـە موسـوڵمانان دایانهێنـاوە)، كلیكـی بكـە دەبینیـت هـەموو ژمـارە نوسراوەكانی ناو فایلەكەت دەبێت بەمانە (0،1،2،3،4،5،6،7،8،9)، ئایا ئەمە بەڵگە نییە لەسەر دانپێدانانی رۆژئاوا كە ئەم ژمارانە عەرەبین و موسوڵمانان دایانهێناوە !!.

پێشدەستی موسوڵمانان لە بیرکاریدا تەنها لە بواری ژمارەکاندا نەبوو، بەڵکو وەسفی زانستی (جەبر)یان کرد وتێیدا داهێنەر بوون وکردیانە زانستێکی سەربەخۆ، تا ئەمڕۆش ئەم زانستە پارێزگاری لە ناوە عەرەبیەکەی کردووە لە هەموو زمانە ئەورووپیەکاندا وەك (Algebra، Algebre)، پاش ئەوەی ڕۆژئاوا لە موسوڵمانانەوە وەریانگرت، گرنگیدانی موسوڵمانان بە زانستی جەبر گەیشتە رادەیەك کە خەلیفەی عەبباسی (المأمون) داوای لە (خەواریزمی) کرد کە کتێبێك دانێت لەم زانستەدا، ئەویش کتێبی (الجبر والمقابلة)ی دانا (لەنێوان ساڵەکانی: ٨١٣–٨٣٠ز دا نووسراوە) کە یەکێکە لە گرنگترین ڕووداوەکان لە مێژووی بیرکاریدا.

ئەم کتێبە لەلایەن ڕۆبەرتی شێستەر (Robert of Chester) وەرگێردرایە سەر زمانی لاتینی لە ساڵی (١١٤٥ز)دا، بەم شێوەیە موسوڵمانان زانستێکی نوێیان پێشکەشی ئەورووپا کرد، کە تا سەدەی شانزەیەمی زایینی ئەم کتێبە دەخوێنرا لە قوتابخانە وزانکۆکانی ئەورووپادا [٦].

زانایەکی تر بە ناوی (أبوكامل شجاع بن أسلم الحاسب المصري) کە لە سەدەی سێیەمی کۆچیدا ژیاوە کارەکانی خەواریزمی شیکار وتەواوکرد لە کتێبێکدا بەناوی: جەبری کامڵ وتەواوکارییەکەی (كمال الجبر وتمامه)، پاشان زانا (أبوعبدالله محمد بن عيسى الماهاني) هات کە زانایەکی ناسراوی بیرکاری وهەندەسە بووە لە شاری بەغدا لە سەرەتای سەدەی سێیەمی کۆچیدا، لە گرنگترین کارەکانی بریتییە لە شیکاری

---

[٦] بڕوانە (المرجع في الحضارة العربية الإسلامية) لاپەڕە (٣٢٩).

مەسەلەیەك كە بە مەسەلەی ئەرخەمیدس (مسألة أرخميدس) ناسراوە بەهۆی بەكارهێنانی هاوكێشەیەكی ٣ دووری، كە زانای بیركاری (كاجوری) دەڵێت: ئەم یەكەم كەس بووە كە بەم كارە هەستێت، هەربۆیە ئەم مەسەلەیە لەناو زانایانی موسوڵماندا بە مەسەلەكەی (ماهانی) ناسراوە، هەر لە سەردەمی ئەمدا (سنان بن الفتح الحراني) پەیدابوو كە نووسینی زۆری هەیە لە حیساب وجەبردا، لەوانە كتێبی (المكعب والمال والأعداد المتناسبة) كە نوسخەیەكی لە (دار الكتب المصرية) هەیە، وتەواوكەری كارەكانی خەواریزمییە وزیادەیە لە سەری، ئەوەی نوێیە لەم كتێبەدا ئەوەیە كە لەسەر بنەماكانی ڕێژە دایڕشتووە.




وێنەیەك كە بەراورد دەكات لەنێوان ڕێگەی ژمێریاریی لاتینی كۆن وڕێگەی ژمێریاریی خەواریزمی (كە موسوڵمانان دایانهێناوە)

(أبوالحسن ثابت بن قرة) (٢٢١-٢٨٨ك) تەواوكەری كاری زاناكانی پێش خۆی بووە، ئەم زانایە خاوەنی بەهرەمەندیی زۆر بووە لە بوارەكانی: هەندەسە وحیساب وجەبر وپزیشكی وفەلەك وفەلسەفەدا، وزمانەكانی (سریانی وعیبری ویۆنانی) دەزانی وكاری وەرگێڕانی دەكرد[٧].

لەو كەسە بلیمەتانەی تریش كە لەم بوارەدا نووسینیان هەیە: (أبي الوفاء محمد بن محمد بن يحيى بن اسماعيل البوزجاني) بووكە بە بنەچە فارسە وخەڵكی (نەیسابور)ە، ویەكەم كەس بووە لە بەكارهێنانی (سایە)دا لە شیكاری هاوكێشە بیركارییەكاندا، لە كۆتایی سەدەی پێنجەمی كۆچیدا (أبوبكر محمد بن الكرخي) یان (الكرجي) پەیدابوو كە ساڵی (١٠٢٩ز) مردووە، ویەكێك بووە لە گەورەترین زانایانی بەغدا لە سەردەمی (بهاءالدين عضد الدولة بن بويه)دا وهەر لەبەر ئەو كاریەدەستە (الكرخي) دووكتێبی بیركاری دانا بەناوەكانی (الفخري في الجبر والمقابلة) و(الكافي في الحساب)، كە كتێبی یەكەم گرنگترە، ولە گرنگیدا لەدوای ئەو كتێبەوە دێت كە (عمر بن إبراهيم الخيام) (١٠٤٥-١١٣٢ز) لە زانستی جەبردا دایناوە، هەروەها كتێبی (البديع)یشی داناوە، كە ئەم كتێبانە سەرچاوەیەكی گرنگی بیركاری بوون، ڕۆژهەڵاتناس (وپیكە Woepcke) كتێبی (الفخري) وەرگێڕا بۆ فەرەنسی لە ساڵی (١٨٥٣ز)دا كە دەربارەی دەڵێت: (الكرخي) داهێنەر بووە لە شیكارەكانیدا ودەتوانین بڵێین كە بۆچوونێكی سەربەخۆی هەبووە لە شیكاری مەسەلە بیركاری وهەندێك هاوكێشەی دیاریكراودا[٨].

---

[٧] هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە (٣٥٠-٣٥٢).

[٨] بڕوانە هەمان سەرچاوە لاپەڕە (٣٢٩-٣٣٠) و لاپەڕە (٣٥٢- ٣٥٥).، هەروەها (موسوعة تأريخ العلوم العربية) لاپەڕە (٤٧٢).

له زانا ناسراوەكانی تر (عمر الخيام) بووه (١٠٤٥-١١٣٢ز)، كه يەكێك بووه له ناسراوترين زانايانی ئەم بواره ولەناو هاوشانانی خۆيدا بە زانای بیركاری وفەيلەسوف وگەردوونزان ناسراوه ونازناوی دانا (الحكيم)ی پێدراوه، له نەوەی فارسەكانی (نەيسابوور)ە، كتێبێكی هەندەسی هەيە بەناوی (رسالة في شرح ما أشكل من مصادرات كتاب اقليدس)، كە تا ئێستا ماوه وهەموو ئەو مەسەلانەی كە ئيقليدس[٩] هێنابوونی بەبێ شيكار ئەم دانە بە دانە هێناونی وهەموويانی شيكار كردووه وسەلماندوونی بەشێوەيەكی هەندەسيانه، كتێبەكەشی له بواری جەبردا ناوی (مقالة في الجبر والمقابلة) بووه، وهەر (ويبكە Woepcke) لە سالی (١٨٥١ز)دا وەريگێڕاوه وله (پاريس) بڵاوبۆتەوه، هەروەها كتێبی (ميزان الحكمة)شی داناوه.

لە پێشدەستيەكانی لەزانستی جەبردا ئەوەيە كە لە يەكەمين ئەوكەسانه بووه كە هەوڵی دابەشكردنی هاوكێشەكانی داوه بۆ چەند بەشێك، ئەوەبوو هاوكێشەكانی پلە يەك وپلە دوو وپلە سێی يان بە سادە يان بە ئاڵۆز داناوه، وله كارە گرنگەكانی تری لە جەبردا ئەوەبووه كە هاوكێشە ٣ دووريەكانی بەشێوەيەكی هەندەسيانە شيكار كردووە[١٠].

پاش ئەميش (شرف الدين الطوسي) هاتووه كە چەندين دانراوی هەبووه بە تايبەتی له (جەبر)دا، له نامەيەكيدا كە نزيكی سالی (١١٧٠ز

---

[٩] {Euclid (.300 B.C)}: بيركاريزانێكی يۆنانی بووه و خاوەنی چەندين دانراوی بيركارييە كە گرنگترينيان بريتييە له كتێبی: بنچينەكان يان توخمەكان (Elements)، له سەدەی چوارەمی پێش زاييندا ژياوه (بڕوانە: مەوسوعەی بەريتانی: Encyclopædia Britannica).

[١٠] بڕوانە (المرجع في الحضارة العربية الإسلامية) لاپەڕە (٣٥٥- ٣٥٧).

نووسـیویەتی دەربـارەی هاوکێشـەکان (المعـادلات) چـەندین شـتی نـوێ وداهێنـان دەبیـنین، لـە سـەرەتادا بـە لێکۆڵینـەوەی ٢ برگـەی لوولـەیی (برگەی هاوتـا وبرگـەی زیـادە) دەسـت پێدەکات، پاشـان هاوکێشـە پلـە دووەکان ودوایـی پلـە سێیەکان پـۆلێن دەکـات، کـە پۆلێنکردنـەکانی لـە پۆلێنی (خەیام) باشترن[11].

لـە ڕۆژئـاوای ئیسـلامیش چـەندین کەسـی تـر هەڵکـەوتوون وەك: (السموأل بن یحیي المغربي) کـە (٥٧٠ك-١١٧٤ز) کۆچـی دوایـی کـردووە وخاوەنی کتێبی (الباهر في الجبر)ە، هـەروەها (إبـن البنـاء المراکشـي یـان أحمد بن محمد بن عثمان الأزدي) کە سـاڵی (٧٢١ك) لـە شـاری مـەراکیش لە مەغریب کۆچی دوایی کردووە، وزۆر بـەخوڕ بـووە لـە دانـان لـە بـواری بیرکاریـدا وزیـاتر لـە ٧٠ کتێـب ونامـەی نووسـیوە لـە بوارەکـانی جـەبر وهەندەسە وحیساب وفەلەك وغەیری ئەمانەشدا، لـە کـارە سـەرەکیەکانی ئەم کتێبانـە بـوون: (تلخـیص أعمـال الحسـاب)، و(الأصـول والمقـدمات في الجبر والمقابلة)، و(رسالة في الجذور الصم)[12].

هەروەها (أبوالحسن علي بـن محمـد بـن علـي البسـطي القلصـادي) کـە ساڵی (٨٩١ك-١٤٨٦ز) کۆچی دوایی کردووە لە تونس وزوربەی ژیانی لـە ئەندەلوس ژیاوە، وکارەکانی (المراکشي) شـەرح کـردووە، داهێنـەر بـووە لە بیردۆزی ژمارەکاندا وگرنگترین کتێبی بریتییـە لـە (کشـف الجلبـاب عـن علم الحساب) کـە لـە چـوار بـەرگ پێکـدێت، (کـاجوری) بـاوەڕی وایـە کـە

---

[11] بڕوانە (موسوعة تأریخ العلوم العربیة) لاپەڕە (٤٨٠).

[12] بڕوانـە (موسـوعة تـأریخ العلـوم العربیـة) لاپـەڕە (٤٧٢)، (المرجـع في الحضـارة العربیـة الإسلامیة) لاپەڕە (٣٥٧).

کارەکـانی (القلصـادي) (٨٢٥-٨٩١ك) پاڵنـەرێکی گـەورە بـوو بـۆ بیرکاریزانانی دوای خـۆی بـۆ پێشـکەوتن لـە زانسـتی جـەبردا، بـە یەکـەم کەسـێك دادەنرێـت کـە هێمـا ورەمـزە جەبرییـەکانی بـەکارهێناوە لـە کتێبەکانیدا وئەورووپییەکان لەمەوە وەریانگرت[١٣].

**هەندەسە:**

موسوڵمانان لەبواری هەندەسە وسێگۆشەکاریدا کتـێبی (ئیقلیـدس)یان وەرگێـڕا بـۆ زمـانی عـەرەبی، کـە هـەر ئـەم وەرگێڕانـەبوو جـارێکی تـر ئەورووپییەکان وەریانگێڕایـەوە بـۆ زمـانی لاتینـی، موسـوڵمانان تـەنها بـەم زانیاریانەی یۆنانەوە نەوەستان بـەڵکو زانیـاری نوێیـان داهێنـا وخسـتیانە سـەری کـە پێشـتر نـەزانرابوو، وەك داهێنـانی (بەرکەوتـە) لـە حیسـابی سێگۆشەکاریدا کە ئەمە هـەنگاوێکی گـەورە بـوو لـە بیرکاریـدا، وزانایـانی بیرکـاری بـە شۆڕشـێکی زانسـتییان دانـا، کەواتـە موسـوڵمانان بـوون کـە بناغـەکانی ئەنـدازەی شـیکردنەوە (الهندسـة التحليليـة)یـان دامەزرانـد، هـەروەها زانسـتی (سێگۆشـەکاری)یان لـە گەردووونناسـی جیـاکردەوە و(تەژێ)یان لەبری (وەتەرەکان) دانا، (سایە وسایەتەواو) وچـەندین شـتی تریان بۆ زیـاد کـرد کـە بەهۆیـەوە توانیـان هاوکێشـە ٣ دوورییـەکان یـان (المعـادلات المكعبـة) شـیکاریکەن، هـەروەها لـە لێکۆڵینـەوەی شـێوە قووچەکی ولوولەییەکانـدا (المخروطـات) قووڵبوونـەوە، کـە ئـەم زانیارییـە نوێیانـە بـوون وایـان لـە زانسـتی بیرکـاری کـرد جێگـەی ئـەمڕۆی خـۆی بکاتەوە.

---

[١٣] بڕوانە (المرجع في الحضارة العربية الإسلامية) لاپەڕە (٣٥٩- ٣٦٠).

لـه دیـارترین ئـەو زانایانـەی لـە بـواری هەندەسـە وسێگۆشـەکاریدا نووسـینیان هـەبووە (خـەواریزمی، وثابـت بـن قـرة، وبـەتتانی، وخـازینی میسری، وإبن الهیثم، وبەیروونی) بوون.

(أبوعبـدالله البتـاني) کـە لـەلای ئەورووپیـەکان بـە (Albategnus) ناسـراوە سێگۆشـەکاری گەیانـدە ئەوپـەڕی سـنوورەکانی کاتێـك چوارگۆشـەکانی لـەبری سێگۆشـە بـەکارهێنا لـە شـیکاری مەسـەلەکاندا، وتەژێی گۆشەکانی گۆڕیەوە بە کەوانە، وهەرئەویش بوو کـە ڕێـژەکانی لـە حیسابی سێگۆشەکاریدا بەو شێوەیە دانا کە ئێسـتا بـەکاردێت، زانـا (إبـن الهیثم) نووسینێکی هەیە لـە سێگۆشـەکاریدا بـەناوی: شـێوەی کوڕەکـانی موسا (شکل بني موسی)، کە تێیدا ئەوشـێوە بیرکاریانـەی کـە کوڕەکـانی (موسی بن شاکر) دایاننا بە بەڵگە شـیدەکاتەوە، کـە بەشـێکی بریتیـە لـە قووچەکەکان (کتاب المخروطات)، زانا (البیروني)یش کتێبێکی گرنگی لـەم بوارەدا نووسیوە.

هەموو ئەم نووسینانە ئەورووپیەکان وەریانگێڕا بۆ لاتینـی لـە سـەدەی دوانزەیـەمی زایینیـەوە، بـە تایبـەتی (ئـەدیلاردی بـاثی) کـە خشـتەکانی سێگۆشـەکاری خـەواریزمی لـە (١١٢٦ن)دا وچـەندین نوسـراوی تـری سێگۆشەکاری موسوڵمانانی وەرگێڕا بۆ لاتینی[١٤].

موسـوڵمانان دەسـتکەوتی گرنگـی تریـان هـەبوو، گرنگترینیـان ئەوبناغانە بوو کە دایاننا بۆ کێشانی سێگۆشـە لا یەکسـانەکان، هـەروەها پێوانی ڕێژەی نزیکەیی نێـوان رووبـەری بازنـە وچێوەکەی، کـە بـە پیتـی (ط) نیشـانەیان کردبـوو، ویەکسـان بـوو بـە (٣.١٤١٥٩)، کـە ئەمـە ئـەو

[١٤] بڕوانە (موسوعة تأریخ العلوم العربیة)، لاپەڕە (٤٧٣).

ڕێژەیەیە ئەمڕۆ بەکاردەهێنرێت بە تایبەتی لە بوارەکانی فڕۆکەوانی وکەشتیەوانی وفەزادا[15].

کەواتە موسوڵمانان دەستکەوتی گەورەیان هەبووە لە پێشخستنی بیرکاریدا، ورۆژئاوا سوودی گەورەیان لێبینین لەم بوارەدا، هەر کەسێکیش کە یەکێك لە کتێبەکانی بیرکاری موسوڵمانان لێکدەداتەوە سەرسوڕمان دەیگرێت لەو ئاستە بەرزەی کە بیرکاریزانە موسوڵمانەکان پێیگەیشتوون لە فراوانی زانیارییان و ووردەکاری وراستیی لێکۆڵینەوەکانیاندا.

ئەوەتا خەواریزمی شیکاری هاوکێشە ٢ دووریی و٣ دوورییەکان بە شێوەیەکی زانستیانەی وورد دەکات، وباسی رەگەکان وچۆنێتی دەرهێنانی رووبەری شێوە هەندەسییە جۆراوجۆرەکان دەکات، وەك: سێگۆشە، وچوارگۆشە، وبازنە، ومەعین، پاشان دەچێتە سەر چەند مەسەلەیەکی ئاڵۆزی تر وڕێگاکانی شیکاریان بەوپەڕی ووردەکاریی ولێزانینەوە دیاریدەکات، کە مرۆڤ کاتێك سەیری ئەم مەسەلانەان دەکات تووشی سەرسوڕمان دەبێت، و وا دەزانێت کە کتێبێکی بیرکاری سەدەی بیست یان ٢١ دەخوێنێتەوە نەك کتێبێك کە پێش ١٠٠٠ ساڵ زیاتر نوسرابێت[16]!

---

[15] بڕوانە (العلم والإيمان في الفضاء والطيران) لاپەڕە (١٧٧).

[16] بڕوانە: (مذكرات في الحضارة العربية الإسلامية– سعيد عاشور) لاپەڕە (٧٣–٧٧).

## گەردوونزانی:

لەم زانستەدا کە (علم الهيئة)یان پێدەووت، چەندین نووسینیان هەبوو وچەندین روانگە یان بینگە (مراصد)یان دروستکردبوو بۆ بینینی ئەستێرەکان ولێکۆڵینەوەیان، وزانستی (الزيج)یش بەشێکە لەم زانستە، (زيج)ەکان بریتین لەو خشتە ژمێرياريیانەی کە لەسەر چەند یاسایەك دانراون ، ئەویش بۆ ئەوەی کە شوێنی ئەستێرەکان وهەسارەکان یەك بە یەك دیاری بکرێن لەگەڵ پێوانی جووڵەیاندا.



دەستپێکی لێکۆڵینەوەی فەلەك لەلای زانایانی موسوڵمان بە وەرگێڕانی کتێبێکی هیندی کە بەناوی (السند هند) [١٧] بوو دەستی

---

[١٧] (Sindhind) ناوێکی دەستکاریکراوە لە ووشەیەکی هیندیەوە (سدّهانتا) کە بە مانای مەعریفە دێت، کە دوایی ئەم ووشەیە بەکارهات بۆ ناوی ئەو کتێبە هیندیەی کە دەربارەی زانستی فەلەك بوو و موسوڵمانان وەریانگێڕا بۆ زمانی عەرەبی. بڕوانە (العلوم والهندسة في الحضارة الإسلامية) لاپەڕە (٣٣).

پێکرد، کە لە سەردەمی خەلیفەی عەبباسی (المنصور)دا پیاوێك لە هیندستانەوە هات بۆ لای کە شارەزاییەکی باشی هەبوو لە جوولەی ئەستێرەکاندا وئەم کتێبەشی پێبوو، ئەوەبوو خەلیفە فەرمانی کرد بە وەرگێڕانی بۆ زمانی عەرەبی وزانا (إبراهیم الفزاري) وەریگێڕا[18]، پاشانیش (خشتە پەهلەوییەکان) کە لە سەردەمی ساسانیەکان وفارسەکاندا دانرابوون وەرگێڕدران وبۆ زانستە بیرکاریەکان زیاد کران وئەمانیش ناونران (الزیج).

لە مێژووی ئیسلامدا چەندین زانای بەناوبانگ لەبواری فەلەکدا پەیدابوون کە ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەرچاوە مێژوویەکانی رۆژهەلات ورۆژئاوا ئەوا ناوی نزیکەی (٢٠٠) زانای گەردوونزانی موسولمانمان دەستدەکەوێت، لە هەرە بەناوبانگەکانیان: (یحیی بن ماسویة، والفزاري، والمجسطي، والبیروني، والفرغاني، والمرورزدي، وأبوعیسی الإسطرلابي، وسند بن علي، والخوارزمي، والبتاني، وثابت بن قرة، والصوفي، وأبي حامد الصفاني، وحامد بن الخضر، والخجندي) بوون، یەکێك لە هەرە زانا بەناوبانگە موسولمانەکان لەبواری فەلەکدا زانا (محمد بن موسی الخوارزمی) بوو کە کتێبی (زیج السندهند)ی لە سەردەمی خەلیفەی عەبباسی (مەئمون)دا دانا، وخشتەی ووردی تێدایە دەربارەی جوولەی خۆر ومانگ وهەسارەکان، هەروەها (حَبَش الحاسب) کە یەکێك بووە لە زانا فەلەکیەکانی سەردەمی (مەئمون) لە سالی (٨٥٩ز)دا حیسابێکی بەناوبانگی داناوە، ودانراوێکی تریشی هەیە کە بریتیەلە (الزیج الدمشقي).

---

[18] بروانە: (المرجع في الحضارة العربیة الإسلامیة) لاپەرە (٣١٦)، و (العلوم والهندسة في الحضارة الإسلامیة) لاپەرە (٢٧ ، ٣٢)، و (موسوعة تأریخ العلوم العربیة) لاپەرە (٤٧).

زانا موسـولْمانەكان سـەركەوتووبوون لـە دروسـت كردنـی ئاوێنـەی ئەستێرە بینین كە پێیدەوترێت (الإسطرلاب)[19] بە یۆنـانی، كـە بەهۆیـەوە گەردوونزان دەتوانێت گۆشەكان دیاری بكات بۆ گشت تەنە ئاسمانیـەكان لە هەر شـوێنێكدا بن، زانـا (أبوإسـحاق محمـد بـن إبـراهیم بـن حبیـب بـن سـلیمان الفـزاري) (١٥٩ك-٧٧٧ز مـردووە) كـە یـەكێك بـووە لـە گەردوونزانانی خەلیفـەی عەبباسـی (المنصـور)، یەكـەم كـەس بـووە ئـەم سەكۆ گەردوونیە (مرصد فلكي)یەی دروست كردووە لە سەدەی دووەمدا، ئـەم زانایـە چـەند كتێبێكـی نووسـی كـە تیایـدا چـۆنێتی بـەكارهێنانی (الإسـطرلاب) ڕوون دەكاتـەوە، لەوكتێبانـە: (كتـاب العمـل بالإسـطرلاب المسطح، كتاب العمل بالإسطرلابات ذوات الحلق)، هەروەها زانا (أبوعیسـی الإسطرلابي) بنەماكانی بەكارهێنانی ئەم راستە فەلەكیـەی دیـاریكرد، ئـەم ئـامێرە هـەروەها بـۆ دیـاریكردنی: كـات، ودووری لـە كەمـەرەی زەویـەوە (واتـە پێـوانی هێڵـەكانی پـانی) بـەكاردەهێنرا وزۆرێـك لـە كەشـتیەوانانی دەریا تا سەردەمانێكی نزیك پشتیان پێدەبەست.

---

[19] ئەم ئامێرە (كە بە ئینگلیزی پێیدەووترێت: **Astrolabe** واتە: ئاوێنەی ئەسـتێرە) وەك لـە وێنـەكانی ئـەم كتێبـەدا دەیبیـنین لەشـێوەی قیبلەنومادایـە، و بـەكاری قیبلـەنوما و كاتـژمێریش هەڵدەسـتێت، بـەڵام كـاری سـەرەكی بریتیـە لـە بـەكارهێنانی لـە تێڕوانینـی ئەستێرەكان (وەك خۆر و ئەستێرەكانی تر) و دیاریكردنی شوێنەكانیاندا (بەتایبەتی گۆشەی بەرزی تەنـە ئاسمانییـەكان لـە ئاسـۆوە لـە هـەموو شـوێنێكدا)، هـەروەها دووریـی لـە هێڵـی كەمەرەی زەویەوە دیاریدەكات، چەندین جۆری هەبووە لەوانە: (التـام، المسـطح، الطومـاري، الهلالي، الزورقي، الجنوبي، الشمالي ....).

زانایـان دەڵـێن بریتـی بـووە لـە ئـامێرێكی لـە كۆمپیوتـەر چـووی سـەرەتایی. {بڕوانـە: (مەوسوعەی بەریتانی **Encyclopedia Britannica**) و (المرجـع في الحضـارة العربیـة الإسلامیة) لاپەڕە (٣١٩)}.

(إبـن النـديم) دەڵێـت: ئامێرەكـانی پێوانـەكردن ورەصـد سـەرەتا لـە شاری (حۆران)[20] دروستدەكران كە پاشان لە هەموو وڵاتـانی ئیسـلامیدا دروستكردنیان بڵاوبۆوە، یەكەم كەس كە ئەم كارەی كـردووە (ابـن خلـف حـبش الحاسـب المـروزي) بـوو (لـەنێوان ٢٥٠–٢٦٠ك مـردووە) كـە گەردوونزانێكی بەناوبانگ بووە ولە بەغدا هەسـتاوە بـە چـەندین تێڕوانین ولێكۆڵینەوەی فەلـەكی لـە سـاڵی (٢١٤ك–٨٦٤ز)دا، خـاوەنی ٣ (زیـج)ە، ئەندامی ئەو تیمەش بـووە كـە خەلیفـە (المـأمون) رایسـپاردن بـۆ پێـوانی چێوەی زەوی.




اسطرلاب إسلامي من النحاس المطعم بالفضة

هـەروەها (بنوالصـباح)یش كـە ٣ بـرا بـوون ودەسـتڕەنگین بـوون لـە دروسـتكردنی ئامێرەكانـدا، وكتێبێكیـان هەیـە بـەناوی (برهـان صـناعة الإسطرلاب)، هەروەها (أحمد بن محمد الصاغاني)یش لەم بـوارەدا دەسـت ڕەنگین بووە ونموونە بووە لە دروست كردنی (الإسطرلاب)دا، وهەسـتا بـە بەرەوپێش بردن وزیاد كردن لەسەر ئەم ئامێرە[21].

---

[20] شارێكە لە (سووریا)ی ئێستادا.

[21] بڕوانە (المرجع في الحضارة العربية الإسلامية) لا (٣١٨)، هەروەها (أعلام الفلك في التأريخ العربي).

لـه سـەردەمی ئیسـلامیدا چـەندین بینگـە (مراصـد) دروسـتكران بـۆ تێڕوانینی ئەستێرەكان وكەسـانی پسـپۆڕیان بـۆ دیـاریكرا، لەوانـە (ئیبن یونس) بۆمان دەگێڕێتەوە كە زانا (النهاونـدي) كـە سـاڵی (١٧٨هـ-٧٩٠ن) مـردووە هەسـتاوە بـە ئەنجامـدانی چـەندین تێـڕوانین وتێبینـی ووردی ئەسـتێرەكانی كـردووە، بـەڵام كارەكـانی نەگەشـتوونەتە دەسـتمان، هەروەها لە سـەردەمی خەلیفـە (المـأمون)دا لـە (بیـت الحكمـة) لـە بەغـدا بینگەیەك دروستكرا وبەڕێوەبردنی درایە دەست (سند بن علـی)، وپاشـان (یحیی بن أبی منصور) ودوایی (العباس بـن سـعید الجـوهري) كـە شـارەزا بووە لە دروستكردنی ئامێرەكاندا، هەروەها بینگەیەكی تـر لەسـەر كێـوی (قاسـیون) لــە شــاری (دیمەشـق) دروسـتكرا وچـەندین ئـامێری بیـنین وپێوانەی بۆ دانرا لەوانە: پێوەری بەرزی،و(الإسطرلاب) و(المزولة) وهیتر.

لە چەندین شـوێنی تـری جیهـانی ئیسـلامی بینگـەی تـر دروسـتكران، لەوانـە شـارەكانی: سامەڕا، ونەیسـابوور، هـەروەها بینگەیـەكی تـر لـە شاری بەغدا كە زانا (بوزجانی) كاری تێـدادەكرد، وزانـا (الصـوفي)یـش لـە شاری (ئەصفەهان) لە ئێران بینگەیەكی دانابوو وتـوانی بەهۆیـەوە خشـتە بەناوبانگەكەی دەربارەی هەسارەكان دابنێت، هەروەها زانا (ئیبن یـونس) لە (قاهیرە) بینگەیەكی بـەناوبانگی هـەبووە لەسـەر كێـوی (المقطـم)، لـە شاری (الري)یش (كە نزیك شـاری تـارانی ئێسـتایە لـە ئێـران) بینگەیـەكی پێشكەوتوو هەبووە كـە لەلایـەن (الخجنـدي) كـە (٣٩٠ك-١٠٠٠ن) مـردووە بەڕێوەبراوە، وئامادەكرابوو بە چەندین شوێن وئامێری ئـاڵۆز بـۆ تێـڕوانین وبینینی ئەستێرەكان، لەوانە ژوورێكی شەش پـاڵووی گـەورەی تاریـك كـە یەك كونی بچووك لە سەقفەكەیدایە بۆ تێڕوانین ولێكۆڵینەوەی خۆر.



**وێنەی قیبلەنومایەك لە دروستكردنی موسوڵمانان كە دروستكردنەكەی گوازراوەتەوە بۆ ئەوروپا و رۆژئاوا**

زانایانی موسوڵمان یەكەم كەس بوون كە بۆری بەتاڵیان بەكاردەهێنا (واتە بەبێ هاوێنە) بۆ تێڕوانینی ئەستێرەكان، یەكەم كەسێك كە ئاماژەی پێداوە زانا (بەتتانی) بووە كە لە بینگەكەی لە شاری (الرقة) لە باكووری سوریای ئێستادا بەكاری هێناوە، زانا (البیروني)یش بە وردی لە كتێبەكەیدا (القانون المسعودي) باسی كردووە لە تێڕوانینی مانگدا، بەكارهێنانی بۆری تێڕوانین لە كۆتایی سەدەی نۆیەم وسەرەتای سەدەی دەیەمی زایینییەوە جێگیربووە لەلای موسوڵمانان ولەمانەوە گوێزرایەوە بۆ رۆژئاوای لاتینی لە سەدەكانی ناوەڕاستدا وبوو بە ئامێرێكی باولە بینین وتێڕوانینی ئەستێرەكاندا، كە پاشان زانا (گالیلۆ)[22] هات وهاوێنەی بۆ زیادكرد وبوو بەو ئامێری تەلسكۆبەی كە بڕبڕەی پشتی زانستی فەلەكی ئەمڕۆیە[23].

---

[22] زانای بیركاری و فەلەك و سروشتزانی ئیتاڵی گالیلێ گالیلێ (Galilei Galileo) (١٥٦٤-١٦٤٢ز)، دۆزەرەوەی ئامێری تەلسكۆبە.

[23] بڕوانە: (موسوعة تأريخ العلوم العربية) لاپەڕە (٣٦).

چەندین ئامێری گەورەی تر لە بینگە فەلەکییەکاندا بەکاردەهات، وەك بینایەکی گۆیی گەورە کە تیرەکەی (١٢.٥) مەتر بوو ولە بینگەی بەغدا دروستکرا بۆ بەدوادا چوونی جوولانەوەی خۆر، هەروەها (ئیبن سینا) لە کتێبی (مقالة في الآلات الرصدية)دا وەسفی ئامێرێکی گەورەی تری کردووە کە بناغەیەکی بەردینی هەیە ولە دیوارێکی گۆیی پێکهاتووە کە تیرەکەی ٧مەتر دەبێت، ولە سەری چەندین راستە دانراون بۆ پێوانی بەرزی وشوێنی تەنە ئاسمانییەکان.



**هێلکاریی ئەو ئامێرەی کە (ئیبن سینا) لە کتێبەکەیدا وەسفی کردووە**

لە هاوشێوەی ئەم ئامێرانە دانران لە بینگەکانی (ئەصفەهان) کە لە ساڵی (١٠٧٤ز) دروستکرا و(عمر الخيّام) کاری تێدادەکرد، هەروەها لە بینگەی شاری (مەراغە) کە دەکەوێتە باکوری رۆژئاوای ئێرانەوە و(نصيرالدين الطوسي) کە (٦٧٢ك-١٢٧٤ز) مردووە بەرپرسی بووە و(العُرَضي) کە (٦٦٤ك-١٢٦٦ز) مردووە بەرپرسی دروستکردنی ئامێرەکانی بووە، خاوەنی کتێبخانەیەکی سەدان هەزار کتێبی بووە کە لە بەغدا وقاهیرەوە بۆی هێنران، هەر لەم بینگەیەدا یەکێك لە گرنگترین

نوسراوەکانی زانستی فەلەك دانرا کە کتێبی (الزيج الألخاني) بوو، چەندین زانای تر لەم بینگەیەدا کاریان کردووە وەك (محی الدين المغربي) و(قطب الدين الشيرازي) کە داهێنــان ودۆزینــەوەی زۆریــان هــەبووە لــەبواری فەلەکدا، لەلایـەکی تـرەوە (قـوبلای خـان)ی بـرای هۆلاکـۆ کـە صـینی داگیرکرد کتێبەکانی زانایانی فەلەکی بەغدا وقاهیرەی بۆ بـرد، کـە ئەمانـە بوونـە هـۆی دەرکـەوتنی زانسـتی فەلـەك وپێشـکەوتنی لـەوێ، کـە لـە دەرکەوتنی گەردووناسی صینی (کوشو کینگ)دا خـۆی دەبینێتـەوە کـە ساڵی (١٢٨٠ز) ناوبانگی دەرکرد بەهۆی کارەکانیـەوە، لەمانـەوە بیریـاری فەرەنسی (گۆستاڤ لۆبـۆن) دەگاتـە ئـەو ڕاسـتییەی کـە دەڵێـت: زانایـانی موسوڵمان ودانراوە زانستییەکانیان بوون کە زانسـتی فەلـەکیان لەهـەموو دونیادا بڵاوکردەوە[٢٤].

لەسـەر شـێوەی ئـەم بینگەیـە لـە چـەندین شـوێنی تـری جیهـانی ئیسلامیدا بینگە دروسـتکران بەتایبـەتی لە شـارەکانی (سـەمەرقەند) لـە سـاڵی (١٤٢٠ز)دا، وشـاری (ئەسـتەمبوڵ) لـە سـاڵی (١٥٧٥ز)دا کـە گەردوونزان (تقـي الـدين) کـاری تێـدادەکرد، ودوایـین بینگـە لـەم زنجیرە بینگانەی کە لەسەر شێوازی بینگەکەی (مەراغـە) دروسـتکران بینگـەکانی (جای سینگ) لە هیندستانە لە سەدەی هەژدەیەمـدا، وبینگـەی (جـایپور) لە شاری (دەلهی) لە هیندسـتان کـە لـە سـاڵی (١٧٤٠ز)دا دروسـتکرا وتـا ڕۆژگـاری ئـەمڕۆشمان زۆربـەی ئامێرەکـان وبیناکـانی مـاون ولەشـوێنی خۆیاندان.

---

[٢٤] بڕوانە: (حضارة العرب)/ گۆستاڤ لۆبۆن، لا (٥٥٤)، هەروەها کتێبی (تأريخ العـرب العـام)/ ل. أ. سیدیو، لاپەڕە (٤١١- ٤١٢).



**وێنەیەكی بینگەی ( جایپور ) لە خوارووی رۆژئاوای شاری ( دەلهی ) لە هیندستان، كە لەسەر شێوازی بینگەی ( مەراغە ) دروست كراوە، لە وێنەكەدا ئەو زنجیرە بینا گەورانە دەبینین كە بەكار دەهێنران بۆ تێڕوانینی جووڵەی خۆر ودانانی لە بازنەی بورجەكاندا، هەروەها بۆ دیاریكردنی كاتیش بەكاردەهێنران**

موسوڵمانان خڕێتی زەوی وئاسمانیان سەلماند كە زانایانی شەرع هەموویان لەسەری كۆك بوون، ئەویش بەپێی تێگەیشتنیان لە ئایەتەكانی قورئان وفەرموودەكانی پێغەمبەر (ﷺ)، شێخی ئیسلام (إبن تيمية) كە ساڵی (٧٢٨ك-١٣٢٧ز) كۆچی دوایی كردووە ئەم كۆكبوونەی زانایانی موسوڵمانی لە (مجموعة الفتاوى)دا هێناوە لە (بەرگی٦/ لاپەڕە ٥٨٧)دا، هەروەها زانایانی تری وەك (إبن الجوزي، وإبن القيم، وإبن حزم، والغزالي، والفخر الرازي) هەمان باوەڕیان هەبووە.

زانایانی سروشتزانی موسوڵمان سووڕانەوەی زەویان بەدەوری خۆیدا سەلماند، وچەندین خشتەیان دانا بۆ دیاریكردنی شوێنی هەندێك لە ئەستێرەكان، وحیساب كردن ودانانی رۆژژمێرەكان، وشێواوییەكانی جووڵەی مانگ، ودرێژی ساڵی هەتاوی، و...... هتد.

زانا (المسعودي) كه له سالّی (٣٤٥ ك)دا كۆچی دوایی كردووه، یەكەم كەس بووه باسی زەوی كردووه كە شێوەكەی (گۆیی)یە، وباسی سووڕانەوەی زەوی كردووه بە دەوری خۆردا، لە كتێبەكەیدا بەناوی (مروج الذهب ومعادن الجوهر)، كە تێیدا دەڵێت: خۆر كاتێك وون دەبێت لە ئەوپەڕی چین، ئەوا دەردەكەوێت لە دورگە ئاوەدانەكانی دەریای ئۆقیانووس، ئەگەر لەوێشەوه ئاوابوو لەوپەڕی چین هەڵدێتەوه، كە ئەوه (نیوەی بازنەی زەوییە).

هەروەها زۆرێك لە زانایانی موسوڵمان باسیان لە (گۆیی) بوونی زەوی كردووه، لەو زانایانە وەك گەردوونناس (الشریف محمد بن محمد الإدریسي)یە كە سالّی (٥٤٨ ك)دا كۆچی دوایی كردووه، ئەم زانایە وێنەی ئەو شارانەی كردووه لەسەر گۆیەكی زەوی كە لە (زیو) دروستی كردبوو، ئەمە كاتێك پاشای (نۆرمان) دەعوەتی دەكات بۆ (صقلیة)، لە كتێبەكەیدا (نزهة المشتاق في اختراق الأفاق) باسی لە (گۆیەتی) زەوی كردووه، هەرچەندە لەپێش ئەمانیشدا (عبدالله ی كوڕی عباس) ڕاڤەكاری قورئان باسی ئەمەی كردووه.




وێنەی كۆمەڵە ئەستێرەی ڕووبار (النهر) هەروەك چۆن بە خەیاڵی زانای موسوڵمان (الصوفي)دا هاتووه

یەکـەم کـەس کـە زانیویـەتی زەوی هەسـارەیەکە وەلـەدەکات لـە ئاسمانـدا وجـێگیر نییـە زانـا (إبـن الشـاطر) بـووە (١٣٧٥ز مـردووە)، کـە بانگبێژی مزگەوتی (دیمشـق) بـووە، هـەروەها یەکـەم کەسـیش بـووە کـە وتویـەتی: {سـوورانەوەی زەوی بـە دەوری خـۆردا وبـە دەوری خۆیـدا دەبێتە هۆی هاتنی شەوورۆژ ودروسـت بـوونی وەرزەکـانی سـاڵ}، زانـای بیرکاریی وگەردوونزان (موسی بن شاکر) یەکەم کەس بـووە هەسـتاوە بـە ئەندازە کردنـی قـەبارەی زەوی ودیـاری کردنـی پێوانـەی چـێوەکەی، کـە پاشان زانا (الفرغاني) بە پشت بەستن بە کارەکانی ئەم بەووردی چـێوەی زەوی دیـاریکرد، وئـەم پێوانەیـەی زۆر نزیکـە لـە پێوانـەی ئـەمڕۆوە، هـەروەها زانایـانی موسـوڵمان یەکـەم کـەس بـوون سـەنتەری زەوییـان دیـاریکردووە، وهەڵـەکانی (بطلیمـوس)[25] وتیـۆرە گەردونییـەکانیان ڕاسـتکردۆتەوە، چـونکە (بطلیمـوس) ووتویـەتی: زەوی سـەنتەری گەردوونە، بەڵام زانایانمان ڕەتیان داوەتـەوە، یەکـەم زانـایش کـە ئەمـەی ووتووە (البیروني) بوو[26].

---

[25] (Claudius Ptolemaeus of Alexandria) کلاودیـۆس بەتلیمۆسـی ئیسکەندەرییە: زانایـەکی گـەردوونزانی یۆنـانی بـووە (سـاڵی ١٦٨ز کۆچـی دوایـی کـردووە)، خاوەنی چەندین دانراوە لە زانستی فەلەکدا، کە وەرگێردران بۆ عەرەبی لەوانە: (المجسـطي)، (في اقتصاص أصول حركات الكواكب)، (في ظهور الكواكب الثابتـة)، (زيـج بطليمـوس). بڕوانـە (مەوسوعەی بەریتانی) و هەروەها (موسوعة تأريخ العلوم العربية) لاپەڕە (٢٩).

[26] بۆچوونی قەشەکان و کڵێسا لـە ئـەوروپا لـە سـەدەکانی ناوەڕاسـتدا دەربـارەی گـەردوون پشتی بەستبوو بە ڕاکانی (بەتلیمۆس) کە دەبێوت زەوی جێگیرە و سەنتەری کۆمەڵەی خـۆر و گەردوونـە و خـۆر بـەدەوری زەویـدا دەسـووڕێتەوە، بـەڵام موسـوڵمانان ئـەم وەهـم و خەیاڵاتەیان وەرنەگرت و ووتیان کە خۆر جـێگیرە لـە کۆمەڵـەی خـۆردا و زەوی بەدەوریـدا و لەهەمان کاتدا بەدەوری خۆیشیدا دەسووڕێتەوە. بڕوانە:(أوائل المسلمين في العلوم التجريبية).

لـه سـەردەمی خەلیفـەی عەبباسـی (المـأمون)دا تاقیكردنەوەیـەك بـە فـەرمانی ئـەو ئەنجامـدرا بـۆ پێـوانی بازنـەی نیـوەی رووناكی رۆژ (دائـرة نصف النهار)، وئەم كارە سپێردرا بە ٢ تـیم كـە لـە بیابانـەكانی (سـنجار) و(تـەدمور)دا كاریـان كـرد، وهـەردوو تیمەكـە گەیشـتنە یـەك ئـەنجام كـە: پلەی درێژییان كرد بە ٥٦ میلی عەرەبی و٢\٣ی میلێك، كـە ئـەم ئەنجامـە زۆر نزیكــە لــە پێوانــەی راســتەوە، (خــەواریزمی) یــەكێك بــووە لــەو گەردوونزانانـەی كـە (المـأمون) رایسـپاردن بـۆ پێـوانی بازنـەی گـەورەی زەوی (واتە چێوەی گۆی زەوی) كە ئەنجامەكەیان ئەمە بوو:

– چێوەی بازنەی گەورەی زەوی كە پێوایان (٤٠٢٤٨ كم) بوو[٢٧].

– چـێوەی بازنـەی گـەورەی زەوی كـە پێشـتر بەتلیمۆسـی یۆنـانی دەریكرد (٢٨٣٤٠ كم) بوو.

– چێوەی بازنەی گەورەی زەوی كە ئێمە لـەمڕۆدا دەیـزانین (٤٠٠٧٠) كیلۆمەترە.

دەبڕوانە ئەو ئەنجامە زۆر نزیكەی كە موسوڵمانان پێیگەیشتن لەچاو ئەنجامەكانی پێشتردا!

یــەكێكی تــر لــە گەردونناســە موســوڵمانە ئەندەلوســیەكان نــاوی (أبوالقاسم مسلمة المجريطي) بوو كە ساڵی (٣٩٨ك–١٠٠٧ز) كۆچی دوایـی كـردووە، وزۆرێـك لـە كتێبـەكانی وەرگێردرانـە سـەر زمـانی لاتینـی، لـە سـەدەی پێنجـەمی كۆچیشـدا زانـا (الزرقـالي الطليطلـي) (١٠٢٩–١٠٨٧ز) هەستا بە چەندین تێڕوانینی گرنگ، كە لە كتێبی (جداول طليطلـة)دا كـۆی

---

[٢٧] بڕوانە (المرجع في الحضـارة العربيـة الإسـلامية) لاپـەڕە (٢١٧)، هـەروەها (أعـلام الفلـك في التأريخ العربي) لاپەڕە (٥٥).

کردنەوە، وکاریگەرییەکی زۆری کردە سەر رۆژئاوای لاتینی لە سەدەکانی ناوەڕاستیاندا، ئەم زانایە لە رۆژئاوا بە (سافایا Saphaea) ناسرابوو[28]، زانایانی ئەمڕۆش زۆریان لەو باوەڕەدان کە زانا (کۆپەرنیکۆس)[29] لە زۆرێك لە بۆچوونەکانیدا کاریگەر بووە بە کارەکانی زانای موسوڵمان (إبن الشاطر)، بە تایبەتی لێکۆڵینەوەکانی هەردوو نوجبور (Neugebauer) وسوێردلۆ (Swerdlow) هیچ گومانیان نەهێڵاوە لە کاریگەریی زانستی فەلەکی موسوڵمانان لەسەر (کۆپەرنیکۆس)[30].




**ڕێگەی بیرکارییانەی زانای موسوڵمان (البيروني) بۆ پێوانەکردنی چێوەی گۆی زەوی، کە دووبارە بۆمان دەسەلمێنێت چۆن زانایانی موسوڵمان لە خڕێتی زەوی دڵنیابوون**

لە زانا ناودارەکانی تری ئەندەلوس (نورالدين أبواسحق البطروجي) بووە (نزیکەی ١٢٠٤ز مردووە)، خاوەنی کتێبی (علم الهيئة)یە کە وێنەی تەنە ئاسمانیەکانی تێدا باسکردووە، قوتابی (إبن طفيل) بووە.

---

[28] بڕوانە (العلوم والهندسة في الحضارة الإسلامية) لاپەڕە (٧٩).

[29] زانای گەردوونزانی پۆڵەندی نیکۆلاس کۆپەرنیکۆس (Nicolaus Copernicus) (١٤٧٣-١٥٤٣ن)، دانەری بیردۆزی کۆپەرنیکۆسە (Copernicus's theory).

[30] بڕوانە: (موسوعة تأريخ العلوم العربية) لاپەڕەکانی: (١٤٤) و (١٥٧) و (١٧١) و (٢٦٠).

(گۆستاڤ لۆبۆن) دەڵێت: ئەگەر باسی ئەو شتانە بکەین کە لاتینیەکان لە موسوڵمانانەوە وەریانگرت، دەبینین کە گێربەرت (دوایی بوو بە پاپا سلڤستەری دووەم) لە ساڵەکانی (٩٧٠) و(٩٨٠ن)دا ئەوەی فێری بووبوو لە ئەندەلوس لە بیرکاری وگەردوونزانی خستیە رۆژئاوا، (ئوهیلارد)ی ئینگلیزی لە ساڵەکانی نێوان (١١٠٠–١١٢٧ن) لە ئەندەلوس سوڕایەوە وکتێبە بیرکاریەکانی وەرگێڕا، (لیۆناردی پیزایی) لە ساڵی (١٢٠٠ن)دا کتێبی نووسی دەربارەی ئەو زانستی جەبرەی لە موسوڵمانانەوە فێری بوو، هەروەها (ڤیتلیون)ی پۆلۆنی کتێبی (البصريات)ی (حسن بن الهيثم)ی وەرگێڕا، و(جیراردی کریمۆنی) وەرگێڕانی کتێبی (المجسطي)[31] وراڤەکەی (جابیر)ی بڵاوکردەوە.

هەروەها دەڵێت: ئەگەر (رۆجەر)ی یەکەم لە (صقلیه) هانی فێربوونی زانستەکانی موسوڵمانانی دابێت بە تایبەتی کتێبەکانی زانا (الإدريسي) ئەوا ئیمپراتۆری رۆمانی (فریدریك)ی دووەم لەو کەمتر نەبووە لە حەماسەتیدا بۆ فێربوونی زانستەکان وئەدەبیاتی موسوڵمانان، چونکە کوڕەکانی (ئیبن روشد) لە دەوروبەری بوون وفێری رووەکناسی وئاژەڵناسیی سروشتیان دەکرد[32].

---

[31] (Almagest) کتێبێکی فەلەکییە کە لەلایەن گەردوونزانی یۆنانی (بەتلیمۆس)ەوە نوسراوە لە ساڵی (١٥٠ن)دا، هۆکاری گواستنەوەی زانیارییە فەلەکیەکانی یۆنانیەکان بوو بۆ موسوڵمانان، لە دەوروبەری (٨٢٧ن) وەرگێڕدراوە بۆ زمانی عەرەبی و لەوێوە لە سەدەی (١٢)دا وەرگێڕدرا بۆ لاتینی. بڕوانە: (مەوسوعەی بەریتانی).

[32] بڕوانە (الحضارة العربية)ی (گۆستاڤ لۆبۆن).

### سروشتزانی (فیزیا):

یەکـەم کـەس زانسـتی سروشـت (کـە پێکهاتـەی فیزیـای ئەمڕۆیـە) داهێناوە (حەسەنی کوڕی هەیسەم) بووە، ویەکەم کەس بـووە کە باسـی تیشکدانەوەی کردووە [٣٣]، زانایـانی موسـوڵمان لـە سروشـتزانیدا (یـان بـە زاراوەی نوێ زانستی فیزیادا) هێزی کێش کردنی زەویان دۆزیەوە، یەکـەم کـەس کـە باسـی (هێـزی کـێش کردنـی) کـردووە پێشـەوا (الخـازن)ە کـە دەڵێت: (تەنەکان دەکەونە سـەر زەوی بـەهۆی هێزێکـی کـێش کردنـەوە، وپەیوەنـدی هەیـە لـە نێـوان خێرایـی ودووریـی وکێشـدا)، ئـەم ووتەیـەی چـەندەها سـەدە پـێش لـەدایکبوونی (نیـوتن) [٣٤] ووتـووە، هـەروەها پەیوەندی راستی دۆزیوەتەوە لە نێوان ئەو خێراییەی کە تـەنێك هەیـەتی کاتێك دەکەوێتـە سـەر رووی زەوی لەگـەڵ ئـەو ماوەیـەی کـە لـەو کاتـەدا دەیبڕێت، ئەمە هـەمان ئـەو پەیوەندیەیـە کـە دۆزینـەوەیان دراوەتـە پـاڵ زانایانی وەك (نیوتن وگالیلۆ).

زانا (محمـد بـن عمـر الـرازي) لـە کۆتـایی سـەدەی شەشـەمی کۆچیدا دەڵێت: (ئەگـەر ئێمـە بـەردێك هەڵدەین بـۆ سـەرەوە دەبیـنین دەکەوێتـە خـوارەوە، لەمـەوە بۆمـان دەردەکـەوێت کـە دەبێـت هێزێـك هـەبێت لـە خوارەوە، کـە هـەر کاتێـك ئێمـە هەڵیدەینـە سـەرەوە ئـەوهێزە دێنێتـەوە خـوارەوە)، دەربـارەی یاسـای (کـێش کردنـی گشـتی) زانایـانی ئیسـلام

---

[٣٣] بڕوانە (أوائل المسلمین في العلوم التجریبیة) لە ئینتەرنێتەوە وەرگیراوە.

[٣٤] هەمان سەرچاوەی پێشوو.... (ئیسحاق نیوتن Sir Isaac Newton) زانـای فیزیـایی و بیرکـاری ئینگلیـزی بەناوبانگـە (١٦٤٢– ١٧٢٧ز). بڕوانـە: (Encyclopædia Britannica).

قسەیان كردووە، وبەستنەوەی گەردوون بەیەكەوە بەهۆی ئەو هێزی كێش كردنەوە لێك دەدەنەوە[٣٥]، زانا (بەیروونی) گرنگیداوە بە زانستی شلەكان ولەم بوارەدا كتێبی نووسیوە، كە تێیدا زۆر دیاردەی تایبەت بە پەستانی شلەكانی روون كردۆتەوە، وەك: چۆنێتی هەڵدرانی ئاوی فوارە وسەرچاوەكان بۆ سەرەوە، وئاوی بیرەكان بەوەی كە لەملاولاوە دەپاڵێورێتە ناوی لەو ئاوانەی كە نزیكین وئەوەی روون كردەوە كە ئاستی ئاوی ئەم بیرانە لەهەمان ئاستی ئاوەكانی دەوروبەریدایە[٣٦].

موسوڵمانان كێشی جۆری (الوزن النوعي)[٣٧]ی زۆرێك لە تەنەكانیان دیاریكرد، وچەندین رێگایان دۆزیەوە بۆ ئەم دیاریكردنە، وخشتەی تایبەتیان لەم بوارەدا دانا، بۆ نموونە چڕیی قورقوشمیان پێوا وبینیان (١١.٣٢)ە، كە خۆی لە راستیدا بریتییە لە (١١.٣٥)[٣٨]، هەروەها زانای گەورە (البيروني) خشتەیەكی ووردی داناوە بۆ بەهاكانی كێشی جۆری[٣٩].

موسوڵمانان یەكەم كەس بوون كە (پاڵەپەستۆی هەوا)[٤٠] یان دۆزیەوە، پێش (رێنیسانس)[٤١]ی ئەوروپا بە چەندەها سەدە، ولەنێو

---

[٣٥] بڕوانە (المرجع في الحضارة العربية الإسلامية) لاپەڕە (٣٠٧).

[٣٦] هەمان سەرچاوە لاپەڕە (٣٠٦)، هەروەها (العلم والإيمان في الفضاء والطيران).

[٣٧] (Specific gravity) بریتییە لە رێژەی چڕیی ماددەیەك بۆ چڕیی ماددەیەكی دیاری كراو.

[٣٨] بڕوانە (المرجع في الحضارة العربية الإسلامية) لاپەڕە (٣٠٦).

[٣٩] بڕوانە (العلوم والهندسة في الحضارة الإسلامية) لاپەڕە (٩٠).

[٤٠] پاڵەپەستۆ یان پەستانی هەوا بریتییە لە: ئەو پەستانەی كە ستوونی هەوا دەیخاتە سەر تەنەكان و بەپێی بەرزیی دەگۆڕێت، و بە ئامێری (بارۆمیتەر دەپێورێت)، پەستانی هەوای ئاسایی بریتیە لە ٧٦٠ملم جیوە لە ئاستی رووی دەریادا. بڕوانە (Encyclopædia Britannica).

خۆیاندا ئەم یاسایانەیان نەقلْ کردوە کە دەڵێت: (کێشی تەن لە هەوادا کەمترە لە کێشی ڕاستەقینە خۆی)، و(هەوا هێزێکی پاڵنەری هەیە بۆ سەرەوە وەکو شلە جۆراو جۆرەکان)، بەپێی یاسای (ئەرخەمیدس)[42] ویاسای (کێشی تەن لە نزیك ڕووی زەوی جیاوازە لەو کێشەی لەبەرزاییدا هەیەتی، ئەویش بەپێی بەرزیی ستوونی هەوا لە سەرەوەی).

لە بەناوبانگترین زانایانی موسوڵمان لەم بوارەدا (خازین) بووە ولە کتێبەکەیدا (میزان الحکمە) لێکۆڵینەوەیەکی گرنگی تێدایە لەسەر پەستانی هەوا کە تێیدا ئەو بنەمایەی ڕوونکردۆتەوە کە هەوا هەروەك ئاو پەستان لەسەر تەنەکان دروست دەکات کە تێیدا نوقم کراون لەژێرەوە بۆ سەرەوە، لێرەوە دەڵێت کە (کێشی هەر تەنێك لە هەوادا کەمترە لە کێشی ڕاستەقینەی خۆی)[43].

لەمانەی سەرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە زانایانی ئیسلام پێش زانایان: (نیوتن) کەوتوون لە باس کردنی بیردۆزی کێش کردندا، هەروەها پێش (تۆرشەللی)[44] کەوتوون لە لێکۆڵینەوەکانیان لەسەر پەستانی

---

[41] (Renaissance) یان سەردەمی ڕاپەڕین و چاکسازی لە ئەوروپادا، بریتییە لەو سەردەمەی مێژووی ئەوروپا کە یەکسەر دەکەوێتە دوای سەدەکانی ناوەڕاستەوە و بریتییە لە سەردەمی دۆزینەوەکان و گەڕان بەسەر ڕووی زەویدا لەلایەن ئەوروپییەکانەوە (بڕوانە: Encyclopædia Britannica).

[42] (Archimedes) بیرکاریزان و داهێنەری یۆنانی بەناوبانگ، (٢٩٠– ٢١٢ پێش زایین).

[43] بڕوانە (المرجع في الحضارة العربية الإسلامية) لاپەڕە (٣٠٧).

[44] (ئیڤانجیلیستا تۆرشەلی Evangelista،Torricelli ) ئەم زانایە لە ساڵی (١٦٠٨)ی زایینیدا لەدایکبووە لە شاری (فییەنزا)ی ئیتاڵیا، دروستکەری ئامێری بارۆمیتەر و چەند ئامێرێکی تری پەیوەندیدارە بە پەستانی هەواوە، ساڵی (١٦٤٧)ی زایینی کۆچی دوایی کردووە.

هەوا، وئەمان بوون ڕێخۆشکەر بوون بۆ ئەم دۆزینەوانە وئەو ئامێرانەی کە لەسەر ئەم یاسایانە دروستکراون وەك (بارۆمیتەرەکان).

هەروەها لەسەر ڕووناکی (الضوء) لێکۆڵینەوەی زۆریان هەیە، وئاماژەیانداوە بە خێرایی ڕووناکی کە یەکێکە لە کۆڵەکەکانی زانستی فەزا وگەردوونزانی نوێ[٤٥]، لە زانستی ڕووناکیزانیدا (علم البصريات) بناغە سەرەکیەکانیان دیاریکرد، کە گرنگترینیان بریتییە لە دیاریکردنی چۆنێتی بینین ودیاردەکانی شکانەوە وپەخش کردنەوەی ڕووناکی، ولە بواری هاوێنەزانیشدا چەندین لێکۆڵینەوەیان هەیە، هەروەها لەسەر خۆرگیران ومانگ گیران لێکۆڵینەوەی راستیان هەیە.

لە زانا هەڵکەوتووەکانی بواری ڕووناکیزانیی: (الکندي) کە ساڵی (١٦٥ك–٨٧٠ز) کۆچی دوایی کردووە و٢ کتێبی نووسیوە لەم بوارەدا (إختلاف المناظر) و(إختلاف مناظر المرآة)، (إبن الهيثم)یش کە یەکەم کەس بووە باسی دیاردەی (سراب)ی کردووە، ودیاردەی نەبینینی خۆر پێش هەڵهاتن ودوای ئاوابوونی لێکداوەتەوە، و(إبن سينا)ی پزیشك وفەیلەسووف وبیرکاریزان وسروشتزانیش لەم بوارەدا زۆر کاریکردووە ونوسراوی هەیە[٤٦].

یەکەم زانایەکی ڕۆژئاوایی کە کاریگەر بووبێت بە ڕووناکیزانی موسوڵمانان (ڕۆبەرت گرۆسیتیست Robert Grosseteste) بووە (١١٦٨–١٢٥٣ز) کە بە تایبەتی بە نوسراوەکانی (رازی)

---

[٤٥] بڕوانە: (العلوم والهندسة في الحضارة الإسلامية) لاپەڕە (٨٨)، هەروەها (العلم والإيمان في الفضاء والطيران) لاپەڕە (١٧٨).

[٤٦] بڕوانە: (المرجع في الحضارة العربية الإسلامية) لاپەڕە (٣٠٨–٣١٠)، هەروەها (أوائل المسلمين في العلوم التجريبية).

و(ئیبنولهەیسەم) زۆر کارتێکراوبووە، پاش ئەم زانا رۆجەر بیکۆن (Roger Bacon)[47] (١٢٢٠-١٢٩٢ز) کە هەموو دانراوەکانی (گرۆسیتیست) و(کیندی) و(ئیبنولهەیسەم)ی لەبەردەستدا بووە (بە تایبەتی کتێبی المناظر)، سەرچاوەی سەرەکی نووسینەکانی لە رووناکیزانیدا کتێبەکانی (ئیبنولهەیسەم) بووە، کە لەگەڵ ئەمەشدا نەیتوانیوە هاوشانی وردەکاریی بیرکاریانەی (ئیبنولهەیسەم) بێت[48].

دەربارەی دەنگیش (هێزی وسەرچاوەی) موسوڵمانان لێکۆڵینەوەیان کردووە، ئەمە بووە هۆی لێکۆڵینەوەیان لەسەر مۆسیقا وئامێرە مۆسیقییەکان وچۆنێتی ژەنینیان وئەوەندە بە وردی باسی دەنگ وچۆنێتی جووڵانەوەی وبەرکەوتنی لەگەڵ تەنەکان وگەڕانەوەی قسەیان کردووە کە زۆر نزیکە لە لێکدانەوەی ئەمڕۆ[49]، لەوانەی لەم بوارەدا قسەیان کردووە فەیلەسووفەکانی برایانی سەفا (إخوان الصفا)[50] لە نامەکانیاندا، و(قەزوینی) هۆکاری بینینی هەورە بروسکەی پێش بیستنی هەورە گرمەی روونکردۆتەوە ودەڵێت: (لەبەر ئەوەی کە بینین بەهۆی

---

[47] فەیلەسوف و ریفۆرمخوازی پەروەردەیی ئەورووپی (١٢٢٠- ١٢٩٢ز).

[48] بڕوانە (موسوعة تأريخ العلوم العربية) لاپەڕە (٩١٦- ٩١٧).

[49] بڕوانە (العلوم والهندسة في الحضارة الإسلامية) لاپەڕە (٨٨).

[50] (إخوان الصفا وخلان الوفا) کۆمەڵەیەکی نهێنی بوون لە فەیلەسوفەکان کە هەڵگری بۆچوونێکی شیعی توندڕەو بوون {ئیسماعیلی (باتینی) بوون}، نوسراوەکانیان لە (٥٢) نامە پێکهاتووە و بە (رسائل إخوان الصفا) ناسراوە، کە پوختەی بۆچوونە زانستی و فەلسەفیەکانیانی تێدایە، دەبینین لەم نامانەدا روونکردنەوەی زانستیانەی تێدایە بۆ دیاردەکانی هەڵکشان و داکشانی دەریا و بوومەلەرزە و خۆرگیران و مانگگیران و شەپۆلە سەروو دەنگیەکان، هەروەها دەربارەی کیمیا و ئەستێرەگەری و سیحریش قسەیان کردووە. بڕوانە (أعلام الفلك في التأريخ العربي) لاپەڕە (٥٨).

چاوەوە دەبێت یەکسەری، بەڵام دەنگ بەهۆی گوێوە دەبێت کە دەبێت دەنگەکە بگاتە گوێی دەرەوە وپاشان بۆ ناوەوە، وئەمەش پشت دەبەستێت بە جووڵەی هەوا، کەواتە رووناکی وبینین خێراترە لە گەیشتنی دەنگ)، ئەمەش ئاماژەیەکی روونی تێدایە کە گەیشتنی رووناکی خێراترە لە گەیشتنی دەنگ.

زانایانی موسوڵمان هێزی موگناتیسیان ناسیوە وهەروەها یەکەم کەس بوون کە دەرزی موگناتیسی قیبلەنوما (البوصلة) بە ووردی دروست بکەن وبەکاری بهێنن بۆ دۆزینەوەی ئاراستە وشوێنەکان[51].



**وێنەیەکی قیبلەنوما کە لەلایەن موسوڵمانانەوە دروستکراوە بۆ دیاریکردنی ئاراستەکان، بەتایبەتیش بۆ دیاریکردنی شوێنی شاری مەککەی پیرۆز بە پێی وولاتە ئیسلامییەکان**

لە کتێبی (کنز البحار)دا هاتووە: (یەکێك لە خاسیەتەکانی موگناتیس ئەوەیە کە دەریاوانەکانی شام کاتێك نەتوانن ئەستێرەکان ببینن بۆ دۆزینەوەی چوار ئاراستەکە، ئەوا دەفرێکی پڕ لە ئاودێنن وبۆ ئەوەی کە با کاری تێنەکات دەیبەنە ناو لاشەی کەشتیەکەوە، پاشان دەرزیەك دێنن

[51] بڕوانە (العلوم والهندسة في الحضارة الإسلامية) لاپەڕە (٨٨).

ودەیکەن بەناوتاڵە کایەکدا ووەك خاچێکی لێدێت، ودوایی دەیخەنە ناودەفرە ئاوەکەوە، ئیتر دەرزییەکە سەرئاودەکەوێت، پاشان بەردێکی موگناتیسی بە قەبارەی مشتێك دێنن ولەسەر رووی ئاوەکە نزیکی دەکەنەوە وبەلای راستدا بە بازنەیی دەستیان دەسووڕێنەوە، ئەمە ئەبێتە هۆی ئەوەی کە دەرزییەکە بخولێتەوە، پاشان بە کوتوپڕی دەستیان وموگناتیسەکە لادەبەن، ئیتر دەرزییەکە دەوەستێتەوە وئاراستەی دەکاتە باکوور وباشوور)، گێڕەوەی ئەم بەسەرهاتە دەڵێت: من بەچاوی خۆم ئەمەم بینیوە کاتێك لە (تەرابولوس)ەوە بەرەو(ئیسکەندەریە) بە دەریادا بەرێکەوتین لە ساڵی (٦٤٠ك)دا[52].

(عباس بن فرناس)ی (ئەندەلوسی) کە ساڵی (٢٧٤ك) مردووە یەکەم کەس بووە کە بیرۆکەی فڕینی داهێناوە، (R. G. Grant) لە کتێبی: (فڕین: ١٠٠ساڵ لە فڕۆکەوانی) (Flight: 100 Years of Aviation) کە کتێبێکی مێژووی فڕۆکەوانییە دەڵێت: زۆر کەسی ئازا هەبوون لە مێژوودا کە وویستوویانە وەك باڵندە بفڕن، لەوانە لە ساڵی (١١٧٨ز) لە شاری قوستەنتینیە موسوڵمانێك لەکاتی سەردانی سوڵتانی عوسمانیدا هەوڵی فڕینیدا بەبەکارهێنانی دووباڵی دەستکرد کە لە سەربانێکی بەرزەوە خۆی هەڵدا بەڵام سەرکەوتوونەبوو، لە هەوڵە تۆمارکراوەکانی تر لەلایەن عباس ابن فرناس (Abbas ibn-Firnas)ەوە بووە لە ئەندەلوس (Andalusia) لە ساڵی (٨٧٥ز)دا.

(ئیبن فیرناس) فیزیایی وکیمیایی وپزیشك بووە، پزیشکی تایبەتی منداڵ وخێزانەکانی حوکمڕانەکانی ئەندەلوس بووە ، بە ناوبانگی دانای

---

[52] بڕوانە (المرجع في الحضارة العربية الإسلامية) لاپەڕە (٣٠٩).

ئەندەلوس (حكيم الأندلس) ناوی دەرکردبوو[53]، (المقري) لە کتێبی (نفح الطيب) لە بابەتی (الذكاء واستخراج العلوم واستنباطها)دا دەڵێت: ئیبن فیرناس یەکەم کەس بووە لە ئەندەلوس کە دروستکردنی شووشەی لە بەرد ئەنجامداوە، ویەکەم کەس بووە کە نهێنیەکانی مۆسیقای دەرخستووە، وئەو ئامێرەی کە ناسراوە بە (المنقلة)ی دروست کردووە بەمەبەستی زانینی کات، هەروەها لە ماڵەکەیدا ژووریکی هەبووە کە تێیدا ئامێرێکی دەستکردی خۆی هەبووە کە لەسەر شێوەی ئاسمان بووە، وهەر کەسێك کە سەیری دەکرد وای دەزانی کە ئەستێرەکان وهەورەکان وهەورە بروسکە دەبینێت!

## جووڵەزانی (زانستی میکانیك):

لەم زانستەدا کە (علم الحيل)یان پێدەووت موسوڵمانان پێشکەوتوو بوون، خەواریزمی لە کتێبی (مفاتيح العلوم)دا دابەشی دەکات بۆ ٢ بەش: یەکەمیان چۆنێتی راکێشان وبەرز کردنەوەی قورساییەکان بە بەکارهێنانی هێزێکی کەم، وبەشی دووەم دەربارەی ئامێرەکانی جووڵە ودروست کردنی دەفرە سەرسوڕهێنەکانە، هەروەها موسوڵمانان لوولە مووینەکان (موولوولەکان) وجەگ وسڵنگیان ناسیوە وبەکارهێناوە[54].

لەبواری کاتژمێرەکاندا ناسرابوون لە بەکارهێنانی کاتژمێری سێبەری (المزولة)دا بۆ دیاریکردنی کات بەهۆی سێبەری خۆرەوە، کاتژمێری

---

[53] بڕوانە (أوائل المسلمين في العلوم التجريبية).

[54] بڕوانە: (المرجع في الحضارة العربية الإسلامية) لاپەڕە (٣٠٥)، هەروەها (العلوم والهندسة في الحضارة الإسلامية) لاپەڕە (٩٠)، هەروەها (العلم والإيمان في الفضاء والطيران) لاپەڕە (١٧٩).

ئاویشیان دروستکردووه وەك ئەو دانەیەی کە خەلیفەی عەبباسی (هارون الرشید) پێشکەشی کرد بە پاشا (شارلەمان)ی فەرەنسا، هەروەها زانا (الزرقالي) دووکاتژمێری ئاویی گەورەی دروستکرد لە شاری (طليطلة) لەسەر رۆخی رووباری (تاجه) کە هەردووکیان کاریان دەکرد کاتێك کە گاورەکان چوونە ناو ئەم شارەوە لە ساڵی (١٠٨٥ز)دا[55]، موسوڵمانان لەم بوارەدا چەندین داهێنانی تریان هەیە وەك داهێنانی بەندۆل (رقّاص)ی سەعات (کە پێیان دەووت: الموّار) لەلایەن (ئیبن یونس)ی میصرییەوە، کە ناوی تەواوی ئەم زانایە (أبوسعيد عبدالرحمن بن أحمد بن يونس)ە ولە ساڵی (٣٩٩ك-١٠٠٩ز)دا کۆچی دوایی کردووە[56]، هەروەها (یەحیا) ناوێك بۆ یەکەم جار هەستا بە دروستکردنی کاتژمێرێك کە ناویان نابوو (صاحب المُنَيْقلة) ئەویش لە سەدەی نۆیەمی کۆچیدا.

لەم زانستەدا لەنێو موسوڵماناندا چەندین کەس ناوبانگیان پەیداکرد لەوانە: (إبن الرزاز الجزري) چەند کتێبێکی لەم بوارەدا نووسیوە بە ناوەکانی: کتێبی ئامێرەکان (كتاب الآلات) کە لە (دیاربەکر) لە ساڵی (١٢٠٦ز) تەواوی کردووە، وتێیدا باسی پێکهاتە وچۆنێتی دروستکردن وکارکردنی زیاتر لە ٥٠ ئامێری کردووە، لەوانە: چەندین کاتژمێر، ودەفری ووردی جۆراوجۆر، وفوارەکان، وئامێرە مۆسیقییەکان، وئامێرەکانی ئاو بەرزکردنەوە، وچەندین ئامێری تریش، هەروەها خاوەنی کتێبی (كتاب في معرفة الحيل الهندسية) بووە، و(الجامع بين العلم والعمل النافع في صناعة

---

[55] بروانە: (موسوعة تأريخ العلوم العربية) لاپەڕە (١٠١٥).

[56] بروانە: (المرجع في الحضارة العربية الإسلامية) لاپەڕە (٣٠٩).

الحیــل)ی نووســیوه كــه ســاڵی (١٩٧٤ن) لەلایــەن (دۆناڵــد هیــل)ی ئینگلیزییەوە وەرگێڕدرایە سەر زمانی ئینگلیزی وبڵاوكرایەوە.

(موسی بن شاكر) شارەزایەكی میكانیك وهەندەسە وگەردوونزانی بووە ولە سەردەمی (المأمون)دا ولە ساڵی (٢١٨ك-٨٣٣ن)دا مردووە، هەروەها كوڕەكانی محمد وأحمد وحەسەن كوڕانی (موسی بن شاكر) كتێبێكیان هەیە لە میكانیكدا كە (١٠٠) پێكهاتەی میكانیكی بەسوودی تێدایە كە ٢٠ دانەیان گرنگی زانستییان هەیە، كتێبەكە ناوی (كتاب الحیل)ە كە لە سەدەی نۆیەمی زایینیدا نوسراوە، هەر ئەم برایانە لەسەر بابەتی (زانستی قورساییەكان) نووسینیان هەیە، كە دەربارەی دەڵێن: بریتییە لەو زانستەی كە بەهۆیەوە دەتوانین قورسایی تەنی هەڵگیراودەربهێنین، وچەقی قورساییش بریتییە لەو شوێنەی هەر تەنێك كە تێیدا قورسایی ئەو تەنە لە لاكانەوە بۆ كەسی هەڵگر یەكسان دەبێت[٥٧]، ئەم برایانە زیاد لە ٢٠ دانراویان هەبووە لە زانستە جۆراوجۆرەكاندا كە بەداخەوە زوربەیان فەوتاون.

هەر لەم زانستەدا (ئیبن سینا) كتێبی (معیار العقل)ی داناوە، هەروەها موسوڵمانان داهێنەری زانستی (هایدرۆستاتیك)[٥٨]ن كە (الخازن) رۆڵی باڵای هەبووە لەم بوارەدا، بەتایبەتی لە كتێبەكەیدا (میزان الحكمة) كە بریتییە لە فراوانترین وگرنگترین دانراوەكان لە زانستی میكانیكدا لە سەدەكانی ناوەڕاستدا، كە تێیدا بە وێنەوە باسی هەندێك ئامێری

---

[٥٧] بڕوانە: (المرجع في الحضارة العربية الإسلامية) لاپەڕە (٣٠٦).

[٥٨] زانستی هاوسەنگی و پەستانی شلەكان، لە پەیوەندی نێوان ئاو و ئەو تەنانەی تێیدا نوقم دەكرێن دەكۆڵێتەوە.

تایبەتی کردووە بۆ پێوانی کێشی هاوجۆری تەنەکان، یەکێك لەو ئامێرانە ناوی ناوە (ئامێری قووچەکی ئەبی رەیحانی بەیرونی) کە بۆ پێوانی کێشی جۆری تەنەکان بەکاردێت.

بەهۆی بەکارهێنانی ئەم ئامێرانەوە (الخازن) توانی چەندین ئەنجامی سەرنج راکێش بەدەست بێنێت کە مایەی دەست خۆشی وبەرز راگرتنە، لەم خشتەیەی خوارەوەدا بەراوردێك دەبینین لەنێوان ئەو ئەنجامانەی کە (الخازن) بەدەستی هێناوە دەربارەی کێشی جۆری تەنەکان لەگەڵ ئەنجامە نوێکانی ئەم سەردەمەی زانایان، بڕوانە ئەو ئەنجامە زۆر نزیك لە راستانەی کە ئەم زانایە پێش نزیکەی ١٠٠٠ ساڵ بەدەستی هێناوە[٥٩] !

| ماددەکان | کێشی جۆری بەپێی دەرهێنانی (الخازن) | بەها نوێکانی ئەمڕۆ |
|---|---|---|
| ئاڵتوون | ١٩.٠٥ | ١٩.٣ – ١٩.٢٦ |
| جیوە | ١٣.٥٦ | ١٣.٥٦ |
| قورقوشم | ١١.٣٢ | ١١.٤٤٥ – ١١.٣٩ |
| زیو | ١٠.٣٠ | ١٠.٤٧ – ١٠.٤٣ |
| مس | ٨.٦٦ | ٨.٧٣ –٨.٦٧ |
| مسی زەرد | ٨.٥٧ | ٨.٦٠ –٨.٤٥ |
| ئاسن | ٧.٧٤ | ٧.٧٩ – ٧.٦٠ |
| تەنەکە | ٧.٣٢ | ٧.٢٩ |
| زومورڕود | ٢.٧٥ | ٢.٧٧ – ٢.٦٨ |
| مرواری پوخت | ٢.٦٠ | ٢.٦٨ |

---

[٥٩] بڕوانە: (العلوم والهندسة في الحضارة الإسلامية) لاپەڕە (٩٦–٩٧).

| | | |
|---|---|---|
| عەقیق | ٢.٥٦ | ٢.٦٢ |
| مەرجان | ٢.٥٦ | ٢.٦٩ |
| خوێی پوخت | ٢.١٩ | ٢.١٧ – ٢.٠٧ |
| نەوت (قیر) | ١.٠٤ | ١.٠٧ |
| ئاوی روون | ١.٠٠ | ١.٠٠ |
| ئاوی کوڵاو | ٠.٩٥٨ | ٠.٩٦٠ |
| سەهۆڵ | ٠.٩٦٥ | ٠.٩٢٧ – ٠.٩١٦ |
| ئاوی دەریا | ١.٠٤ | ١.٠٤ – ١.٠٢٩ |
| سرکەی مەی | ١.٠٢٧ | ١.٠٨ – ١.٠١٣ |
| مەی | ١.٠٢٢ | ١.٠٤ – ٠.٩٩٢ |
| زەیتی زەیتوون | ٠.٩٢ | ٠.٩١٩ – ٠.٩١٨ |
| شیری مانگا | ١.١١ | ١.٠٤ – ١.٠٢ |
| هێلکەی مریشك | ١.٠٣٥ | ١.٠٩ |
| هەنگوین | ١.٤٠٦ | ١.٤٥ |
| خوێنی مرۆڤـ | ١.٠٣٣ | ١.٠٥٣ |

(الخازن) بەشێکی زۆری کتێبەکەی تەرخان کردووە بۆ وەسـف کردنـی چەندین ئامێری کێشان، هـەر لـە تـەرازووە یۆنانییـە کۆنەکانـەوە بـۆ ئـەو تەرازووانەی کە موسوڵمانان دایانهێنا.

لە کۆتاییدا باسێکی دووروودرێـژی ئـەو تـەرازووە دەکـات کـە ناوینـاوە تەرازووی حیکمەت (میزان الحکمة) یـان (المیـزان الجـامع)، کـە بـە سـوود وەرگرتن لە ئەزموونەکانی پـێش خـۆی بنیاتینـا، ولـە کۆتاییـدا ئـامێرێکی کێشـانی وورد دروسـتکراوی بەرهـەم هێنـا بـۆ کێشـانە هـەرە ووردەکـان

ویەکێکە لە دەستکەوتە گەورەکانی موسوڵمانان لەم بەشەی فیزیای پراکتیکیدا بەتایبەتی لە زانستی کێشەکان ودیاریکردنی کێشە جۆرییەکاندا[٦٠] .

موسوڵمانان خشتەی کێشە جۆرییەکانیان زانیوە ماوەیەکی زۆر پێش ئەوروپییەکان، کە گرنگیدان بەم بابەتە لە ئەوروپادا تەنها لە سەدەی ١٧ی زایینییەوە دەستی پێکرد، ولە کارەکانی (رۆبەرت بۆیل)[٦١] دا گەیشتە لوتکە کە بۆ نموونە کێشی جۆری جیوەی دیاری کرد بە ٢ رێگەی جیاواز کە ئەم ٢ بەهایەیان دابەدەستەوە (١٣.٧٦) و(١٣.٣٥٧)، وەك دەبینین هەردووکیان کەمتر راستترن لەچاو ئەنجامەکەی (الخازن)، کە وەك بینیمان زوربەی ئەنجامەکانی تەواو ووردبوون[٦٢] .

## زانستی کیمیا:

لم بابەتەدا موسوڵمانان دانراوی ئێجگار زۆریان هەبووە، ئێستا لە کتێبخانەکانی (فەرەنسا وئەڵمانیا وئیتاڵیا)دا پتر لە ٣٠٠ دانراوی موسوڵمانان هەیە کە وەرگێڕدراون وپارێزراون، هەروەها لە مۆزەخانەی (بەریتانیا)دا زیاتر لە ٨٠ کتێب هەیە کە تا سەردەمانی زۆر سەرچاوەی فێرکردنی کیمیا بوون لە رۆژئاوادا[٦٣] ، موسوڵمانان لەم بوارەدا چەندین تاقیکردنەوەیان ئەنجامدا، وزۆرێك لە ترشەکان وزەرنیخ وئامۆنیا

---

[٦٠] هەمان سەرچاوە لاپەرە (٩٩- ١٠١).

[٦١] (Robert ،Boyle) فەیلەسوف و سروشتزانی ئینگلیزی (١٦٢٧- ١٦٩١ن)، کەسایەتیەکی ناسراوی ئەوروپایە لە سەدەی (١٧)دا، لەبواری کیمیادا دەستێکی باڵای هەبووە، هەروەها لە بوارەکانی فیزیا و زەویناسی و پزیشکیشدا کاری کردووە (بروانە: مەوسوعەی بەریتانی).

[٦٢] بروانە: (العلوم والهندسة في الحضارة الإسلامية) لاپەرە (٩٨).

[٦٣] بروانە: (المسلمون والعلم الحديث: عبدالرزاق نوفل).

ونیتراتی زیویان دۆزیەوە، چەندین کرداری کیمیاییان ئەنجامدا وەك: تواندنەوە، زیادکردن (التصعید)، ودڵۆپاندن (التقطیر)، وهەڵماندن (التبخیر)، وبلوورراندن (التَّبلُّور)، وکلساندن (التكلیس)، کە زانستی کیمیای نوێ بەبێ ئەم بنەمایانە نەیدەتوانی پێشبکەوێت[٦٤].

(جابیری کوڕی حەییان) یەکەم کەس بووە کە بناغەی زانستی کیمیای نوێی داهێناوە[٦٥]، (٧٠) ماددەی کیمیایی حازر کردوە وخاسیەتەکان وکارلێکەکانی دیاری کردوون، وەك: ترشەکان وکبریتەکان وکلۆریدەکان، ویەکەم کەس بووە رێگەی لێکۆڵینەوەی کیمیایی داهێناوە، هەروەها یەکەم کەس بووە کە باسی کردارەکانی (توانەوەی ماددەکان)ی کردووە، ویەکەم کەس بووە کە باسی کارلێکەکانی پاڵاوتن وبە کریستاڵ بوونی کردووە، ویەکەم کەس بووە کە بە کردارەکانی دڵۆپاندن (بەقەترە بوون) هەستاوە وباسی کردوون، هەروەها کردارەکانی سەرخستنی باس کردووە کە هیچ کەس پێشی نەداوەتەوە لەم بوارانەدا، پێش ئەم (جەعفەری صادق) لەبواری کیمیادا کاریکردووە وتوانیویەتی کە کتێبێکی (١٠٠٠) لاپەڕەیی لەم بوارەدا بنووسێت، یەکێك بووە لە مامۆستاکانی (جابیری کوڕی حەییان)[٦٦].

(ئەبوبەکری رازی) لە کتێبی (الحاوي)دا یەکەم وەسفی کردووە دەربارەی دروستکردنی ترشی کبریتیك وکحول کە بەرێگەی دڵۆپاندنی

---

[٦٤] بڕوانە: (العلم والإیمان في الفضاء والطیران) لاپەڕە (١٧٩).

[٦٥] بڕوانە: (أوائل المسلمین في العلوم التجریبیة).

[٦٦] بڕوانە: (موسوعة تأریخ العلوم العربیة) لاپەڕە (١١٠٤)، و (أوائل المسلمین في العلوم التجریبیة)، وهەروەها (الإسلام أبداً/ هادي المدرسي) لاپەڕە (٧٧)، و (المسلمون والعلم الحدیث: عبدالرزاق نوفل).

شەکرەمەنیە هەڵهاتووەکان (المتخمرة) دروستدەکرا، هەروەها (الجاحظ) لە لێکۆڵینەوە کیمیاییەکانیدا توانی کە ئامۆنیا لە پاشەڕۆی ئاژەڵەوە ئامادە بکات بەهۆی کرداری دڵۆپاندنی ووشکەوە.

موسوڵمانان چەند شتێکیان بەجێهێشتووە کە تا ئێستا زاراوەکانیان لە زمانە ئەورووپیەکاندا ماوە ودەتوانین بڵێین جێدەستیانە لەم زانستەدا، هەندێك لەوانە:

- (Alchimy) یان (Chemistry) کە بریتییە لە زانستی کیمیا، وبریتین لە هەمان ووشەی عەرەبی (الکیمیاء).
- ووشەی (Alembic)کە ناوی دەفرێکی تاقیکردنەوەی تایبەتییە وتا ئەمڕۆ بەکاردێت لە هەمان ووشەی عەرەبی (الإنبیق)ەوە وەرگیراوە، مێژوونووس (ویل دورانت) لە (قصة الحضارة)دا دەڵێت: موسوڵمانان یەکەم کەس بوون کە (الإنبیق)یان بەکارهێناوە.
- (Arithmid) کە جۆرێکە لە (کل) هەر لە ووشەی (الإثمد)ەوە وەرگیراوە.
- (Aludel) لە ووشەی (الأثال)ەوە وەرگیراوە.
- (Alkali) بە مانای (تفت) لە ووشەی (القلی) وەرگیراوە.
- (Tutti) یان زەرنیخ لە ووشەی (توتیا)وە وەرگیراوە.
- (Alcohol) لە ووشەی عەرەبی (الکحول)ەوە وەرگیراوە.
- (Calcium) لە ووشەی (کلس)ەوە وەرگیراوە.
- (Syrup) لە (شراب)ەوە وەرگیراوە[٦٧].

---

[٦٧] بڕوانە: (الإسلام أبداً) لاپەڕە (٧٦)، هەروەها (تأريخ العرب المطول).

بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە موسوڵمانان زانستی کیمیایان داهێنا ئەوەیە کە زوربەی ئاوێتە وتوخمە گرنگەکانی ئەم زانستە پێش ئەمان نەناسرابوو وەك: (الکحول) وترشی کبریتیك (H2SO4) وترشی نیتریك (HNO3) وهایدرۆکسیدی سۆدیۆم (NaOH) کە ئەمانە موسوڵمانان دۆزیانەوە.

هەروەها پۆتاسیۆم ونیتراتی زیو(AgNO3)یان ئامادەکرد، ورێگەی ئامادەکردنی جیوەیان بۆ زانستی کیمیا زیاد کرد، کردارەکانی دڵۆپاندن وزیادکردن وبلوراندن وخەستکردنەوەیان بۆ یەکەم جار داهێنا، کەواتە موسوڵمانان لەم زانستەدا لەبواری لێکۆڵینەوەی تیۆریەوە چوونە بواری پراکتیکی و جێبەجێکردنی کردارییەوە، کە جێبەجێکردنی کردارەکانی کیمیا لەبواری دەرمانسازیدا یەکێك بوو لە دەست پێشخەریەکانی زانایانی موسوڵمان[٦٨].

(Delambry) دەڵێت: ئەگەر لە یۆناندا یەك موحەقیق یان دووان هەبووبێت ئەوا موسوڵمانان هەموویان موحەقیق بوون، دەبینین تەنها یەك کەسی یۆنانییەکان نەچووە کیمیاوە لە دەرگای تاقیکردنەوە وسەلماندندا بەڵکوئەوەی تەنها دەیانوویست بریتی بوولە ئەنجامدانی موعجیزەکان بە گۆڕینی ماددەیەك بۆ ماددەیەکی تر وەك گۆڕینی برۆنز بۆ ئالتوون، ئەمە لەکاتێکدا کە موسوڵمانان زوربەی کردارەکان وبەشەکانی ئەم زانستەیان شیکار کرد بە شێوەیەك کە پشت بە تاقیکردنەوە وسەلماندن ببەستێت[٦٩].

---

[٦٨] هەمان سەرچاوە لاپەرە (٧٦).

[٦٩] هەمان سەرچاوە لاپەرە (٧٦- ٧٧).

جولیـــۆس رەســـكا (Julius Ruska) بەڕێوەبـــەری پێشـــووی پـــەیمانگای مێـــژووی زانســـتە سروشـــتییەكان لـــە (بـــەرلین) لـــە ســـەرەتای لێكۆڵینەوە گەورەكەی لەسەر (الـرازي) دەڵێـت: بـە دڵنیاییـەوە دەتـوانین بڵێین كـە كیمیـای ڕۆژئـاوای لاتینـی بەنزیكـەیی بـۆ هـیچ شـتێك قـەرزاری یۆنانییـەكان نییـە، بـەڵام بـۆ هـەموو شـتێك قـەرزاری موسـوڵمانانە..... وەرگێڕانـــی دەقـــە ئەســـڵیەكانی دانـــراوە عەرەبیـــەكان بوونـــە هـــۆی ڕێخۆشكردن لە بەرامبەر پێشكەوتنی كیمیـای ڕۆژئـاوادا ..... لـە راسـتیدا سەدەكانی ناوەڕاستی ڕۆژئاوا هەمیشە دانی بەوەدا دەنـا كـە قـەرزاربارى موسوڵمانانە بە تایبـەتی بـۆ جـابیر (كـە نـاونرابوو بـە پادشـای عـەرەب)، وهەروەها (رازی وئیبن سینا وإبن أمیل)[٧٠].

## زیندەوەرزانی:

گەشـــەكردنی هـــەردوو زانســـتی (ڕووەكناســـی) و(ئاژەڵناســـی) لـــەلای موسـولمانان هـەر لـەدوای بزوتنـەوەی فتوحـاتی ئیسـلامییەوە دەسـتی پێكـرد، كـە زانايـانی موسـوڵمان هەسـتان بـە كۆكردنـەوەی نـاوی ڕووەك وئاژەڵە جۆراوجۆرەكان، وئەم ناوانـەیان لـە فەرهەنگـە زمانەوانیەكانیانـدا كۆكردۆتـەوە، لـەو زانـا زمانەوانیانـە: (الخليـل بـن أحمـد الفراهيـدي) كـە (١٨٠ك) مردووە وخاوەنی كتێبی (العین)ە كـە نـاوی ئـاژەڵ وڕووەكـەكانی تێدایە، و(أبوعبيدة البصري) كە (٢١٣ك) مرددوە وزاناترین كەس بووە بـە زمانی عەرەبی ونزیكەی (٢٠٠) كتێبی داناوە لەوانە كتێبی (الزرع).

(الأصمعي) كە (٢١٦ك) مردووە وخـاوەنی كتێبـی (النبـات والشـجر)ە، و(أحمد بن حاتم الباهلي) كە هاوەڵی (الأصـمعي) بـووە و(٢٣١ك مـردووە)

[٧٠] بڕوانە: (موسوعة تأريخ العلوم العربية) لاپەڕە (١١٤٨).

خاوەنی کتێبەکانی (الشجر والنبات) و(الزرع والنخل) بووە، هەروەها (أبوحنيفه أحمد بن داود الدِّينَوَري) کە (٢٨٢ك) مردووە بە دامەزرێنەری رووەکناسی لەلای موسوڵمانان دادەنرێت[٧١]، کتێبەکەی کە ناوی (النبات)ە ولە (٦ بەرگی) گەورە پێکهاتووە، زۆر بەناوبانگە ونەك تەنها زمانزانەکان سوودیان لێوەرگرت بەڵکوپزیشکانیش دەیانخوێند، نزیکەی ٢١ کتێبی تری هەیە لەبوارەکانی (جەبر وهەندەسە وفەلەك)دا[٧٢].

زانایانی تریش لەسەر رووەکناسی نووسینیان هەیە وەك (إبن خالويـه) کە (٣٧٠ك) مردووە وخاوەنی کتێبی (النبات والشجر)ە، و(الجوهري) کە (٣٩٣ك) مردووە وخاوەنی فەرهەنگی (الصحاح)ە کە ناوی زۆرێك لە رووەکەکانی تێدایە، و(محمد بن أحمد إبن منظور) کە (٧١١ك) مردووە وخاوەنی کتێبی زمانەوانی بەناوبانگ (لسان العرب)ە وهەرچی دەربارەی رووەك نوسراوە پێش خۆی لێرەدا کۆی کردۆتەوە، هەروەها (محمد بن يعقوب الفيروز آبادي) کە (٨١٧ك) مردووە وخاوەنی (القاموس المحيط)ە کە ناوی زوربەی رووەکەکانی کۆکردۆتەوە، و(الزبيدي) کە لە (١١٤٥ك)دا مردووە وخاوەنی کتێبی (تاج العروس)ە وزوربەی کتێبەکانی رووەکناسی پێش خۆی تێدا کۆکردۆتەوە، کەواتە رووەکناسی لەلای موسوڵمانان وەك بەشێك لە زانستی زمانی عەرەبی دەستی پێکرد، پاشان زانایانی تر دەستیان کرد بە لێکۆڵینەوەی رووەکەکان وەك زانستێکی سەربەخۆ[٧٣].

---

[٧١] ئەم زانایە بە رەچەڵەك کورد بووە، بڕوانە: (معجم أعلام الكرد في التأريخ الإسلامي والعصر الحديث في كردستان وخارجها).

[٧٢] بڕوانە: (موسوعة تأريخ العلوم العربية) لاپەڕە (١٠٣٦- ١٠٣٨)، و هەروەها (المرجع في الحضارة العربية الإسلامية) لاپەڕە (١٥٨).

[٧٣] هەمان سەرچاوەکانی پێشوو.

زانــا موســولّمانەكان لــەرووی زانســتی رووتــەوە رووەكــەكانیان لێكدەدایــەوە، لــە رووەكــانی پزیشــكی وكشــتوكاڵی وجوگرافییــەوە، وزۆر بلیمەت بوون لە دانانی كتێب لە رووەكناسیدا وگرووپەكانی رووەكەكانیان لە یەكتری جیاكردۆتەوە، كرداری ناونانیش یەكێكە لە بناغەكانی نووسـین لە بواری رووەكناسیدا بەوەی بتوانیت نـاوێكی گونجـاو بـۆ هـەر رووەكێـك دیاری بكەیت، موسوڵمانان توانیان شـێوازێكی ناونـان دابنـێن كـە زۆر لـە شێوازی ناونانی نوێی ئەمڕۆ دەچێت كـە پێیـدەووترێت شـێوازی ناونـانی دووانـە (Binomial Nomenclature) وزانـای بۆمـاوەزانی سـویدی لینیس (Linnaeus) بە ڕێكخەری دادەنرێت، كە لـە كتێبەكەیدا (جـۆرە رووەكییـەكان Species Plantarum) باسـی لێـوەكردووە كـە سـاڵی (١٧٥٣ن) بڵاوكرایــەوە، ئــەوەتا دەبیــنین زانــا موســولّمانەكان هـــەر رووەكێكیان بە ٢ ناو ناوناوە وەك (حمص الخذراف) یـان (حمـص الروثـا) یان (المرار القیصوم)، كە ئەم ناوانـە ئەوەنـدە ووردەكـار بـوون وایـان لـە زانایـانی رۆژئـاوا كـرد هــەر ئـەم ناوانـە هەڵبـژێرن بۆیـان ئـەویش پـاش نووسینەوەیان بە زمانی لاتینی وئێستا لەهەموو جیهانـدا بـەكاردێن[٧٤]، بـا ئێستاش هەندێك نموونە لەو ناوانە بێنینەوە:

| | |
|---|---|
| الصلّة الشوكية | Zilla spinosa |
| الرَّتم | Retama raetam |
| السيَّال | Acacia seyal |
| الحارّة | Diplotaxis harra |
| الحَرْمل | Peganum harmala |

---

[٧٤] بڕوانە: (المرجع في الحضارة العربية الإسلامية) لاپەڕە (١٦١– ١٦٢).

هـەروەها هەنـدێك نـاوی عـەرەبیش وەك نـاوی هەنـدێك تـوخم دیـاری کراون، وەك:

توخمی (Alhagi) کە لەلای موسوڵمانان بە (الحاج) ناوبراوە.

توخمی (Capparis) کە لەلای موسوڵمانان بە (الكبّار) ناوبراوە.

توخمی (Suaeda) کە لەلای موسوڵمانان بە (السوادة) ناوبراوە.

توخمی (Maerua) کە لەلای موسوڵمانان بە (المر) ناوبراوە.

توخمی (Catha) کە لەلای موسوڵمانان بە (القات) ناوبراوە.

زانایانی رۆژئاوا بۆ دانانن بە پێشدەستی زانایانی موسوڵمان هەستان بە ناونانی هەندێك لە توخمـە رووەكییـەكان بـە ناویانـەوە، وەك: تـوخمی (Avicennia) بەناوی (ئیبن سینا)وە، وهەروەها تـوخمی (Rhazya) بەناوی زانا (أبوبكر الرازي)یەوە[٧٥].

یـەكێك لـە رووەكزانـە بەناوبانگـەكان بریتییـە لـە پزیشـكی قورتـوبی (الفاقي) کە سـاڵی (١١٦٥ز) مـردووە، هەسـتاوە بـە كۆكردنـەوەی هـەموو رووەكەكانی ئیسپانیا وئەفریقا وهەموویانی بە ناوە عەرەبی ولاتینییـەكان پۆلێن كردووە، بەشێوەیەك وەسفی ئەو رووەكانەی كردووە كـە دەتـوانین بڵێین فراوانترین و وردترین وەسفێكە لە زمـانی عەرەبیـدا، بـەناوبانگترین دانراوەكانی بریتییە لە (الأدوية المفـردة)، هـەروەها (إبـن الروميـة)ش لـەم بوارەدا ناودار بووە و ٥ كتێبی داناوە دەربارەی رووەكەكان ودەرمانـەكان كە لێیانەوە وەردەگیرێت.

موسـوڵمانان لـە نووسـینەكانیاندا دەربـارەی شـاژەڵ زۆر لایـەنیان وروژاندووە وەك لایەنـەكانی: شـكڵ وتوێكـاری وخانـە وكۆرپەلـە وژینگـە،

---

[٧٥] هەمان سەرچاوە لاپەڕە (١٦٥).

وهەڵس وکەوتی ئاژەڵان وبڕبڕەدارەکان وباڵندەکان ومێرووەکان[76]، کە پاڵنەریان لەم بوارەدا ڕێنومایییە ئیسلامییەکان بوو لە قورئان وفەرموودەکاندا وەك ئایەتی: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي الأَرْضِ وَلاَ طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلاَّ أُمَمٌ أَمْثَالُكُم مَّا فَرَّطْنَا فِي الكِتَابِ مِن شَيْءٍ ثُمَّ إِلَى رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ﴾ (الأنعام:٣٨) واتە: هیچ زیندەوەر وگیانلەبەرێك نییە بەسەر زەویدا بڕوات وهیچ باڵندەیەك کە بە باڵەکانی بفڕێت وئەوانیش ئوممەت وگەلێك نەبن وەك ئێوە، دڵنیابن کە هیچ شتێك نییە پشتگوێمان خستبێت.



یان ئایەتی (٤٥)ی سوورەتی (نور) کە دەفەرموێت: ﴿وَاللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَابَّةٍ مِن مَّاء فَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَى بَطْنِهِ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَى رِجْلَيْنِ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَى أَرْبَعٍ يَخْلُقُ اللَّهُ مَا يَشَاء إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ واتە: هەروەها خوا هەموو زیندەوەرێکی لە ئاو دروستکردووە، جا هەیانە لەسەر سکی دەڕوات، هەیشە لەسەر دوو قاچ دەڕوات، هەیشە لەسەر چوار پێ دەڕوات، خوا هەرچی بوێت دروستی دەکات، بەڕاستی خودا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

لە زانایانی موسوڵمان لە بوارەکانی رووەکناسی وئاژەڵناسیدا: (ئیبن لەعەووام) و(إبن البیطار)بوون کە ١٤٠٠ رووەکی وەسف کردووە.

---

[76] هەمان سەرچاوە لاپەڕە (١٦٦).

(ئـیبن سـینا) کـه زۆرێـك لـه رووەکـەکانی وەسـف کـردووە لـە کتێبـە پزیشـکییەکانیدا، هــەروەها (ئەبوبــەکری رازی) کــە ٢ نامــەی نووســیوە لەسـەر رووەکـە بۆنخۆشـەکان ومیوەکـان، هـەروەها زانـا موسـوڵمانەکانی وەك (دینــــەوەری وئیدریســــی وبەغــــدادی وقــــەزوینی وغــــافیقی) بــــە رووەکناسـەکان ناسـراون چـونکە سـیفاتە پزیشـکییەکانی رووەکـەکانیان زانیوە وخۆیان پزیشکیش بوون[٧٧] .

هەروەها (ئـیبن بەتوتـە)ی گـەڕۆك وجوگرافینـاس وەسـفی زۆرێـك لـە رووەکەکانی کردووە لە شوێنە جیاوازەکانی سەر زەویدا ئەویش لە کتێبی گەشتەکانیدا .

(بەیروونی)یشمان بیرنەچێت کە لەگەڵ بلیمەتیی لە بوارەکـانی فەلـەك وجوگرافیـا وبیرکـاری ومێـژوودا لـە رووەکناسـی وبۆماوەزانیشـدا پێشـەوا بـووە، لـە سـەرەتای تەمەنیـدا قوتـابی زانایـەکی رووەکناسـی بـووە کـە یارمــەتی داوە دەربــارەی رووەکــە پزیشــکییەکان بکۆڵێتــەوە وکتێبــە بەناوبانگەکـەی (الصـیدلة) دابنێـت، کـە تێیـدا دروسـتکردن وگێرانـەوەی دەرمانەکان وناوەکانیان وسوودەکانیان ورای زانایانی پێشووی لەسـەریان هێناوە، تا ئەمڕۆش ئەم کتێبە سەرچاوەیەکی زانستی پزیشکی چارەسـەر بە رووەکەکانە (طب الأعشاب) لـە وڵاتـی هیندسـتان، بـەهۆی زیرەکـی و ووردەکـاریی لـە بینینەکانیـدا (بـەیرونی) لـە کـاتی ئـیش کردنـی لەسـەر رووەکەکان ئەوەی دۆزییەوە کە لـە سروشـتدا گوڵـەکان خـاوەنی (٣-٤-٥-٦-٨) نێرەکن بەڵام نییانە کـە (٧ یـان ٩) دانـەی هـەبێت وئەمـەی لـە کتێبەکانیدا تۆمار کـردووە، کـە ئـەم دۆزینەوەیـە یەکـەم تاڵـە دەزووە لـە

---

[٧٧] هەمان سەرچاوە لاپەڕە (١٦٨- ١٦٩) .

بـیردۆزی بۆمـاوه لـه گوڵه‌کانـدا کـه دوای چـه‌ندین سـه‌ده زانـا (مه‌نـدل) ئاشکرای کرد[78].

رۆژئـاوا (الجـاحظ) داده‌نـێن بـه یه‌کـه‌م زانـا ونووسـه‌ر لـه زانسـتی (ئاژه‌ڵناسی)دا، هه‌روه‌ها (إبن سینا) یه‌کـه‌م کـه‌س بـووه کـه ده‌ربـاره‌ی پیتانـدن لـه ڕووه‌کـدا نووسـیویێتی[79]، کـه ده‌گـونجێ لـه‌م ئایه‌تـه ﴿وَأَرْسَلْنَا الرِّيَاحَ لَوَاقِحَ فَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاء مَاء فَأَسْقَيْنَاكُمُوهُ وَمَا أَنتُمْ لَهُ بِخَازِنِينَ﴾ (الحجر:٢٢) واته: (یه‌کێك له به‌خششه‌کانی خودا ئه‌وه‌یـه) ئێمـه شنه‌بامان ناردووه که پیتێنه‌ری ڕووه‌ك ودار ودره‌خته، هـه‌روه‌ها بارانمـان لـه ئاسمانـه‌وه بارانـدووه وئێـوه‌ی پـێ تێراوده‌کـه‌ین بێئـه‌وه‌ی ئێـوه ئـه‌و ئاوانه‌تان زه‌خیره کردبێت، (ئیبن سینا) ئـه‌م حه‌قیقه‌تـه‌ی بـاس کـردووه پێش له‌دایکبوونی (لینیس) به چه‌نده‌ها سه‌ده.

هه‌روه‌ها زانا (قـه‌زوینی) دانـه‌ری کتـێبی (عجائب المخلوقات وغرائب الموجـودات وآثـار البلاد وأخبـار العبـاد)ه کـه بـه ئینسـایکلۆپیدیایه‌ك داده‌نرێت وتێیدا وه‌سفی دروستکراوه‌کانی په‌روه‌ردگاری کردووه، هه‌ر لـه فه‌له‌ك وئه‌ستێره‌کان وهه‌ساره‌کان وخۆر ومانگ وجووڵه‌کانیان تا سروشت وئـاو وهـه‌وا وده‌ریاکـان ودورگـه‌کان وئاژه‌ڵـه‌کان وبـه‌رده‌کان وکانزاکـان وڕووه‌که‌کان، ئه‌م زانایـه نووسـینه‌کانی تێکـه‌ڵاو بـه ئایه‌تـه قورئانییـه‌کان وفـه‌رمووده‌کانی پێغه‌مبـه‌ر (ﷺ) کـردووه ودووره لـه خـه‌یاڵ وئه‌فسـانه وخورافیات[80].

---

[78] هه‌مان سه‌رچاوه لاپه‌ڕه (١٧٠).

[79] بڕوانه: (أوائل المسلمين في العلوم التجريبية).

[80] بڕوانه: (المرجع في الحضارة العربية الإسلامية) لاپه‌ڕه (١٧١).

**جوگرافیا:**

موسـولْمانان چـەندین ناویـان بـۆ ئـەم زانسـتە بـەكار هێنـاوە، وەك: (زانسـتی درێـژی وپـانی)، یـان (زانسـتی سـەرژمێری وولاتـان- تقـویم البلـدان)، یـان (وێنـەی زەوی- صـورة الأرض)، هـەروەها بـە جوگرافیـای وەسـفییان دەووت (زانسـتی رێڕەوەكـان ومەملەكەتـەكان- علـم المسـالك والممالك)، لەم زانسـتەدا بەسـەر زەویـدا گـەوڕاون ویەكـەمین نەخشـەكانی ووشكانی ودەریایان كێشاوە، وهێڵەكانی درێژی وپانییان دیاری كردووە.

زانا (إبن خرداذبة) یەكەم دانراوی لەم بوارەدا دانا بەناوی (رێڕەوەكـان ومەملەكەتەكان: المسالك والممالك) لە ساڵی (٢٣٢ك-٨٤٦ن) تـا (٢٧٢ك-٨٨٥ن) لە دانانی بووەوە، هـەروەها نـاوی (إبـن الفقیـە)یـش لـەم بـوارەدا دەركەوتووە كە لە ساڵی (٢٩٠ك-٩٠٣ن) كتێبێكی جوگرافیایی دانا وتێیـدا دەربارەی سەمەرەكانی جیهانی ئاژەلان ورووەك دواوە وچـەند بڕگەیـەكی كتێبی (صورة الأرض)یشی خستۆتە ناو لەگەڵ چەند باسێكی مێژووییدا.

لە بەناوبانگترین زانایانی موسوڵمان لەم بوارەدا (الیعقوبي، والبلاذري، والمسـعودي، والمقدسـي) بـوون، هـەروەها (الحسـن بـن أحمـد الهمـداني) ناسـراو بـە (ابـن الحائـك) كـە سـاڵی (٣٣٤ك) مـردووە وخـاوەنی كتـێبی جوگرافیـایی: وەسـفی دورگـەی عـەرەبی (وصـف الجزیـرة العربیـة)یـە، (الأصطخري)یـش كـە خـاوەنی كتێبـی (المسـالك والممالـك) بـووە وسـاڵی (٣٥٠ك) كۆچی دوایی كردووە.

یەكەم فۆتۆگرافی جوگرافیـایی زانـا (محمـد بـن موسـی)ی خـەواریزمی بـووە، چـونكە وێنـەی هەرێمـەكانی دەوڵەتـە ئیسـلامییەكانی كێشـاوە لـە كتێبەكەیـدا (صـورة الأرض)، هـەروەها (إبـن حوقـل)یـش كتێبێكـی تـری

بەناوی (صورة الأرض) داناوە، یەکەم فەرهەنگی جوگرافیایی لە مێژوودا بریتییە لە (معجم البلدان) کە نووسەرەکەی (یاقوت الحموي)یە، کە لە سەدەی حەوتەمی کۆچیدا مردووە، تا ئێستاش کتێبەکەی نرخە زانستییەکەی هەرماوە[81]...

زانا (خەواریزمی) هەستا بە کێشانی نەخشەیەکی ووردی زەوی بۆ خەلیفەی عەبباسی (المأمون)، کۆمەڵێك لە جوگرافیزانە موسوڵمانەکان لە سەدەی دەیەمی زایینیدا هەستان بە دانانی چەند نوسراوێك کە لەیەکەوە نزیك بوون، ئەوەبوو دوایی کۆکرانەوە وناونران (أطلس الإسلام)، لەو زانایانە (البلخي والإسطخري والمقدسي) بوون، هەر یەکێك لەو دانراوانە لە ٢٠ نەخشە پێکهاتبوون کە یەکەمیان نەخشەی جیهان بووە، زانا (البيروني)یش لە ناوەڕاستی ئاسیادا بلیمەت بووە لەم بوارەدا وکتێبێکی داناوە لەسەر زانستی کێشانی نەخشەکانی گۆی زەوی لە ساڵی (١٠٠٥ز)دا، کە تا ئەمڕۆش وەرگێڕانەکەی لە زانکۆی (لیدن) هەرماوە[82].

زانا (أبوالفداء)یش (کە ساڵی ٧٣٢ك کۆچی دوایی کردووە) کتێبێکی جوگرافی گرنگی هەیە بەناوی (تقويم البلدان)، لە گرنگترین ئەوزانایانەی کە گرنگییان داوە بە کێشانی نەخشە زانا (أبوزيد أحمد بن سهل البلخي) بووە کە لە سەرەتای سەدەی چوارەمی کۆچیدا مردووە وکتێبێکی هەیە بەناوی: وێنەکانی هەرێمەکان (صور الأقاليم)، هەروەها (الشريف محمد بن محمد الإدريسي) کە ساڵی (٥٤٨ك) مردووە وخاوەنی کتێبی (نزهة المشتاق في اختراق الآفاق)ە.

---

[81] بڕوانە: (أوائل المسلمين في العلوم التجريبية).

[82] بڕوانە: (موسوعة تأريخ العلوم العربية) لا (١٠٣٠)، هەروەها هەمان سەرچاوە لا (٢٨٠).

نەخشەكانی جیهان كە زانا (الإدریسي) كێشاویێتی لەهەموو جیاندا بڵاوكراوەتەوە وبەناوبانگ وناسراوبووە، كە پاش ١٥ ساڵ لە گەڕان ولێكۆڵینەوە توانی ئەتڵەسێكی تەواوی هەموو جیهان دروست بكات لە ساڵی (١١٥٤ز)دا، كە گەورەترین نەخشەی جیهانی تێدایە كە تا ئەو سەردەمە كێشرابێت ولە ٧٠ وەرەقەی لاكێشەیی پێكدێت، ئەم نووسینە بووە سەرچاوەی دانانی نووسراوە ئەوروپییەكان ولێكۆڵینەوەی ناوچە جۆراوجۆرەكانی وەك: دوورگە بەریتانییەكان، ئیسكەندیناڤیا، وئەڵمانیا، وئیسپانیا، وبولگاریا، وئەفریقا، وهیندستان[٨٣].

گرنگترین پاڵنەرێك بۆ زانایانی موسوڵمان بۆ لێكۆڵینەوە لەم زانستەدا ئاینی ئیسلام خۆی بوو، چونكە پێویستیان بووە بۆ جێبەجێ كردنی فەرزی (حەج) ودۆزینەوەی باشترین رێگا بۆ گەیشتن بەو شوێنە، هەروەها بۆ دیاریكردنی ئاراستەی قیبلە لە وڵاتە جیاوازەكاندا، هەروەها پێویستییان هەبوو بە دیاریكردنی سەرەتای مانگە عەرەبییەكان (كۆچییەكان)[٨٤]، وكاتەكانی نوێژ وزۆر شتی تری ئاینەكەیان، كە ئەمانە وای كرد گرنگی بدەن بە هێڵەكانی درێژی وپانی ولێكۆڵینەوەكانی ئەم بوارە ولێكۆڵینەوە لە بواری فەلەكدا، هەروەها هاندەریان بوو بۆ گرنگیدان بە دروستكردنی كاتژمێرەكان، ئەوەبوو كاتژمێرە لمی

---

[٨٣] بڕوانە: (المرجع في الحضارة العربية الإسلامية) لاپەڕە (٢٧٧) و هەروەها (موسوعة تأريخ العلوم العربية) لاپەڕە (٢٨٦– ٢٨٨) .

[٨٤] یان مانگە (قەمەرییەكان) كە ئەو مانگانەن كە بەپێی سووڕانەوەی مانگ بەدەوری زەویدا دیاریدەكرێن، دیارە جیاوازن لە مانگە (شەمسییەكان) كە بەپێی خولانەوەی زەوی بەدەوری خۆردا دیاریدەكرێن.

وئاوییەکانیان دروستکرد لەگەڵ چەندین ئامێری تر بۆ دیاریکردنی کات بە شێوەیەکی وورد.

موسوڵمانان سوودیان لە زۆرێك لە کتێبە جوگرافییە وەرگێڕدراوەکانی میللەتانی تر وەرگرت (بە تایبەتی هیندییەکان ویۆنانییەکان) وئەم راستییەیان نەشاردەوە (وەك هەندێك کەسی تر)، ولێکۆڵینەوەی زۆریان لەسەر ئەم کتێبانە کرد وزانیارییان لێوەرگرتن، یەکێك لەو کەسانەی سوودیان لێوەرگرت کتێبەکانی گەردوونزان وجوگرافیناسی یۆنانی ئیسکەندەری (بەتڵیمۆس) بوو (ساڵی ١٦٨ز مردووە).

گرنگترین لایەنێکی جوگرافی کە موسوڵمانان تێیدا دیار وسەرکەتوو بوون ودەوڵەمەندترین کەلەپووریان هەبوو تێیدا جوگرافیای وەسفی بوو، کە ئەو زانستەیە گرنگی دەدات بە وەسفی وولاتە جۆراوجۆرەکان وسروشتەکانیان وحاڵەتی ئابووری وباری دانیشتوانەکەیان، لەلای جوگرافیزانە موسوڵمانەکان ئەوەندە ماددەی جوگرافی کۆبووەوە کە زۆرتر بوو لە هەموو بەرهەمەکانی میللەتەکانی تری وەك (هیندی ویۆنانییەکان).



ئامێرێك بۆ دیاریکردنی قیبلە کە لەلایەن موسوڵمانانەوە لە ئێران دروستکراوە، بڕوانە شوێنی مەککەی پیرۆز لە ناوەڕاستدا.

موسـوڵمانان هـەموو ئـەورووپایان ناسـیبوو (بێجگـە لـە بەشـی هـەرە سـەرەوەی)، هـەروەها بەشـی باشـووری ئاسـیا وبـاکوور ورۆژهـەڵاتی ئەفریقایان ناسیبوو، دەربارەی وولاتانی نێوان ئیسـپانیا لـە رۆژئاواوە تـا تورکسـتان وروبـاری سـند لـە رۆژهـەڵات ووردتـرین ودووروودرێـژترین وەسفیان کردووە سەبارەت بەو شوێنانەی کە ئاوەدانە.

دەرباری شوێنە کشتوکاڵییەکان وبیابانـەکان، وراددەی بڵاوبوونـەوەی رووەکـە چـێنراوەکان وجۆرەکانیـان، وهـەروەها شـوێنەکانی بـوونی کانزاکانیان باس کردووە، کەواتە تەنها گرنگییان بە جوگرافیای سروشـتی وباروذۆخی ئاووهـەوای وولاتـان نـەداوە، بـەڵکو زیـاتر ژیـانی کۆمەڵایـەتی وپیشەسازی وئابووری وزمان وکەلەپوور وبیروباوەڕە ئـاینی وجمووجووڵـە زانسـتییەکانی وولاتانیـان بـاس کـردووە، لـە بـەناوبانگترین نووسـەرانی موسوڵمان لەم بوارەدا (إبـن ماجـد) بـووە، کـە رێنیشـاندەری گەشـتکاری پورتوگـالی (ڤاسـکۆ دی گامـا) بـووە لـە گەشـتەکەیدا لـە کـەنارەکانی (کینیا)وە بۆ هیندستان لە ساڵی (١٤٩٨ن)دا[٨٥].

یەکێك لە کارە گرنگـەکانی زانایـانی موسـوڵمان لـە بـواری جوگرافیـادا بریتییە لەو گەشتانەی کە بە وولاتانی دونیـادا ئەنجامیانـدا، وتۆمـارکردنی ئـەم گەشـتانەیان لـە نووسـراوەکانیاندا کـە کتێبخانـەی ئیسـلامییان پێدەوڵەمەنـد کـردووە، لـە گـرنگترین ئەوگەشـتانە: گەشـتی زانـا (إبـن فضلان) بۆ ناوچەی رووباری (ڤۆلگا) لـە سـاڵی (٣١٠ك-٩٢٢ن)، هـەروەها گەشتی (أبـي دلـف الخزرجـي) بـۆ تورکسـتان وچـین وتیبـت وهیندسـتان وسەجستان، هەروەها گەشتی زانای ئەندەلوسی (إبـراهیم بـن یعقـوب) بـۆ

---

[٨٥] بڕوانە: (المرجع في الحضارة العربية الإسلامية) لاپەڕە (٢٧٥- ٢٧٧).

ئـەڵمانیا وناوەڕاسـتی ئـەوروپا (واتـە ئـەم وولاتانـە: بولگاریـا، پۆڵەنـدە، چیك، سلۆڤاكیا، كەنارەكانی فەرەنسـا، وهۆڵەنـدا)[86]، بـەناوبانگترین ئـەم گەشـتانە گەشـتەكانی هـەردوو زانـا وگەشـتیار (إبـن جـبیر وإبـن بطوطـة) بوون،كەدواتر لەژیاننامەكانیاندا باسیاندەكەین.

لـە كۆتـایی ئـەم باسـەدا حەزدەكـەم دەقـی هەنـدێك ووتـەی ئـەو زانـا موسـولْمانانە بێـنم لەسـەر زەوی وخڕێتـی و وەسـفە جوگرافیـەكانی ودابەشـكردنی بـۆ هێڵـەكانی درێـژی وپـانی، وهـەروەها ئاماژەكانیـان بـە هێزی كێشكردنی زەوی وناتەواوی گۆیـەتیی زەویـش، كـە ئـەم ووتانـەیان پێش سـەدان سـاڵ ووتـووە وهەنـدێكیان لـە ١٠٠٠ سـاڵیش زیـاترە ! ! كـە هەموویان لـە ڕۆژگـاری ئـەمڕۆدا راسـتییەكانیان سـەلمێنراوە، كـە راددەی پێشكەوتنی موسـولْمانان لـە بەدەسـتهێنانی زانسـتەكاندا روونـدەكاتـەوە، لەو ووتانە:

---

[86] بڕوانە: (المرجع في الحضارة العربية الإسلامية) لاپەڕە (٢٧٨).

- زانا (المقدسي) (٣٣٥ك:٩٤٦ز لە شاری قودس لەدایك بووە) لە سەرەتای کتێبی (أحسن التقاسیم في معرفة الأقالیم)دا (کە ساڵی ٣٧٥ك-٩٨٦ز دایناوە) دەڵێت: {أما الأرض فإنها كالكرة، والأرض جاذبة لما في أيديهم من الثقل، لأن الأرض بمنزلة الحجر المغناطيس الذي يجذب الحديد. والأرض مقسومة بنصفين بينهما خط الاستواء، وهو من المشرق إلى المغرب، وهذا طول الأرض، وهوأكبر خط في كرة الأرض}.

واتە: زەوی لەشێوەی گۆییدایە، زەوی هەموو شتێك رادەکێشێت بۆ خۆی لەبەرئەوەی زەوی وەك موگناتیس وایە کە ئاسن رادەکێشێت (واتە زەوی هێزی کێشکردنی تەنەکانی هەیە)، زەوی دابەش بووە بۆ دوو نیوە کە لەنێوانیاندا هێڵی کەمەرەی زەوی هەیە، کە بریتییە لە درێژترین هێڵی گۆی زەوی.

٢- لە سەرەتای کتێبی (المسالك والممالك لابن خرداذبة) (٢٣٢ك-٨٤٦ز)دا هاتووە : {الأرض بمنزلة الحجر المغناطيس الذي يجتذب الحديد، والأرض مقسومة بنصفين بينهما خط الاستواء وهومن المشرق إلى المغرب وهذا طول الأرض. وهوأكبر خط في كرة الأرض، فاستدارة الأرض في موضع خط الاستواء ثلاثمائة وستون درجة}.

واتە: زەوی وەك بەردی موگناتیس وایە کە ئاسن رادەکێشێت، زەوی دابەش بووە بۆ دوو نیوە کە لەنێوانیاندا هێڵی کەمەرەی زەوی هەیە ولەرۆژئاواوە تا رۆژهەڵات درێژدەبێتەوە، کە بریتییە لە درێژترین هێڵی گۆی زەوی، سووڕانەوەی زەوی لەم هێڵی کەمەرەی زەوییەدا بریتییە لە ٣٦٠ پلە (واتە لەکۆێوە دەستپێدەکات دوایی دەگاتەوە هەمان شوێن کە ئەمە تەنها لە شکڵی گۆییدا دەبێت)

٣- (الشريف الإدرسي) (كە سالّی ٥٤٨ك : ١١٦٥ز مردووە) دەلّێت: {أنه صحيح أن الأرض مستديرة، ولكنها غير كاملة الاستدارة} واتە: راستە زەوی خڕ وگۆییە بەڵام گۆییەکی تەواو نییە، لە سەرەتای کتێبی (مسالك الأبصار في ممالك الأمصار لابن فضل الله العمري)دا هاتووە: {قال الشريف: ومع كون الأرض كرة، هي غير صادقة الاستدارة}، واتە: لەگەڵ ئەوەشدا کە زەوی گۆییە بەڵام گۆییەکی تەواونییە (کە ئەمەش هەمان ئەو بۆچوونە زانستییانەیە کە لەمڕۆدا سەلماوە کە زەوی گۆیی تەواو نییە بەڵکو زیاتر لە شکڵی هێلکەییدایە).

٤- (أبوبكر الصوفي) (٢٩١ك:٩٠٣ز - ٣٧٦ك:٩٨٦ز) هەروەك لە (وفيات الأعيان لابن خلكان)دا هاتووە ووتوویەتی: {لووضعنا طرف حبل على أي موضع كان من الأرض، وأدرنا الحبل على كرة الأرض، انتهينا بالطرف الآخر إلى ذلك الموضع من الأرض، والتقى الطرفان}، واتە: ئەگەر ئێمە کۆتایی پەتێك لەسەر هەر شوێنێکی زەوی دابنێین ودواتر ئەو پەتە درێژبکەینەوە بەرێکی لەسەر زەوی دەبینین لەکۆتاییدا دەگەڕێینەوە بۆ ئەو شوێنەی سەرەتای پەتەکەمان لێدانا وهەردوو سەری پەتەکە دەگەن بەیەکتری (کە بە ئاشکرا دەلّێت زەوی خڕە).

٥- لە سەرەتای کتێبی (المنتظم)ی ئیبن لجەوزیدا (٥١٠ك:١١١٦ز - ٥٩٧ك:١٢٠٠ز) هاتووە: {قال أبوالوفاء بن عقيل: الأرض على هيئة الكرة على تدوير الفلك، موضعه في جوف الفلك كالمحة في جوف البيضة، والنسيم يحيط بها كالبياض من البيضة حول المحّة، والفلك يحيط بالنسيم كإحاطة القشرة البيضاء بالبياض المحيط بالمحة، والأرض مقسومة نصفين بينهما خط الاستواء، وهومن المشرق إلى المغرب، وهوطول الأرض، وهوأكبر خط

في كرة الأرض كما أن منطقة البروج أكبر خط في الفلك، وعرض الأرض من القطب الجنوبي الذي تدور حوله بنات نعش. واستدارة الأرض في موضع خط الاستواء ثلاثمائة وستون درجة} واته: زەوی لەشکڵی گۆییدایە وەك گۆیی ئاسمان کە دەوری زەویداوە، پاشان دەڵێت: {لا اختلاف بين العلماء في أن السماء مثال الكرة، وأنها تدور بجميع ما فيها من الكواكب كدور الكرة على قطبين ثابتين غير متحركين، أحدهما في ناحية الشمال، والآخر في ناحية الجنوب}، واته: جیاوازی لەنێوان زانایانی موسوڵماندا نییە کە ئاسمانیش گۆییە و بەهەموو تەنەکانیەوە لە سووڕانەوە وجووڵەدایە، هەروەها ووتوویەتی: {وكذلك أجمعوا على أن الأرض مثل الكرة، ويدل عليه أن الشمس والقمر والكواكب لا يوحد طلوعها وغروبها على جميع من في نواحي الأرض في وقت واحد، بل على المشرق قبل المغرب، وكرة الأرض مثبتة في وسط كرة السماء}، واته: هەروەها زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی زەوی شکڵی گۆییە، بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەوەیە کە خۆر ومانگ وهەسارەکان هەموویان لەیەك کاتدا لەهەموو شوێنێکی زەویدا هەڵنایەن، بەڵکو کاتەکانی هەڵهاتنیان جیاوازە.

٦- لە کتێبی (مروج الذهب)ی مەسعودیدا (٣٤٦ك-٩٥٦ز مردووە) هاتووە: {الأرض مقسومة نصفين وبينهما خط الاستواء، وهوبين المشرق إلى المغرب وهذا هوطول الأرض، لأنه أكبر خط في كرة الأرض}، واتە: زەوی دابەش بووە بۆ دوو نیوە کە لەنێوانیاندا هێڵی کەمەرەی زەوی هەیە ولەرۆژئاواوە تا رۆژهەڵات درێژدەبێتەوە، چونکە بریتییە لە درێژترین هێڵی گۆی زەوی.

٧- (الفخر الرازي) (٥٤٤-٦٠٦ك) لە تەفسیرەکەیدا ووتوویەتی: {فإذا فرضت دائرة أخرى عظيمة مقاطعة لها على زوايا قائمة، انقسمت كرة

الأرض بهما أرباعاً ... ويقال والله أعلم أن ثلاثة الأرباع ماء}، واته: ئەگەر گریمانەی بازنەیەکی گەورەی تری ستوونی بکەین کە بازنەی کەمەرەی گۆی زەوی ببڕێت ئەوا بەهۆی ئەم ٢ بازنەوە زەوی دەبێت بە ٤ بەشەوە کە دەڵێن سێ لەم چوارە ئاوە (ئەم ڕێژەیەی نێوان ئاو و ووشکانی لە گۆی زەویدا زۆر نزیکە لە پێوانەکانی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان چونکە نزیکەی ٧٨٪ی زەوی ئاوە). هەروەها ووتوویەتی: {الأرض كرة، وإذا كان كذلك فكل وقت يمكن أن يفرض فهوصبح لقوم، وظهر لثان وعصر لثالث، ومغرب لرابع وعشاء لخامس، ومتى كان الأمر كذلك لم تكن الكعبة منفكة قط عن توجه قوم إليها من طرف من أطراف العالم لأداء فرض الصلاة، فكان الدوام حاصلاً من هذه الجهة}، واته: زەوی گۆییە، بەهۆی ئەمەوە کاتەکانی فەرزەکان جیاوازن، کە لێرەوە بۆ قەومێك بەیانی دەبێت بەڵام بۆ قەومێکی تر لەهەمان کاتدا نیوەڕۆ وبۆ سێیەم عەسر وبۆ چوارەم مەغریب وبۆ پێنجەم عیشا دەبێت، بەهۆی ئەمەشەوە بەردەوام کەعبە کەسانێك دەبن کە رووی تێبکەن بۆ نوێژە فەرزەکان لەلاکانی جیهانەوە.

٨- ئیمامی (الذهبي) (١٢٧٤-١٣٤٨ز) لە (مختصر العلو)دا ووتوویەتی: {الأرض في وسط السماء كبطيخة في جوف بطيخة، والسماء محيطة بها من جميع جوانبها، وأسفل العالم هوجوف كرة الأرض، وهوالمركز، وهومنتهى السفل. والتحت ـ وما دونه ـ لا يسمى تحتاً، بل لا يكون تحتاً، ويكون فوقاً، بحيث لوفرضنا خرق المركز ـ وهوسفل العالم ـ إلى تلك الجهة، لكان الخرق إلى جهة فوق. ولونفذ الخرق جهة السماء من تلك الجهة الأخرى، لصعد إلى جهة فوق. وبرهان ذلك: أنا لوفرضنا مسافراً سافر على كرة الأرض من جهة المشرق إلى جهة المغرب، وامتد مسافراً،

لمشي مسافراً على الكرة إلى حيث ابتدأ بالسير وقطع الكرة مما يراه الناظر أسفل منه، وهو في سفره هذا لم يبرح الأرض تحته والسماء فوقه. فالسماء التي يشهدها الحس تحت الأرض، هي فوق الأرض لا تحتها" لأن السماء فوق الأرض بالذات}.

واته: ئاسمان لەهەموو لایەكەوە دەوری زەوی داوە، ژێرەوەی جیهان بریتییە لە ناوكرۆكی گۆی زەوی، كە قووڵاییەكەیەتی، كە دوای ئەمە پێی ناووترێت ژێرەوە بەڵكو بەرەو سەرەوە دەچێتەوە (لەبەرئەوەی زەوی گۆییە)، كە ئەگەر گریمانەی ئەوە بكەین كەسێك بتوانێت كرۆكی زەوی ببڕێت ئەوە بەرەو خوارتر ناچێت بەڵكو بۆ سەرەوە دەچێت، بەڵگەی ئەمەش ئەوەیە كە ڕێبوارێك كاتێك گەشتدەكات لەسەر زەوی لە خاڵێكەوە ئەگەر بەڕێكی بڕوات لە ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو ڕۆژئاوا ئەوا دەگەڕێتەوە هەمان خاڵ كە لێوەی دەستی پێكردووە و وەك ئەوە وایە كە گۆی زەوی بڕیبێت.

٩- ئیمامی (القلقشندي) (١٣٥٥-١٤١٨ز) لە (صبح الأعشى)دا ووتوویەتی: {كرة الأرض يقسمها خط في الوسط بنصفين: نصف جنوبي، ونصف شمالي. ويسمى هذا الخط الاستواء، لاستواء الليل والنهار عنده في جميع فصول السنة، ويقاطعه خط آخر يقسمها بنصفين: نصف شرقي ونصف غربي. وتصير الأرض به أربعة أرباع}.

واتە: گۆی زەوی هێڵێك لە ناوەڕاستدا دەیكات بە ٢ نیوەوە: نیوەی سەرەوە ونیوەی خوارەوە، ئەم هێڵەش پێیدەووترێت هێڵی ئیستیوا یان هێڵی كەمەرەی زەوی، ئەویش بەهۆی ئەوەی شەو وڕۆژ لێرەدا لە هەموو وەرزەكانی ساڵدا بەقەدەر یەكن، هێڵێكی تری ستوونی ئەم هێڵە پانە

دەبڕێت و زەوی دەكات بە ٢ نیوەی ڕۆژهەلات وڕۆژئاوا، بەهۆی ئەم ٢ هێڵەوە زەوی دەبێت بە ٤ چارەك (ئەمانە یەكەم ئاماژەن لە مێژوودا بۆ هێڵەكانی درێژی وپانی زەوی كە لەمڕۆدا ئەم هێڵانە گرنگی تەواوی خۆیان هەیە لەبوارەكانی كەشتیاریی وپێوانەدا).

١٠- لە تەفسیری (البحر المحیط)ی (أبي حیان)دا (٦٥٤-٧٤٥ك) هاتووە: {قال أبوعبد الله الداراني: ثبت بالدلیل أنّ الأرض كرة، ولا ینافي ذلك قوله: مد الأرض، وذلك أنّ الأرض جسم عظیم. والكرة إذا كانت في غایة الكبر كان قطعة منها تشاهد كالسطح}، واتە: بەبەلگە سەلماوە كە زەوی خڕە، ئەمەش پێچەوانەی ووتەی پەروەردگار نییە كە زەوی تەخت كردووە، چونكە زەوی تەنێكی زۆر گەورەیە، هەركاتێكیش تۆپێك زۆر زەبەلاح بێت ئەوا ڕووەكەی وەك تەختكرابێت دەردەكەوێت.

١١- ئیمامی (الغزالي) (٤٤٥ك:١٠٥٨ز - ٥٠٥ك:١١١١ن) لە كتێبی (معیار العلم)دا دەڵێت: {عرف العقل - ببراهین لم یقدر الحس على المنازعة فیها - إن قرص الشمس أكبر من كرة الأرض، بأضعاف مضاعفة}. وأضاف: {إن الواقفین على نقطتین متقابلتین من كرة الأرض تتقابل أخمص أقدامهما، ونحن بالضرورة نعلم ذلك}.

واتە: ژیریی (مرۆڤ) بەهۆی چەندین بەلگەوە كە هەستەكان ناتوانن بەربەرەكانیی بكەن بۆی سەلماوە كە دیسكی خۆر گەورەترە لە گۆی زەوی بەچەندین قاتی زۆر، هەروەها دەڵێت: ئەو ٢ كەسەی لەسەر ٢ خاڵی بەرامبەر یەك لەسەر ڕووی گۆی زەوی وەستابن ئەوا پشتی پێی هەردووكیان بەرامبەر یەك دەبێت، ئێمەش ئەمە دەزانین وبەلگە نەوویستە لەلامان.

١٢- (ابن النفيس) (٦٨٧ك مردووه) لـه كتـێبی (شـرح كتـاب تشـريح قانون ابن سينا)دا لـه روونكردنـهوهی هۆكـاری نـهبينينی تهنـهكان لـهزۆر دوورهوه دهڵێت: {هذا يتم سـواء كانـت العـين مرتفعـة أومنخفضـة، ولكـن العين المرتفعة ترى أكثر مما إذا كانت غير مرتفعة. وسبب ذلك لـيس زيـادة قوتها أوزيادة إدراكها، بل إن تشكُّل الأرض كـرة، فالبعيـد جـداً مـا هـوعلى ظاهر الأرض ينستر عن الرؤية بحدبة الأرض} واته: ئهمه روودهدات ئهگهر چاوی كهسهكه له بهرزییهوه یان تهختییهوه سهیری بكـات، بـهڵام چـاوێك له بهرزییهوه بڕوانێت زیاتر دهبینێت له تهختاییهوه، هۆكهشی پهیوهنـدی نییه بهوهی چـاوهكه تیـژتر ببینێـت، بـهڵكو بـههۆی ئهوهوهیـه كـه زهوی شكڵی گۆییه وئاشكرایه ئهوهی كه زۆر دووربێت شاراوه دهبێـت لـهبینین بههۆی چهماوهیی رووی زهوییهوه.

١٣- (النيسـابوری) (سـهدهی نۆیـهمی كۆچـی) لـه تهفسـیرهكهیدا (غرائب القرآن ورغائب الفرقان)دا دهڵێت: {قال حكماء الإسلام : قـد ثبـت بالدلائل اليقينية أن الأرض كروية}، واته: بهبهڵگه یهقینییـهكان سـهلماوه كه زهوی گۆییه.

١٤- ئیمـامی (ابـن حـزم) (٩٩٤-١٠٦٤ز) لـه كتـێبی (الفصـل في الملـل والأهـواء والنحـل)دا دهڵێـت: {قـالوا إن الـبراهين قـد صـحت بـأن الأرض كروية، والعامة تقول غير ذلك. وجوابنا وبـالله تعـالى التوفيـق: إن أحـداً مـن أئمة المسلمين المستحقين لاسم الإمامة بالعلم - رضي الله عـنهم - لم يُنكـروا تكوير الأرض، ولا يُحفظ لأحد منهم في دفعه كلمة. بـل الـبراهين مـن القـرآن والسنة قد جـاءت بتكويرهـا قـال الله عـز وجـل: ﴿يُكَوِّرُ اللَّيْـلَ عَلَـى النَّهَـارِ وَيُكَوِّرُ النَّهَارَ عَلَى اللَّيْلِ﴾ وهذا أوضـح بيـان في تكـوير بعضـها علـى بعـض، مأخوذ من كور العمامة وهوإدارتها، وهذا نص على تكوير الأرض}.

واتە: بەڵگەکان سەلماندوویانە کە زەوی گۆییە، وهیچ پێشەوایەکی ناسراو لەناو موسوڵماناندا کە شایەنی نازناوی ئیمامەت بێ لە زانستدا ئینکاریی گۆیەتی زەوی نەکردووە تەنانەت بە ووشەیەکیش بێت، بەڵکو بەڵگەکان لە قورئان وسوننەتدا چەسپاندوویانە کە گۆییە، وەك ئەو ئایەتەی سەرەوە کە ئاشکراترین روونکردنەوەیە کە زەوی پارچەکانی بەسەریەکدا چەماونەتەوە، وەك بازنەکانی عەمامە، ئەمەش دەقێکە لەسەر گۆیی بوونی زەوی.

١٥- لە کتێبی (معجم البلدان)دا کە لە دانانی جوگرافیناس (یاقوت الحموي)یە (٦٢٦ك-١٢٢٩ز مردووە) وەك زانایانی پێشتر پێناسەی هێڵی کەمەرەی زەوی (خط الاستواء)ی بەم شێوەیە کردووە: " خط الاستواءَ من المشرق إلى المغرب وهوأطولُ خط في كرة الأرض".

١٦- باوەڕبوونی زانایانی موسوڵمان بە خولانەوەی زەوی بە دەوری خۆردا بووە هۆی ئەوەی کە تەفسیری راست ودروستی دیاردەکانی خۆرگیران ومانگگیران بکەن، ئەوەتا ئیمامی (الغزالي) لە کتێبی (تهافت الفلاسفة)دا دەڵێت: {خسوف القمر عبارة عن انمحاء ضوئه بتوسط الأرض بينه وبين الشمس من حيث أنه يقتبس نوره من الشمس والأرض كرة والسماء محيطة بها من الجوانب فإذا وقع القمر في ظل الأرض انقطع عنه نور الشمس. كقولهم إن كسوف الشمس معناه وقوف جرم القمر بين الناظر وبين الشمس وذلك عند اجتماعهما".

واتە: مانگگیران بریتییە لەنەمانی رووناکییەکەی بەهۆی ئەوەی زەوی دەچێتە نێوان ئەو وخۆرەوە، چونکە مانگ رووناکییەکەی لە خۆرەوە وەردەگرێت و زەوییش خڕە وئاسمان لە هەموو لایەکەوە دەوریداوە،

هەرکاتێکیش مانگ دەکەوێتە سێبەری زەوییەوە ئەوا ڕووناکی خۆری لێدەپچڕێت، هەروەها خۆرگیرانیش بریتییە لە وەستانی تەنی مانگ لەنێوان بینەر و خۆردا کاتێك بەیەکەوە کۆدەبنەوە.

١٧- ئاماژەدان بە بوونی حەوت چینی زەوی: کە ڕاستییەکی زانستی زۆر نوێیە، خوای گەورە لە سوورەتی (الطلاق)دا دەفەرموێت: ﴿اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَوَاتٍ وَمِنَ الْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ الْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ لِتَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْمًا(١٢)﴾، (الفخر الرازي) لە تەفسیری (مفاتيح الغيب)دا دەڵێت: {خلق سبع سموات بعضها فوق بعض مثل القبة، ومن الأرض مثلهن في كونها طباقا متلاصقة}، واتە: پەروەردگار ٧ ئاسمانی لەسەریەك دروستکردووە کە وەك قوببەن بەسەریەکەوە، هەروەها لە زەویش بەهەمان شێوە ٧ چینی دروستکردووە کە وەك قوببەی لەسەریەك پێکەوە نووساون.

هەر ئەم زانایە باسی ئەوەی کردووە لەم تەفسیرەدا کە زانایانی زەویناسی لە سەردەمی ئەودا تەنها ٣ چینی زەوییان ناسیوە، هەروەها موفەسیری گەورە (الطاهر بن عاشور) لە تەفسیرەکەیدا (التحرير والتنوير) بەهەمان شێوە موخالەفەی زانایانی سەردەمی خۆی کردووە وئەوەی باسکردووە کە زەوی (٧) چینی هەیە، زۆرێك لە موفەسیرانی قورئان بە پشت بەستن بە ئایەتە پیرۆزەکە هەمان رایان هەیە، موفەسیر (الزجاج) لە (إعراب القرآن)دا دەڵێت: {خلق سبع سموات ومن الأرض مثلهن، أي ومثلهن من الأرض}. بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتر بڕوانە بۆ ئەم بابەتانە کە لە ئینتەرنێتەوە وەرگیراون: شبهة حول مد الأرض ودحوها وكرويتها: بقلم الأستاذ عبد الرحيم الشريف، علماء الإسلام يجمعون على كروية الأرض (الجزءان ١-٢): بقلم الأستاذ عبد الرحيم الشريف.

## زانایانی شارستانییەتی ئیسلامی وبەکارهێنانی پرۆگرامی زانستیی تاقیکاریی:

ژیریی مرۆڤ بریتییە لە گەورەترین هێزێك کە وای لە ئادەمیزاد کردووە جیاوازی بکات لەنێوان شتەکان وبتوانێت خاسیەتەکان وجیاکەرەوەکانیان بدۆزێتەوە وبگاتە دەرهێنانی سوودەکانیان بۆ ژیانی خۆی، کەواتە لەسەر ئەم بناغەیە دەگەینە ئەوەی کە مەبەست لە پەروەردەکردنی عەقڵیی بریتییە لە یارمەتیدانی تاکەکان وئامادەکردنیان بۆ بیرکردنەوەیەکی راست ودروست لە ژیانیاندا، وتوانای تێڕوانین وبیرکردنەوە بۆ ئەوەی لە کاتی حوکمدان لەسەر شتەکان رێگەی راستی وعەدالەت بگرنەبەر، هەروەها یارمەتییان دەدات بۆ تێگەیشتنی دەوروبەریان وسوود وەرگرتن لە تاقیکردنەوەکانی خۆیان وشارەزایی خەڵکانی تریش.

مرۆڤ کاتێك لەدایك دەبێت خاڵی دەبێت لەهەموو زانست وزانیارییەك، وهەموو زانستێك کە لە دواییدا دەستی دەکەوێت لە رێگەی فێربوونەوە دەبێت لە دەوروبەرەکەیەوە، دەبینین پێغەمبەر (ﷺ) زۆر جوان ئەم راستییەی لە فەرموودەیەکیدا بۆ روون کردووینەتەوە کە دەفەرموێت: ﴿مَنْ يُرِدِ اللَّهُ بِهِ خَيْراً يُفَقِّهْهُ فِى الدِّينِ ، وَإِنَّمَا الْعِلْمُ بِالتَّعَلُّمِ﴾ (رواه البخاري)، واتە: هەر کەسێك خوای گەورە خێری بۆی بوێت فێری دینی دەکات وشارەزای دەکات، وزانستیش بە فێربوون وەردەگیرێت، ئەمەش لەبەرئەوەیە کە مرۆڤ کاتێك لەدایك دەبێت هەموو ئەو توانایانەی تێدایە کە بۆ فێربوون وزانیاری وەرگرتن پێویستن، ئیتر دوایی دەکەوێتە

سەرخۆی کە ئەم توانایانە بەگەڕ بخات، خوای پەروەردگاریش ئەمەی بۆ ڕوونکردووینەتەوە کە دەفەرموێت: ﴿وَاللّهُ أَخْرَجَكُم مِّن بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لاَ تَعْلَمُونَ شَيْئًا وَجَعَلَ لَكُمُ الْسَّمْعَ وَالأَبْصَارَ وَالأَفْئِدَةَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ (النحل:٧٨)، واتە: خوای گەورە ئێوەی لە سکی دایکتان دەرهێناوە بێئەوەی هیچ شتێك بزانن، ئینجا دەزگای بیستن وبینین وتێگەیشتنی بۆ دابین کردوون بۆ ئەوەی سوپاسگوزاری بکەن.

لە ڕاستیشدا گەشە کردنی خاسییەت وسیفاتە مرۆییەکان کە ئادەمیزاد لە ئاژەڵان جیادەکاتەوە وکۆنترۆڵی پاڵنەرەکانی دەکات ومێشکی مرۆڤ بە زانست وزانیاریی ڕووناك دەکاتەوە، ئەمانە هەمووی بەشێوەیەکی ڕاست ئەنجام نادرێت بەبێ بوونی پەروەردەیەکی ڕاست ودروست وگونجاو لەگەڵ سروشتی مرۆڤدا.

ئەگەر بڕوانینە قورئانی پیرۆز دەبینین لە زۆرێك لە ئایەتەکانیدا باسی دروست بوونی ئاسمان وزەوی وپێکهاتەیان دەکات، وباسی ژیان ونەفسی مرۆڤ وهەڵس وکەوتی دەکات، کە هەموو ئەم ئایەتانە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا ولەگەڵ پێشکەوتنی زانستیدا ڕاستییەکانیان دەرکەوتوون، لە هەمان کاتدا دۆزینەوە زانستییە نوێکان یارمەتییان داوین بۆ تێگەیشتنی باشتر لە قورئانی پیرۆز وراڤە کردنیان بەپێی ڕۆحی ئەم سەردەمە.

یەکەم ئایەتی قورئان تەعبیری لە گرنگی زانست کردووە لە ئیسلامدا، کە پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ{١} خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ{٢} اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ{٣} الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ{٤} عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ{٥}﴾ (العلق)، پاشان چەندین ئایەتی تر دابەزین کە هانی موسوڵمانان دەدات بۆ فێربوون و وەرگرتنی زانست، وهەروەها باسی

پلەبەرزیی زانایان دەکات بەسەر خەڵکی تردا، وەك دەفەرموێت: ﴿قُـلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُوا الْأَلْبَابِ﴾ (الزمر:٩)، واتە: تۆ بڵێ چۆن ئەوانەی کە دەزانن وەك ئەوانە دەبن کە نازانن (هەرگیز وەك یەك نابن)، ئەمە یادخەرەوەیەکە بۆ ئەو کەسانەی کە خاوەنی ژیرین.

پێغەمبەری خوداش (ﷺ) بەردەوام سووربووە لەسەر هەوڵەکانی بۆ بنیاتنانی ئوممەت ومیللەتێکی فێرخواز وبیرروونـاك وخاوەنی بەڵگەی ژیریی وتوانایی قەناعەت پێکردن، هەر لەم پێناوەدا هەوڵی بڵاوکردنەوەی زانست وزانیاری داوە لەنێوان عەرەبەکاندا، ولە فەرموودەکانیشیدا تەئکیدی لەسەر گرنگیی زانست و گەڕان بەدوایدا کردۆتەوە.

دەبینین لە فەرموودەیەکیدا وەك واجب وئەرکی سەرشانی موسوڵمان باسی کردووە کە دەفەرموێت: ﴿طَلَبُ العِلْمِ فَرِيضَةٌ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ﴾ {رواه ابن ماجة وأبويعلى وابن عبدالبر، وقال الألباني: حديث صحيح}، واتە: گەڕان بەدوای زانستدا وفێربوون ئەرکی سەر شانی هەموو موسوڵمانێکە، زانایان دەڵێن: ئەو زانستەی کە واجبە ئەوەیە کە موسوڵمان بۆ ژیانی ڕۆژانەی خۆی پێویستێتی، وئەو زانستانەش کە هەندێك کەس پێویستێتی لە کۆمەڵگادا وەك زانستی پزیشکی ودەرمانسازی وزانستەکانی تر کە ئەگەر لە کۆمەڵگادا نەبێت ئەوا زیان بەهەموو موسوڵمانان دەگات، کەواتە ئەمانە بە فەرزی کیفایە دادەنرێن (واتە چەند کەسێك لە کۆمەڵگادا لەبری هەمووی دەبێت فێری ببن وخەریکی بن)، قووڵبوونەوەش لە زانستە فەرزەکان وفەرزە کیفایەکانیشدا شتێکی باشە بۆ ئەوانەی دەتوانن وفەزیلەتێکی گەورەیە.



بـۆ جێبــەجێکردنی ئەمــەی لــە قورئــان وفەرمودەکانـدا هــاتووە موسـوڵمانان بەدرێـژایی سـەدەکان چـالاك بـوون لـە هـەموو مەیدانـەکانی چالاکییە زانستییە مرۆییەکاندا، هەر لە زانستە شەرعیەکان و(فیقه)وە بۆ زانسـتەکانی سیاسـەت وجـەنگ، موسـوڵمانان زۆر بـە خێرایـی زانسـتی شارستانییەتەکانی پـێش خۆیانیـان وەرگـرت وبەرەوپێشـیان بـرد وتێیـدا قاڵبوون، ئەوەبوو سەرمەشق وبلیمەت بـوون لـە بیرکـاری وفەلـەك وفیزیـا وکیمیا وپزیشکیدا، هەر بەمەوە نەوەسـتان بـەڵکو بـۆ هـەموو یـەکێك لـەم لقانەی زانست چەندین بەش وشـتیان زیـادکرد کـە درایـە پاڵیـان، کەواتـە بـەهۆی هەوڵـە زانسـتییە ناوازەکانیانـەوە زانسـت ومەعریفـەی مرۆڤایـەتی پێشکەوت وکاریگەرییەکی گەورەیان کـردە سـەر رۆژهـەلات ورۆژئـاوا، کـە لەوانەیە گـەورەترین کاریگـەریی وشـوێنەواریان بریتـی بێـت لـە پرۆگرامـی

زانستی بۆ بیرکردنەوە ولێکۆڵینەوە یان ئەوەی کە بە (الطريقة العلمية) یان (المنهج العلمي) ناودەبرێت.

کە ئەگەر ئەم پرۆگرامە زانستییە نەبوایە زانایان نەیاندەتوانی زۆرێك لە نهێنییەکانی سروشت وبوونەوەر بدۆزنەوە، وبتوانن کۆنترۆڵی هەندێك لە دیاردە سروشتییەکان بکەن، ویاساکانی زانست بە شێوەیەکی زانستییانە جێبەجێبکەن، کە بووە هۆی بەرهەمهێنانی ئەو هەموو داهێنراوە زانستییانەی کە بوونە هۆی دەوڵەمەند کردنی ژیانی مرۆڤەکان وئاسان کردنی، لەمڕۆماندا دۆزینەوەی ئەم پرۆگرامە زانستییە ودانانی بەردی بناغەی دراوەتە پاڵ هەردوو فەیلەسووفی ئینگلیزی فرانسیس بیکۆن (١٥٦١-١٦٢٦) وزانای ئیتالی (گالیلیۆ) (١٥٦٤-١٦٢٤ن)، کە ئەمە هەڵەیەکی مێژوویی گەورەی بەئەنقەستە وەك لەمەودوا باسی دەکەین[٨٧].

زانایانی موسوڵمان گەورەترین هاندەریان ئەو ئایەتانە بوون کە فەرمان بە موسوڵمان دەکات بۆ تێڕوانین ودۆزینەوە وەك ئایەتەکانی: ﴿وَفِي أَنفُسِكُمْ أَفَلاَ تُبْصِرُونَ﴾ (الذاريات:٢١)، واتە: بۆ سەیری ناولەشی خۆتان ناکەن تا دەسەڵاتی خواتان بۆ دەرکەوێت! ؟ باشە ئێوە بۆ نابینن؟!، هەروەها ئایەتی: ﴿أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى الْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ، وَإِلَى السَّمَاءِ كَيْفَ رُفِعَتْ وَإِلَى الْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ وَإِلَى الْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ﴾، کە پەروەردگار داوا لە خەڵکی دەکات بڕواننە دروست بوونی زیندەوەرەکان (وەك ووشتر) وچۆنێتی دروست بوون وراگیرانی ئاسمانەکان وشاخەکان وتەخت بوونی زەوی، بەڵێ زانایانی موسوڵمان

---

[٨٧] بڕوانە: (المرجع في الحضارة العربية الإسلامية) لاپەڕە (٣٦٣).

بـوون كـه بناغـەی ئـەم پرۆگرامـە زانسـتییەیان دانـاوە وبـەووردیی جێبەجێکراوە لەلایەن هەموویانـەوە لـە نووسـینەکانیان وتێڕوانینـەکانیان وتاقیگەکانیاندا.

بۆ نموونە (الحسن بن الهيثم) (٩٦٥-١٠٣٩ز) ئەم پرۆگرامە زانستییەی بەکاردەهێنا لـە تاقیکردنـەوە ولێکۆڵینەوەکانیـدا، ئـەو سـەرەتا تێـڕوانین وخوێندنەوەی دەکرد بۆ واقیـع ودەوروبـەر، پاشـان لێکۆڵینـەوە وقیاسـی لەسـەردەکرد، تێـڕوانین وخوێندنەوەکانیشـی تـەنها بـەهۆی بینینێکـی سادەی ڕووداوەکانەوە نەبوو بەڵکو بە بەکارهێنانی ئامێر وئامڕازەکـانیش بوو، کە گرنگیشی دەدا بە وەسفی ئەو ئامێرانە وچۆنێتی دروسـتکردنیان وپێکهاتە وئیشکردنیان.

زانـا (إبـن الهيـثم) بنـەماکانی پرۆگرامـی زانسـتی لـە ووتەیەکیـدا لـە سەرەتای کتێبی (المناظر) زۆر بەجوانی کورت دەکاتەوە کە دەڵێت:

(ئێمە لێکۆڵینـەوەکانمان بـە خوێندنـەوە وتێڕوانینـی دروسـتکراوەکان وناسـینەوەی خاسـییەت وسـیفاتەکان وپێکهێنـەرەکانیان دەسـت پێدەکەین، وبەتایبەتی بینین بەچاو کە ئەگەر ببینرێت دەیکەینـە پێـوەر، پاشـان لـە لێکۆڵینـەوەی وقیـاس کردنـی سـەردەکەوین پلـە بـە پلـە وبەریزبەنـدی، لەگـەڵ ڕەخنـەگرتن لـەخۆمان ودڵنیـابوون لـە ئاکامـەکان، مەبەسـتیش لەهـەموو ئـەم کردارانـە ودڵنیابوونـە بریتییـە لـە گرتنەبـەری ڕێگای حەق وعەدالەت ودوورکەوتنەوە لە هەوا وئارەزووەکان لـە گەیشـتن بە ئاکامەکانمانـدا، کارەکـانیش بـە مەبەسـتی گەیشـتن بـە هـەق وراسـتی ئەنجام دەدەین)[٨٨].

---

[٨٨] هەمان سەرچاوە لاپەرە (٣٦٤).

پرۆگرامــی (جــابیری کــوڕی حــەییان)یش (١٩٨ك-٨١٣ز مــردووە) پرۆگرامێکی زانستی وورد بــووە لــە لێکۆڵینــەوە وتاقیکردنەوەکانیـدا، کـە هــەمان ئــەو پرۆگرامەیــە کــە تــا ڕۆژگــاری ئــەمڕۆشمان لــە تاقیگەکانـدا بــەکاردێن، زۆر گرنگــی بــە تاقیکردنــەوەکان دەدا وداوای دەکــرد کــە بــە ووردیی ولەسەرخۆیی ئەنجام بدرێن ودووربکەونەوە لە هەڵەشەیی، ئەوەتا دەڵێت: (ئەرکی سەرشانی ئەو کەسەی کە بە کیمیاوە خەریکە بریتییە لـە کارکردن وئەنجامدانی تاقیکردنەوە چونکە زانیاریی تەنها بــەهۆی ئەمــەوە دەست دەکەوێت).

هــەروەها ئامۆژگــاریی ئــەو کەسانەشــی دەکــرد کــە بــە زانســتە سروشتییەکانەوە خەریك بوون کە هەوڵی ئەنجامدانی کاری لـە توانابــەدەر یان بێسوود نەدەن ودەبێت هۆکاری ئەنجامدانی هــەموو تاقیکردنەوەیــەك بزانن ولە تەعلیماتەکانیش بەباشی تێبگەن، (جابیری کــوڕی حــەییان) زۆر توند بووە لە پرۆگرامە زانستییەکەیدا، وتەنها ئەو ڕاستییانەی وەرگرتــووە کە بە بینین وتاقیکردنەوە سەلماوە، چونکە لەوانەیە ئەو دیــاردە بینــراوە تــەنها شــتێکی کــاتی بێــت وبەڵگــە نــەبێت لەســەر شــتێکی بــەردەوام لەسروشتدا، کە ئــەم پرۆگرامــەی بــەم شــێوەیە ڕوون دەکاتــەوە: (دەبێــت بزانیت کە ئێمە لەم کتێبانەماندا تەنها ئەوانە باس دەکــەین کــە بینیومــانن نەك بیستبووبێتمان یــان پێمــان ووترابێــت یــان خوێندبێتمانــەوە، ئــەویش پــاش ئــەوەی کــە تاقیکردنــەوەمان لەســەر کــردوون، وئــەوەی ڕاســت دەرچــووبێت هێناومــان وئەوانــەی هەڵــە بــووین ڕەتمــان کردوونەتــەوە، هــەروەها ئەوانــەش کــە ئێمــە بــە تاقیکردنــەوە دەرمانهێنــاون وقیاسمــان کردوون بەپشت بەستن بە قسەی خەڵکانی تر).

(جابیری كوڕی حەییان) زاراوەی ڕاهێنان (التدریب)ی بەكارهێناوە بۆ شتێك كە زانایانی ئەمڕۆ زاراوەی تاقیكردنەوەیان لێناوە، وئەم ڕاهێنانەی كردووە بە مەرجێكی سەرەكی بۆ زانای سەرڕاست، ئەمەش یەكێكە لەو تاقیكردنەوانەی كە ئەنجامیداوە و ووردەكاریی تێبینییەكانی وپڕۆگرامە زانستییەكەی زۆر بەجوانی دەردەخات، دەڵێت: {من بەردێكی بە موگناتیس كراوم (واتە بەردێك كە هێزی موگناتیسی دراوەتێ) هەبوو پارچە ئاسنێكی دەجوولاند كە بارستاییەكەی ١٠٠درهەم بوو، ئەوەبوو ماوەیەكی زۆر هەڵمگرت، وپاشان تاقیم كردەوە لەسەر پارچەیەك ئاسنی تر بەلام نەیجولاندەوە، ئیتر وامزانی كە ئەم پارچە ئاسنەی دووەم قورسترە لە پارچەی یەكەم، كە كێشام بینیم لە ٨٠درهەم كەمترە! لێرەوە ئەوەم بۆ دەركەوت كە هێزی بەردە موگناتیس كراوەكە بە تێپەڕبوونی كات كەمی كردووە لەگەڵ ئەوەشدا كە بارستاییەكەی نەگۆڕاوە} ، (جابیری كوڕی حەییان) لەم تاقیكردنەوەیەیدا تەنها بە تێبینی كردن وگومان بردن وازناهێنێت، بەڵكو كردار ئەنجام دەدات بۆ سەلماندنی ڕاستێتی ئەو بۆچوونەی كە سەرەتا پێیگەیشتووە[89].

كەواتە زانایانی موسوڵمان یەكەم كەس بوون كە پرۆگرامی ئەزمونیی وتاقیكردنەوەیان بەكارهێناوە لە مێژوودا، (جابیری كوڕی حەییان) لە ووتەیەكی تریدا دەڵێت: (ئەی ڕۆڵەكەم بەردەوام تاقیكردنەوە بكە)، كە مەبەستی تێڕوانین وبیركردنەوە وتێڕامانە وجێبەجێ كردنی ئەزمونی جیاوازە بۆ گەیشتن بە حەقیقەتی شتەكان، هەروها (جابیر) یەكەم كەس بووە كە ئامۆژگاری زانایانی كردوە بە سێبارە كردنەوەی ئەزموونەكان بە

---

[89] هەمان سەرچاوە لاپەڕە (٣٦٥).

مەبەستی دڵنیابوون لە ڕاستێتی تاقیکردنەوەکە، لێرەوە دەگەینە ئەوەی کە: موسوڵمانان یەکەم کەس بوون پرۆگرامی ئەزموونییان داهێناوە.

زانایەکی تر کە (أبوبکر محمد بن زکریا الرازي) بوو (٨٦٥-٩٢٣ز) زانستی کیمیای بەشێوەیەکی تاقیگەیی خوێندووە، وزیاتر لە ٢٠٠ نامە وکتێبی نووسیوە لە بوارەکانی: پزیشکی وفەلسەفە وبیرکاری وکیمیا وزانستە سروشتییەکاندا، یەکەم کەسێکە کە لەسەر نەخۆشییەکانی ئاوڵە (الجدري)، وسووریژە (الحصبة) بەشێوەیەکی زانستییانەی وورد نووسینی هەیە، ڕێگەیەکی ڕاست ودروستی هەبووە لە فێرکردنی زانستی پزیشکیدا، ئەوەبوو قوتابییەکانی دەبرد وبەسەر یەك یەکی نەخۆشەکاندا دەگەڕا لە نەخۆشخانەکەدا، وداوای دەکرد کە یەکێکیان بێتە پێشەوە بۆ پشکنینی نەخۆشەکە ودەربارەی نەخۆشییەکەی پرسیاری لێدەکرد بۆ ئەوەی کە دەستنیشانی بکات، ئەگەر ئەم قوتابییە سەرکەوتوو نەبوایە داوای لە یەکێکی تر دەکرد وئەگەر هەموویان شکستیان بهێنایە لە دەستنیشانکردنی نەخۆشییەکە ئەوا خۆی دەچووە پێشەوە وبۆی دەستنیشان دەکردن وڕێگە چارەی گونجاوی بۆ دادەنا وفێری دەکردن.

هەروەها (الرازي) پێش هەموو ئەوانەی پێش خۆی داوەتەوە لە تۆمارکردنی تێبینییە کلینیکییەکانی ٢٤ نەخۆش لە کتێبەکەیدا، بە ناوەکانیان ونیشانەکانی نەخۆشییەکانیان وچۆنێتی چارەسەریان وئاکامی نەخۆشییەکانیان، کەواتە گرنگی پزیشکی ئیسلامی بە پلەی یەکەم لەوتێبینییە کلینیکیانەدا بووکە تۆماریان کردووە، چونکە ئەمە زیادکردنێکی گرنگ بوو بۆ زانیارییە مرۆییەکان لە بواری پزیشکیدا.

زانا (الجاحظ)یش (١٥٠-٢٥٥ك) خاوەنی ژیرییەك وبیرکردنەوەیەکی بەهێز بووە کە بەهیچ شێوەیەك تەقەبولی خورافاتی نەدەکرد، بەڵکو گاڵتەی دەکرد بەو کەسانەی کە لە کارەکانیاندا حیسابیان بۆ خورافە دەکرد، لە زۆر کاتیشدا گومانی لە بۆچوونەکانی خۆی دەکرد تا ئەو کاتەی بە تاقیکردنەوە بۆچوونەکانی دەسەلما، لە کاتێکدا کە بیروبۆچوونەکانی (ئەرستۆ)[٩٠] زاڵبوو بەسەر عەقڵیەتی زۆربەی زانایانی موسوڵماندا، (الجاحظ) هەموو ئەو شتانەی کە عەقڵ ومەنتیق پەسەندی نەکردایە رەتی دەکردەوە تەنانەت ئەگەر سەرچاوەکەشی (ئەرستۆ) بووایە، ئەو تەنها پشتی نەدەبەست بە هەستەکان چونکە لەوانەیە بەهەڵەدا بچن و واقیع هەمیشە بەستراوەتەوە بە عەقڵەوە، عەقڵیش هەمیشە پشت دەبەستێت بە لێکدانەوە وبەراوردکردن وپێوانە کردن ودەرهێنان، ئەمانەش هەمووی پشت دەبەستن بە راستی ودەرهێنانی ئاکامەکان، هەربۆیە شتە سەیر وسەمەرەکانی دانراوەکانی کەسانی تری باس دەکرد ورەتی دەکردنەوە وراستی دەردەخست، لێرەوە (الجاحظ) شێوازێکی ژیریانەی بەکارهێناوە لە کتێبەکەیدا (الحیوان) کە پشتی بەستووە بە بینین وتێروانین ولێکدانەوە وئەنجامدانی تاقیکردنەوە لەکاتی پێویستدا، کە بەم شێوازەی پێش سەردەمی خۆی داوەتەوە کە هۆکاری زانستی نەبووە بۆ تێروانین ولێکۆڵینەوە، هەر ئەم شێوازەشە کە ئەمڕۆ لە پەیمانگا وسەنتەرەکانی توێژینەوەی تاقیگەیی لە جیهاندا

---

[٩٠] (Aristotle) زانا و فەیلەسوفی یۆنانی (٣٨٤- ٣٢٢ی پێش زایین)، یەکێکە لەو ٢ هەرە گەورە بیریارانەی یۆنان بەرهەمی هێنان (ئەوی تر ئەفلاتونە). بڕوانە: (**Encyclopaedia Britannica**).

بەکاردێت، ئەم لێکۆڵینەوانەی (الجاحظ) بەڵگەیە لەسەر پێشدەستی وفراوانی بیرە مەوسوعییەکەی ومایەی سەرسوڕمانە وئاماژە دەدات بەو روحە زانستییەی کە زانایانی موسوڵمان هەیانبووە لە گەڕان ودۆزینەوە ولێکۆڵینەوەدا[91].

زانایانی ئەوروپا لە سەرەتای سەردەمی ڕێنیسانسدا بینییان کە پرۆگرامی دەرهێنان ولێکدانەوە بە تەنها بەس نییە بۆ پڕکردنەوەی لایەنی بیرکرنەوە، هەربۆیە بنەماکانی پرۆگرامی خوێندنەوەیان دانا کە لەسەر بناغەی بینین وتاقیکردنەوە دامەزراوە، دوایی بینییان کە ئەمەش بەتەنها بەس نییە بۆیە هاتن هەردوو ئەم پرۆگرامەیان یەکخست وپرۆگرامی لێکدانەوەی زانستیی ئەمڕۆیان دامەزراند، کە پشت دەبەستێت بە ئەنجامدانی بینین وتێبینی کردنی دەرەکی وپاشان زاناکە بەهۆیانەوە بیردۆز وفیکرەیەك دادەنێت، ولە کۆتاییدا هەڵدەستێت بە ئەنجامدانی تاقیکردنەوەی پێویست بۆ دڵنیابوون لە راستی ئەو فیکرە وبۆچوونەی کە دایناوە، هەرچەندەش تاقیکردنەوەکان زیاترین ولە بارودۆخی جیاوازدابن ئەوا ئاکامەکانیش ووردتر وباوەڕپێکراوتر دەبن، ئەم پرۆگرامە هەمان ئەو پرۆگرامەیە کە (الرازي) لە لێکۆڵینەوە کلینیکییەکانیدا بەکاری هێناوە وجێبەجێی کردووە، هەروەها (جابیری کوڕی حەییان)یش شەرحی کردووە ولە تاقیگەکەیدا جێبەجێی کردووە وەك باسمان کرد.

کتێبەکانی (الرازي) و(الحسن بن الهيثم) و(جابر بن حيّان) وغەیری ئەمانیش لە زانا موسوڵمانەکان وەرگێڕدرانە سەر زمانی لاتینی، وزانایانی

---

[91] هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە (٣٦٦).

وەك (گاليلۆ) وغەيرى ئەميش ديراسەيان كردوون بە تايبەتى كتێبى (المناظر)ى ئيبنولهەيسەم، دووريش ناڕۆين كە بڵێين ئەم زانايانە لەژێر كاريگەريى كتێبەكانى زانا موسوڵمانەكاندا هەستان بە دانانى بنەماكانى لێكدانەوەى زانستييانەى ئەمڕۆمان، وراستييە مێژووييەكانيش وامان لێدەكەن كە دان بەوەدا بنێين كە زانايانى موسوڵمان پێشدەست بوون لە دانانى بنەماكانى پرۆگرامى زانستى بۆ لێكۆڵينەوە وتێڕوانين.

## چەند بوارێكى ترى پێشدەستى زانستيى موسوڵمانان:

زانايانى موسوڵمان يەكەم كەس بوون كە هەستاون بە لێكۆڵينەوەى تاشە بەردەكان وسروشتەكانيان، وئەم زانستەيان بنياتنا، زانايانى موسوڵمانيش يەكەم كەس بوون كە ياساكانى كارەبايان داناوە، كە دوايى زانا (كريرت) لێكۆڵينەوەكانى خۆى لەسەر بنيات ناوە، ويەكەم بوون لە دروست كردنى (تفەنگ)دا لە (غرناطة)ى وولآتى ئەندەلوس، ويەكەم كەس بوون كە (باروت) دروست بكەن، ويەكەم بوون لە دروستكردنى سەعاتى خولگەدار وپەوپەوەداردا، (إبن خلدون) يەكەم كەس بووە كە لە زانستى كۆمەڵناسيدا لێكۆڵينەوەى هەبووە[٩٢].

لە پێشدەستى موسوڵمانان لەپێشكەوتنى زانستدا چەند نموونەيەكى تر دێنينەوە، يەكێك لەوانە لە كتێبێك بەناوى: (Missiles،Rockets and Space Travel – واتە: ساروخەكان وهەڵدراوەكان وگەشتى فەزايى) كە لەلايەن (Willy Ley– ويلى لى) نووسراوە وتێيدا باسى مێژووى ساروخ وفيشەك وهەڵدراوەكان دەكات، ودەربارەى رۆڵى زانا

---

[٩٢] بڕوانە: (أوائل المسلمين في العلوم التجريبية).

موسـولمانەکان ونووسـینەکانیان دواوە لـەم بـوارەدا، وەك زانایـان: (أبومحمد عبدالله بن أحمـد الملقـي الأندلسـي) کە بـە (إبـن البيطـار) واتـە کـوڕی پزیشـکی ئـاژەلان ناسـراوە، ووتـەکانی دەربـارەی دروسـتکردنی (باروت) هێناوە، هەر ئەم کتێبە باسی زانایەکی تر دەکات بـەناوی (حسـن الرّماح) کە کتێبێکی داناوە پێش ٧٠٠ساڵ بەناوی (کتـاب القتـال مـن علـى ظهر الخيل مع مکائن الحرب)، کـە تێیـدا وەسـفی کـاری سـارووخ وفیشـەك وهەڵدراوەکان وتۆربیدەکان دەکات کە کـار دەکـەن بـە یاسـای کاردانـەوە (واتە بۆ هەموو کردارێك کاردانەوەیەك هەیە)، هـەروەها وەسـفی چـۆنێتی ئامادە کردنی گیراوەی ترسناك (یـان بـارووت) دەکـات کـە پێشـتر نهێنـی بووە، ئەم نووسەرە رۆژئاواییە دەڵێت: (رۆژئاواییەکان نەبوون کـە یەکـەم جـار سـارووخیان داهێنـا، بەڵکوئەمـەیان لـە موسـوڵمانانەوە وەرگـرت وئەمانیش سوودمەند بوون لە کاری چینییەکان لەپێش خۆیاندا).

چەندین بەشداری موسولمانان هەیە لە مێژووی فرۆکەوانی وفـەزادا کـە تۆمار نەکراون، ئێستا لە تورکیا ئەوە زۆر بەناوبانگە کـە (أحمـد الشـلبي) تورکی لە سەردەمی خەلافەتی عوسمانیدا پێش سەدان سـاڵ توانیویـەتی کە بە فڕین گەرووی (بسفۆر) ببڕێـت، وئـەم رووداوە ئێسـتا لـە یـەکێك لـە کتێبخانە مێژووییەکانی شاری (ئەستەنبوڵ) تۆمار کراوە.

هەروەها لەکتێبی: فەرهەنگی زاراوەی میکانیکی لە فرۆکەوانی وفەزادا (Dictionary of Technical Terms for Aerospace use)، کـە بـە تایبـەتی لەلایـەن دەزگـای نیشـتمانی فرۆکـەوانی وفـەزای ئەمریکا (ناسا) بەکاردێت وپشتگیریی دەکرێـت، لـە لاپـەڕە (١٨٥)ی ئـەم کتێبـەدا خشـتەیەك هەیـە کـە نـاوی ئەسـتێرە بەناوبانگـەکانی تێدایـە کـە

پێشتر بۆ گەشتیاریی (ملاحة) بەکاردەهێنران، کە ئەم ئەستێرانە ناوی کۆن ونوێیان هەیە، لە خشتەکەوە دەبینین کە زیاتر لە ٦٠٪ی ناوی ئەو ئەستێرانە بنچینەکەی عەرەبییە، وەك ناوەکانی (سهیل، الحمل، فم الحوت، الذنب، والدبران)[٩٣].

TABLE VII.—NAVIGATIONAL STARS (for which the *Nautical Almanac* carries full navigational information)

| Name | Bayer name | Origin of name | Meaning of name |
|---|---|---|---|
| Acamar | θ Eridani | Arabic | another form of Achernar |
| Achernar | α Eridani | Arabic | end of the river (Eridanus) |
| Acrux | α Crucis | Modern | coined from Bayer name |
| Adhara | ε Canis Majoris | Arabic | the virgin(s) |
| Aldebaran | α Tauri | Arabic | follower (of the Pleiades) |
| Alioth | ε Ursa Majoris | Arabic | another form of Capella |
| Alkaid | η Ursa Majoris | Arabic | leader of the daughters of the bier |
| Al Na'ir | α Gruis | Arabic | bright one (of the fish's tail) |
| Alnilam | ε Orionis | Arabic | string of pearls |
| Alphard | α Hydrae | Arabic | solitary star of the serpent |
| Alphecca | α Coronae Borealis | Arabic | feeble one (in the crown) |
| Alpheratz | α Andromedae | Arabic | the horse's navel |
| Altair | α Aquilae | Arabic | flying eagle or vulture |
| Ankaa | α Phoenicis | Arabic | coined name |
| Antares | α Scorpii | Greek | rival of Mars (in color) |
| Arcturus | α Bootis | Greek | the bear's guard |
| Atria | α Trianguli Australis | Modern | coined from Bayer name |
| Avior | ε Carinae | Modern | coined name |
| Bellatrix | γ Orionis | Latin | female warrior |
| Betelgeuse | α Orionis | Arabic | the arm pit (of Orion) |
| Canopus | α Carinae | Greek | city of ancient Egypt |
| Capella | α Aurigae | Latin | little she-goat |
| Deneb | α Cygni | Arabic | tail of the hen |
| Denebola | β Leonis | Arabic | tail of the lion |
| Diphda | β Ceti | Arabic | the second frog (Fomalhaut was once the first) |
| Dubhe | α Ursa Majoris | Arabic | the bear's back |
| Elnath | β Tauri | Arabic | one butting with horns |
| Eltanin | γ Draconis | Arabic | head of the dragon |
| Enif | ε Pegasi | Arabic | nose of the horse |
| Fomalhaut | α Piscis Austrini | Arabic | mouth of the southern fish |
| Gacrux | γ Crucis | Modern | coined from Bayer name |
| Gienah | γ Corvi | Arabic | right wing of the raven |
| Hadar | β Centauri | Modern | leg of the centaur |
| Hamal | α Arietis | Arabic | full-grown lamb |
| Kaus Australis | ε Sagittarii | Ar., L. | southern part of the bow |
| Kochab | β Ursa Minoris | Arabic | shortened form of "north star" (named when it was that, c. 1500 BC–AD 300) |
| Markab | α Pegasi | Arabic | saddle (of Pegasus) |
| Menkar | α Ceti | Arabic | nose (of the whale) |
| Menkent | θ Centauri | Modern | shoulder of the centaur |
| Miaplacidus | β Carinae | Ar., L. | quiet or still waters |
| Mirfak | α Persei | Arabic | elbow of the Pleiades |
| Nunki | σ Sagittarii | Bab. | constellation of the holy city (Eridu) |
| Peacock | α Pavonis | Modern | coined from English name of constellation |
| Polaris | α Ursa Minoris | Latin | the pole (star) |
| Pollux | β Geminorum | Latin | Zeus' other twin son (Castor, α Geminorum, is first twin) |
| Procyon | α Canis Minoris | Greek | before the dog (rising before the dog star, Sirius) |
| Rasalhague | α Ophiuchi | Arabic | head of the serpent charmer |
| Regulus | α Leonis | Latin | the prince |
| Rigel | β Orionis | Arabic | foot (left foot of Orion) |
| Rigil Kentaurus | α Centauri | Arabic | foot of the centaur |
| Sabik | η Ophiuchi | Arabic | second winner or conqueror |
| Schedar | α Cassiopeiae | Arabic | the breast (of Cassiopeia) |
| Shaula | λ Scorpii | Arabic | cocked-up part of the scorpion's tail |
| Sirius | α Canis Majoris | Greek | the scorching one (popularly, the dog star) |
| Spica | α Virginis | Latin | the ear of corn |
| Suhail | λ Velorum | Arabic | shortened form of Al Suhail, one Arabic name for Canopus |
| Vega | α Lyrae | Arabic | the falling eagle or vulture |
| Zubenelgenubi | α Librae | Arabic | southern claw (of the scorpion) |

* From H.O. Pub. No. 9, *American Practical Navigator*, U.S. Government Printing Office, 1958.

NATIONAL AERONAUTICS AND SPACE ADMINISTRATION

[٩٣] بڕوانە: (العلم والإيمان في الفضاء والطيران).

**وێنەکەی ئەوبەر: خشتەیەکی لاپەڕە (١٨٥)ی کتێبی:**
**(Dictionary of Technical Terms for Aerospace use) کە**
**دەرکراوی وەکالەتی فەزای ئەمریکا (ناسا)یە، دەریدەخات کە ناوی زیاتر لە ٦٠٪ی**
**بەناوبانگترین ئەستێرەکانی کەشتیاری سەرچاوەکەیان عەرەبییە**

(أبوموسى الكندي) یەکەم بیریاری ئیسلامی بووە کە لە پۆلێنی یۆنانی تەقلیدی بچێتەدەر، وەهێڵکاریی وپلانێکی نوێی گشتی تازەی دانا تاکو زانستەکان لەسەر ئەو پلانە پۆلێن بکرێن، ئەو پۆلێنەی کردی بووە هۆی ئەوەی زانایانی تریش وەکو(فارابی وخەواریزمی وئیبن سینا) ڕێچکەی ئەو بگرن لەگەڵ تۆزێك تازەگەریدا، (بلاذري) یەکەم کەس بووە کتێبی داناوە لەسەر پرۆگرامی بەستنەوەی ڕووداوەکانی مێژوو بەیەکترییەوە بە شێوەیەکی پتەو وچڕوپڕ[٩٤].

زانایانی ئێمە یەکەم کەس بوون لە سوود وەرگرتن لە زانستی کەسانی تر، کە هەستاون بە پاراستن وگواستنەوەی زانستی غەیری خۆیان، موسوڵمانان یەکەم کەس بوون زانستی(کیمیا)یان وەرگێڕا بۆ زمانی عەرەبی، لەسەروو هەموویانەوە (خالد بن یزید بن معاویة) بوو (سەدەی یەکەم ودووەمی کۆچی) کە گرنگی بەم بوارە داوە، چونکە یەکەم کەس بووە کە زانستی پزیشکی یۆنانی وەرگێڕاوە بۆ زمانی عەرەبی بە بەکارهێنانی چەندین وەرگێڕی بەتوانا ولەم پێناوەدا سامانی خۆی سەرفکرد، یەکەم کەسیش کە کتێبی (توخمەکانی ئیقلیدس)ی وەرگێڕاوە بۆ عەرەبی (حجاج بن یوسف بن مطر) بوو، کە ناوبانگی دەرکرد لە ساڵانی (٧٨٦-٨٠٣ز)دا.

---

[٩٤] بڕوانە: (أوائل المسلمين في العلوم التجريبية).

زانایــانی موســوڵمان هەســتان بــە بزوتنەوەیــەکی زۆر فــراوان لــە وەرگێڕاندا، سەرەتا بە وەرگێڕانی واتاکانی قورئانی پیرۆز دەستی پێکرد بۆ زمانی (سندی)، وهەوڵیاندا کە زانستەکانی خۆمان بۆ میللەتان بنێرن، وســوود وەربگــرن لــە زانســتی ئــەوانیش لــەو شــتانەدا کــە ســوودیان لێوەردەگیرێت، وەك: ڕێکخســتنی دیوانــەکان و وەرگێڕانــی نووســراوەکان بۆ زمانی عەرەبی، لەکاتێکدا بــە (یۆنــانی وفارســی وقیبطــی) دەنوســران، وموســوڵمانان یەکــەم کــەس بــوون پۆســتە (بریــد)یان داهێنــا، لــە ســەروو هەموویانەوە (عومەری کوڕی خەطاب) بوو، موسڵمانان یەکــەم کۆمەڵگــەی زانستییان لەهەموو جیهاندا لە (بغداد) دامەزراند بەناوی (دار الحکمة)، کــە باوەڕ وایە (هارون الرشید) دەستی بە پێکهێنــانی کردبێــت، ولەســەردەمی خەلیفەی عەبباسی (مأمون)دا فراوانکرا و گەشەی کرد[٩٥].

ســەردەمی یەکــەمی (زێڕینــی) (عەبباســییەکان) بــەناوبانگ بــوو بــە (سەردەمی کتێب نووسین)، یەکەم کەس کە کتێبی زانستی نووســی (عبــد الملك بن عبد العزیز بن جریج البصري) بوو کە لە ساڵی (١٥٥ك)دا کۆچــی دوایــی کــردووە، هەنــدێك دەڵێن یەکــەم کــەس (أبوالنصــر ســعید بــن أبــي عروبة) بــووە، کــە ئــەویش (١٥٦ك) کۆچــی دوایــی کــردووە، هەنــدێکی تــر دەڵێن یەکەم کەس (ربیع بن صبیح) بووە، کـــە لـــــە (١٦٠ك)دا کۆچــی دوایی کردووە[٩٦].

موسوڵمانان یەکـــەم زانکۆیــان دانــاوە لــە جیهانــدا، یەکـــەم کـــەس کــە بەردی بناغـــــەی دانشگای دانا (أبوموسی الأشعري) بوو لــە ســاڵی

---

[٩٥] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٩٦] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

هەشتی کۆچی لە (زبید) لە ناوچەی (تهامة)، زانستی (پەروەردە) موسوڵمانان زۆر لێهاتوو بوون تیایدا، کە گرنگییان دەدا بە پەروەردەی سێکوچکەی لاشە وعەقڵ وڕۆح بە پێچەوانەی ئاینە ئاسمانییەکانی ترەوە، بە تایبەتی گاورەکان کە لایەنی عەقڵ ولاشەیان فەرامۆش کردبوو وتەنها گرنگییان بە (رۆح) دەدا، وهەروەها بە پێچەوانەی (جولەکەکان)یشەوە کە گرنگییان تەنها بە لاشە دەدا و(عەقڵ وروح)یان فەرامۆش کردبوو، هەروەها (یۆنانی)یەکانیش کە لایەنی (ڕۆحی)یان فەرامۆش کردبوو وتەنها گرنگییان بۆ عەقڵ ولاشە بوو، ودەیانووت: (عەقڵی ساغ لە لاشەی ساغ دایە)[٩٧].

لە سەردەمە ئیسلامییەکاندا چەندین قوتابخانەی زانستی پێشکەوتوو پەیدابوون بۆ فێرکردنی زانستە جۆراوجۆرەکان، لەوانە قوتابخانەی (أبي بكر بن فورك الأصبهاني) کە لە شاری نەیسابوور دایمەزراند لە سەدەی پێنجەمی کۆچیدا وهەموو زانستەکانی تێدا دەخوێنران، پاشان ئەم قوتابخانانە بوون بە هی میریی وحکومەت خەرجیاتی دەدان، لەوانە قوتابخانەکانی (النظامیة) لە بەغدا وخوراسان کە لە لایەن وەزیری سەلجوقی (نظام الملك)ەوە دامەزران، کەواتە موسوڵمانان یەکەم کەس بوون کە فێرکردنیان کرد بە ئەرکێك لە ئەرکەکانی دەوڵەت وخوێندنی بەخۆڕاییشیان داهێنا.

لایەنێکی تری پێشدەستی زانا موسوڵمانەکان لەبواری بیریاریی ومەعریفیدا بوو، کە زۆر کەسانی پسپۆڕیان تێدا هەڵکەوت لە بواری فەلسەفەدا، ئەم زانایانە بۆچوونی فەیلەسووفەکانی پێش خۆیان (بە

---

[٩٧] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

تایبـەتی فەیلەسـووفەکانی یۆنـان) شـیکردەوە ولەلایـەن خۆشـیانەوە چەندین بۆچوونی نوێ وداهێنانیان هێنایە کایـەوە، تەنانـەت بیروبـاوەڕی ئیسلامییان تێکەڵ بە فەلسەفە کرد وهەوڵیانـدا کـە بەڵگە مەنتیقییـەکان وزاراوە فەلسـەفییەکان بـەکاربێنن بـۆ روونکردنـەوەی عەقیـدە، نـاوێکی تریـان لێنـا ئـەویش زانسـتی کـەلام (علـم الکـلام)ە، کـە یەکێکـە لـە داهێنراوەکانی موسوڵمانان وخەڵکانێکی زۆر تێیـدا هەڵکەوتوو بـوون، بـە تایبەتی شوێنکەوتووانی بۆچوونی (موعتەزیلـە) هـەر لـە داهێنەرەکەیـەوە کـە (واصـل بـن عطـاء) بـوو، کـە سـاڵی (١٣١ك-٧٤٧ز) کۆچـی دوایـی کردووە، ودوای ئـەو(بشـر بـن المعتمـر الکـوفي) کـە سـاڵی (٢١٠ك) کۆچـی دوایی کردووە، و(إبراهیم بـن سـیار النظـام البصـري)، کـە سـاڵی (٢٢١ك) کۆچـی دوایـی کـردووە، و(أبوالهـذیل العـلاّف) کـە سـاڵی (٢٢٦ك) کۆچـی دوایی کردووە، و(الجاحظ) کە ساڵی (٢٥٥ك) کۆچی دوایی کردووە.

فەیلەسووفە موسوڵمانەکان لێکۆڵینەوەیان دەکرد لـە بـوارە بیرییارییـە جیاوازەکاندا، ئەوەبوو نووسییان دەربارەی: سروشت و لەسروشت بـەدەر (میتـافیزیق)، ومەعریفـە، ورەووشـت، ودەروون، ولایەنـە فەلسـەفییەکانی تـریش ئـەنجام دەدا، زوربـەی ئـەم فەیلەسـووفانە لەوانـە بـوون کـە بـە زانسـتەکانی سروشـت وبیرکارییـەوە سـەرقاڵ بـوون، بابەتـە ئایینییـەکان گرنگترین بابەت بوون کـە فەلسـەفەی ئیسـلامی تـەرکیزی دەخستەسـەر، وزوربـەی هـەوڵی فەیلەسـووفە موسـوڵمانەکان لـە پێنـاوی یەکخسـتنی فەلسەفە بوولەگەڵ ئایندا، داهێنانکاری فەیلەسووفە موسوڵمانەکان تـەنها لـەو ئاکامانـەدا نـەبوون کـە پێیگەیشـتن بـەڵکو لەشـێوازی دەربڕینیـان وگفتوگۆکانیشیان بوو لەو بوارەدا، ئەمەشمان بە روونی بـۆ دەردەکـەوێت کە نووسراوەکانیان دەخوێنینەوە.

## کاریگەرییەکانی زانستی موسوڵمانان لەسەر پێشکەوتنەکانی رۆژئاوا

(کیپلەر)[98] لەکتێبەکەیدا (Epitome Astronomiae Copernicanae) ئەو زانیارییە گرنگانەی زانستی فەلەك بەپێی رای خۆی دیاریدەکات کە پێویستن بۆ دامەزراندنی زانستی لێکدانەوەی دیاردەکانی گەردوون، وئەرکەکانی سەرشانی گەردوونزان بە ٥ خاڵ دیاریدەکات: لێکۆڵینەوەی مێژووییانەی تێڕوانینەکان بۆ گەردوون، لێکدانەوەی ئاسۆی گریمانەکان، فیزیای هۆکاری گریمانەکان، زانستی حیسابی خشتەکان، وزانستی میکانیکی ئامێرەکان.

لە هەریەکێك لەم بەشە زانستییانەی کە (کیپلەر) دیاری کردوون پێشدەستی وهەوڵەکانی زانایانی موسوڵمان بڕبڕەی پشتی لەدایکبوونی زانستی فەلەکی لاتینی بوو لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، وپێشکەوتنەکانی سەدەکانی دواتریشی.

چونکە پێش ئەم داهێنانانە زانستی فەلەکی لاتینی هیچ ئاستێکی ئەوتۆی نەبووە وئەوەی پێیدەوترا زانستی فەلەك لە رۆژئاوادا تەنها چەند بۆچوونێك بوون بۆ وەسفکردنی گەردوون کە دووربوون لە ووردەکاری وتەنها باسی شکڵ ودوورییەکانیان دەکرد، کە تەنها بەهۆی وەرگێڕانی کارەکانی موسوڵمانان بوو بۆ زمانی لاتینی لە بوارەکانی حیسابەکانی سێگۆشەکاری وئامێرەکان وپێڕستی ئەستێرەکان وخشتە فەلەکییەکان وچەندین بواری تردا بووەهۆی ئەو گەشەکردنە بەردەوامە.

---

[98] (Johannes Kepler) گەردوونزانی ئەڵمانی (١٥٧١– ١٦٣٠ز) ٣ یاسای سەرەکی جووڵەی هەسارەکان دراوەتە پاڵی (بڕوانە Encyclopaedia Britannica).

یەکەم کاریگەریی زانستی فەلەکی موسوڵمانان لەسەر ڕۆژئاوا لەڕێی ئامێری (الإسطرلاب)ەوە بوو کە لەکۆتایی سەدەی دەیەمی زایینییەوە لە باکووری ئیسپانیادا (کە لەژێر دەستی مەسیحییەکاندا بوو) ناسراوە، بە تایبەتی دوای وەرگێڕانی نووسراوێکی زانای موسوڵمانی ئەندەلوسی (مسلمة المجريطي) لەنزیك ساڵی (١٠٠٠ن)دا، لێرەوە ناوەندە زانستییەکانی ئیسپانیا ئەم ئامێرەیان ناسیوە بەهۆی تێکەڵاوییان لەگەڵ موسوڵماناندا ونوسراویان لەسەر دەرکردووە، وەك قەشە (گێربەرتی ئۆریلاکی Gerbert of Aurillac) کە پاشان بوو بە پاپای ڤاتیکان لەژێر ناوی (سلڤسترۆسی دووەم) (١٠٠٣ز مردووە)، و(لۆبتی بەرشەلۆنی Llobet de Barcelone) و(هێرمان لی بواتێ Hermann le Boiteux) کە نوسراوەکانیان دەربارەی چۆنێتی دروستکردن وبەکارهێنانی ئەم ئامێرە بوو، هەروەها (ئەفلاتونی تیڤۆلی Platon de Tevoli) هەستا بە وەرگێڕانی نوسراوە بیرکاری وفەلەکییەکانی زانا (إبن الصفّار) کە ساڵی (٤٢٦ك-١٠٣٥ن) مردووە، پاشان خوێندنی چۆنێتی بەکارهێنانی ئەم ئامێرە خرایەناو پرۆگرامەکانی خوێندنی زانکۆکانی ئەورووپاوە، (الإسطرلاب) ئامێرێکی فێرکردنی بلیمەتانە بوو ولەهەمان کاتدا (وەك پێشتریش باسمان کردووە) ئامێرێکی بیرکارییانەش بوو کە یارمەتی شیکارکرنی هەندەسییانەی مەسەلەکانی گەردوونزانی گۆیی دەدات، هەروەها دیاری کردنی شوێن وجوولەی تەنە ئاسمانییەکانیش[٩٩].

لە ناوەڕاستی سەدەی دوانزەیەمی زایینیشەوە کۆمەڵێکی زۆر لە نوسراوەکانی موسوڵمانان لەسەر فەلەك وەرگێڕدران بۆ زمانی لاتینی

[٩٩] بڕوانە: (موسوعة تأريخ العلوم العربية) لاپەڕە (٢٣٩- ٢٤١).

وبوونه بنەمای دیاریکردنی خشتە فەلەکییەکان، بە تایبەتی خشتەکان ویاساکانی (خەواریزمی) کە (ئەدیلار دوبات) ساڵی (١١٢٦ز) وەریگێڕان، هەروەها خشتەکانی زانا (بەتتانی) کە (رۆبەرت دوشێستەر) و(ئەفلاتونی تیڤۆلی) وەریانگێڕا، وبە تایبەتیتر خشتەکانی زانا (الزرقالي) کە بە (خشتەکانی تولەیتەڵە) ناسراون زۆر بە بەربڵاوی لە ئەورووپادا بڵاوبوونەوە وبنەمایەکی سەرەکی بوون بۆ خشتە ئەورووپییەکان بە تایبەتی خشتە فەلەکییەکانی شارەکانی (پیزای ئیتالی) و(لەندەنی ئینگلیزی) و(تولوز وپاریسی فەرەنسی)[100].

دەربارەی لێکۆڵینەوەی گریمانەکان وهۆکارەکانیان زانایانی رۆژئاوا کاریگەر بوون بە نووسینەکانی زانایانی موسوڵمان بە تایبەتی کتێبەکانی (دەروازەی زانستی فەلەک) کە لەلایەن زانا (الفرغاني)یەوە نوسراوە ولەلایەن (یۆحەننای ئیشبیلی) و(جیرارد الکریموني)یەوە وەرگێڕدران لە سەدەی دوانزەیەمی زایینیدا لەژێر ناونیشانی ( Differentie Scientie Astrorum)، هەروەها نوسینەکانی زانا (ثابت بن قرة)یش کە لەلایەن (جیرارد الکریموني)یەوە وەرگێڕدران، شیکارەکانی زانا (ئیبن روشد) کە ساڵی (١١٩٨ز) مردووە لەگەڵ نوسینەکەی (البطروجي)یش کە لە نزیکەی ساڵی (١٢٠٠ز) وەرگێڕدراون، هەروەها کتێبی (هیئة العالم) کە لەلایەن زانا (إبن الهیثم)ەوە دانراوە وتا ئەمڕۆش وەرگێڕانەکەی ماوە کە ساڵی (١٢٦٧ز) ئەنجامدراوە، ئەمانە بنەمایەکی سەرەکی بیردۆزەکانی لێکدانەوە و وەسف کردنی دیاردە گەردوونییەکان بوون، لە پزیشکیشدا کتێبەکانی رازی (الحاوي) و(المنصوري) کە ساڵی (١٤٨٩ز) وەرگێڕدرا بۆ

---

[100] هەمان سەرچاوە لاپەڕە (٢٤٥-٢٤٨).

لاتینی برپرەی پشتی قوتابخانەکانی پزیشکی ئەوروپا بوون، کاتێکیش کە (لویسی ١١)ی پاشای فەرەنسا (١٤٢٣-١٤٨٣ز) ویستی نوسخەی کۆلیجی پزیشکی زانکۆی پاریس لە کتێبی (الحاوي) وەرگرێت بە ئیستعیارە بۆ کۆپیکردنی ناچاربوو وەك بارمتە برێکی زۆر لە ئاڵتون وزیودابنێت! کتێبی (التصریف)ی زەهراوی ماوەی (٥) سەدە سەرچاوەی کارە نەشتەرگەرییەکان بوو لە ئەورووپادا کە بۆ لاتینی چەندین جار وەرگێڕدراوە، کتێبی (القانون)ی ئیبن سیناش وەرگێڕدرا بۆ لاتینی ودەیان جار چاپکرا لە سەدەکانی (١٥ و١٦)ی زایینیدا، کتێبی (العقاقیر)ی (ماسویە الماردیني) (ساڵی ٤٠٦ك مردووە) کتێبی مەنهەجی خوێندنی دەرمانزانی بوو لە ئەوروپا بۆ چەندین سەدە، کتێبی (الأدویة المفردة)ی (إبن وافد) (٤٦٧ك مردووە) لە گرنگترین کتێبەکانی دەرمانزانی بووە کە زانکۆکانی ئەوروپا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا پشتیان پێدەبەست بۆ چەندین سەدە[١٠١].

لەبواری کیمیاشدا کتێبی (غایة الحکیم)ی (مسلمة المجریطي) وەرگێڕدرا بۆ لاتینی، لەمەوە ئەوروپا فێری دابەشکردنی ماددە کیمیاییەکان بوون بۆ رووەکی وحەیوانی وکانزایی، لەبواری بیرکاریشدا ئەوروپا ژمارە عەرەبییەکانیان وەرگرت بەهۆی کارەکانی (لیۆناردۆ دی بیزا) کە ساڵی (١٢٤٠ز) مردووە وبیرکاری لەلای مامۆستایەکی موسوڵمان خوێندووە لە باکووری ئەفریقا، لە ساڵی (١٢٠٢ز)دا کتێبێکی دەرکرد کە سیستمی ژمارە عەرەبییەکانی تێدا شەرح کرد وئەمە بووە سەرەتای بەکارهێنانی ژمارە عەرەبییەکان لە ئەوروپادا، ئەوەش گومانی تێدانییە

---

[١٠١] بڕوانە: (الإسلام أبداً) هادي المدرسي، هەروەها (موسوعة تأريخ العلوم العربية).

کە ئـەو بۆچوونەی وای لـە (کریسـتۆف کۆلـۆمبس) کـرد بـۆ دۆزینـەوەی کیشـوەری ئـەمریکا (١٤٩٢-١٤٩٣ز) بریتییـە لـە فیکرەیـەکی زانسـتی وەرگیراولــە نوسـراوە عەرەبییەکانـەوە لـە بـواری جوگرافیـا وفەلەکـدا، چونکە ئەگەر قەناعەتی بە خڕێتی زەوی نەبوایە ئەوا هەوڵی نەدەدا کە لە ڕۆژئـاواوە بگـات بـە هیندسـتان، کـە لەهـەموو ئـەوروپادا تـەنها دانـراوە عەرەبییـە وەرگێڕدراوەکـان بـوون کـە ئـەم بۆچـوونەیان بـاس دەکـرد وشەرحیان دەکرد.

لێردا جێی خۆیەتی ئەو ووتەیەی زانایەکی ڕۆژئاوا بێنمەوە دەربـارەی کاریگەر بوونی ڕۆژئاوا بە زانستەکانی موسوڵمانان ورۆڵـی شارسـتانییەتی ئیسلامی لە پێشـکەوتنی زانسـتی لـە ڕۆژئـاوادا کـە ئـەویش (مۆنتگـۆمری وات)ە ولە کتێبەکەیدا (فضل الإسلام علی الحضارة الغربية)دا دەڵێت:

{لێـرەدا زۆر گرنگـە کـە ئامـاژە بـدەین بـەوەی کـە شارسـتانییەتی ئیسـلامی فـەزڵێکی گـەورەی هەیـە لەسـەر گواسـتنەوەی زانسـتەکان وگەشەکردنیان لە وولاتانی ئەوروپادا لـەڕێی هەرسـێ ڕێـڕەوی ئەنـدەلوس ودورگەی (صقلية) و وولاتی شامەوە وچەندین ڕێڕەوی شارستانی تـر وەك (ڤینیسـیا) و(جەنـەوا) و(پیـزا) و(قـوبرس) و(ڕۆدس) وغـەیری ئـەمانیش، ئەمە لە کاتێکدا بـوو کـە ئـەوروپا لـەژێر بـاری گرانـی داکـەوتنی زانسـتی وشارستانیدا دەژیا، هـەروەها لەکاتێکدا بـوو کـە ئەوروپییـەکان ژیـانێکی وەستاو ودواکەوتوو دەژیان}.

لە ئەندەلوسیش چەندین زانای مەسیحی پەیدابوون کە کتێبەکانی زانـا موسوڵمانەکانیان وەرگێڕا بۆ زمانی لاتینـی، لەوانـە: (جـیرارد الکریمـوني) (١١١٤-١١٨٧ز) کـە زیـاد لـە ٧١ کتـێبی موسـوڵمانانی لـە زانسـتە

جۆراوجۆرەکانـدا وەرگێـڕا، هـەروەها لـە نیـوەی دووەمـی سـەدەی دوانزەیەمی زایینیشدا (یوحنا الإشبیلي) دەسـتی دایـە وەرگێڕانـی کتـێبی زانایانی موسوڵمان بۆ زمانی لاتینی، لەو کتێبانەی وەریگێڕان:

١- (کتاب الحساب)ی زانا (خەوارِیزمی).

٢- چـەندین نووسـین دەربـارەی (فەلـەك وجووڵـەی تەنـە ئاسمانییەکان).

٣- (کتاب في الحرکات السماویة وجوامع علم النجوم)ی زانا (الفرغاني).

٤- (کتاب عن أصل الکواکب)ی زانا (أبي علي الخیاط).

٥- هەندێك نامەی زانا (الکندي).

٦- (کتاب المدخل الی علم هیئة الأفلاك)ی زانا (أبي معشر).

٧- کتێبێك لەسەر (فەلەك) هی زانا (أبوالفخّان).

٨- راڤـەی کتێبی(بـەتلیمۆس) لەفەلەکدا دانـراوی (أحمـد بـن یوسـف المعروف بابن الدایة).

٩- کتێبی (الفلك) دانراوی زانا (البتاني).

١٠- کتێبی (الفلك) دانراوی زانا (ثابت بن قرّة).

١١- (کتاب المدخل إلی صناعة أحکام النجوم) دانراوی (القابسي).

١٢- کتێبی (الفلك) دانراوی زانا (مسلمة بن أحمد المجریطي).

١٣- کتێبی (سر الأسرار) دانراوی (الرازي).

١٤- (کتاب الفصل بین الروح والنفس) دانراوی (قسطا بن لوقا).

١٥- (کتاب إحصاء العلوم) دانراوی (الفارابي).

١٦-(کتاب الشفاء) دانراوی (ئیبن سینا).

١٧- (کتاب ینبوع الحیاة) دانراوی (إبن جبیرول).

١٨- (کتاب مقاصد الفلاسفة) دانراوی (غەزالی).

لەم وەرگێڕانانەدا راددەی بەرزی گەشەسەندنی شارستانیەتی ئیسلامی دەبینرێت، وراددەی سوود وەرگرتنی ئەورووپا لەم نووسراوە زانستییانە لە بوارە زانستییە جۆراوجۆرەکاندا بە ئاشکرا دیارە.

لەکاتێکدا ئەورووپییەکان بەدەست نەزانیی ونەخوێندەواری وئاینێکی بەبەردبووەوە دەیانناڵاند، شاری (قورتوبە)ی پایتەختی موسوڵمانان لە ئەندەلوس دەدرەوشایەوە، کە لە سەردەمی (عبدالرحمن)ی سێیەمی کاربەدەستی ئومەویدا گەورەترین پایتەخت بووە لە ئەورووپادا، لەگەڵ بوونی دەیان کۆشکی جۆراوجۆردا زیاتر لە (٢٠٠) هەزار خانووی تێدابووە، لەگەڵ ٦٠٠ مزگەوت و٣٠٠ حەمامی گشتی و٨٠ قوتابخانە و١٧ قوتابخانە بۆ خوێندنی باڵا و٢٠ کتێبخانەی گشتی کە سەدان هەزار کتێبیان تێدابووە لەهەموو زانستەکاندا.

فارسی
ئارامی - سریانی
سەنسکریتی
بابلی
قیبطی
ئیغریقی
↓
وەرگێڕانەکان

رۆژهەلاتی ئیسلامی
( ٧٥٠–٩٠٠ ) زایینی

رۆژئاوای ئیسلامی
( ٧٥٠–٩٠٠ ) زایینی

سەردەمی زێڕینی ئیسلام
( ٩٠٠ - ١١٠٠ ) زایینی
↓
وەرگێڕانەکان بۆ لاتینی
↓
راپەڕینی لاتینی لە چاخەکانی ناوەڕاستدا
( ١١٠٠ - ١٢٠٠ ) زایینی
↓
دروستبوونی زانکۆکان
↓
راپەڕین و رابوونەوەی گەورە
( ١٣٠٠ – ١٥٠٠ ) زایینی

هێڵکارییەك كە رێگاكانی كاریگەریی زانستە ئیسلامییەكان لەسەر رۆژئاوا روون دەكاتەوە

# چەند بڕگەیەك لە كتێبی چیرۆكی شارستانییەت



یەكێك لە سەرچاوە هەرە گرنگە ڕۆژئاواییەكان لەسەر مێژوو بەگشتی ومێژووی گەشە كردنی زانست وشارستانییەت بە تایبەتی بریتییە لە كتێبی چیرۆكی شارستانییەت (قصة الحضارة The Story of Civilization) كە نووسەرەكەی بریتییە لە (ویل دیورانت Will Durant)ی نووسەری ئەمریكی[102]، ئەم مێژوونووسە لە باسی مێژووی مسوڵمانان وگەشە

---

[102] ویلیام جەیمس دورانت (William James Durant) (٥ی نۆڤەمبەری ١٨٨٥–٧ی نۆڤەمبەری ١٩٨١) نووسەر و مێژوونووسێكی بەناوبانگی ئەمریكییە، ناوبانگی دەگەڕێتەوە بۆ كتێبە ناسراوەكەی لەسەر مێژووی جیهان كە بەناوی (چیرۆكی شارستانییەت *The Story of Civilization*)ەوەیە و هەندێك بەرگی بەهاوبەشی خێزانەكەی ئاریل دورانت (Ariel Durant) نووسیوە.

لە ویلایەتی (ماساشوستس)ی ئەمریكی لەدایكبووە و ژیاوە، ساڵی ١٩٠٧ لە بەشی كۆمەڵناسی زانكۆی (سانت پیتەر) دەرچووە و دەستی كردووە بە كاری ڕۆژنامەنووسی، پاشان لە چەند كۆلێج و قوتابخانەیەك وانەی ووتووەتەوە لەسەر مێژوو كە بوونە بناغەی دانانی كتێبە ناسراوەكەی، هەروەها بەرپرسی كتێبخانەش بووە، ساڵی ١٩١٧ بڕوانامەی دكتۆرای لەبواری (فەلسەفە)دا وەرگرتووە و بووەتە مامۆستای زانكۆ، كتێبی (چیرۆكی شارستانییەت) سەرەتا بەشێوەی چەند نامیلكەیەكی بەدوای یەكدا دەرچوون و پاشان كۆكرانەوە و بە چەند بەرگێك دەرچوون لە ساڵی (١٩٢٦)دا، و بوونە باشترین كتێبەكان لە ئەمریكادا لەڕووی فرۆشتنەوە، كە ئەمە وای لە نووسەرەكەی كرد لێیبڕێت بۆ نووسین و چەند جارێك هەموو جیهان گەڕاوە.

بە ماوەی ٤٠ ساڵی تەمەنی توانی ١١ بەشی ئەم كتێبە مێژووییەی بنووسێت (لە ٤٣ بەرگدا)، بەهۆی ناوبانگ و بڵاوبوونەوەی فراوانی ئەم كتێبە لەهەموو جیهاندا بە

کردنی زانستییاندا چەند ووتەیەکی جوانی هێناوە وشایەتیداوە لەسەر پێشدەستی زانایانی موسوڵمان لەبوارەکانی شارستانییەت وزانستەکاندا کە پێم خۆشبوو بیکەم بە کۆتایی ئەم بەشە، دەڵێت:

---

سەرکەوتووترین زنجیرەی مێژوویی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا دانراوە، بەشی دەیەمی ئەم زنجیرەیە بەناوی: رۆسۆ و شۆڕش (*Rousseau and Revolution*) کە لە ساڵی (١٩٦٧)دا دەرچوو خەڵاتی (پۆلیتزەر Pulitzer Prize)ی بردەوە، دواتریش بەرزترین خەڵاتی پێدرا کە لەلایەن سەرۆکی وڵاتە یەکگرتووەکانەوە دەدرێت بە هاوڵاتیان کە مەدالیای سەرۆکە بۆ سەربەخۆیی (Presidential Medal of Freedom)، کە ساڵی (١٩٧٧) لەلایەن سەرۆکی ئەو کاتەی ئەمریکا (جیراڵد فۆرد)ەوە پێیدرا، ناوی بەشەکانی کتێبی چیرۆکی شارستانییەت بە ئینگلیزی بەم شێوەیە:


1) **Durant، Will (1935). *Our Oriental Heritage*. New York: Simon and Schuster.**
2) **Durant، Will (1939). *The Life of Greece*. New York: Simon and Schuster.**
3) **Durant، Will (1944). *Caesar and Christ*. New York: Simon and Schuster.**
4) **Durant، Will (1950). *The Age of Faith*. New York: Simon and Schuster.**
5) **Durant، Will (1953). *The Renaissance*. New York: Simon and Schuster.**
6) **Durant، Will (1957). *The Reformation*. New York: Simon and Schuster.**
7) **Durant، Will، & Durant، Ariel (1961). *The Age of Reason Begins*. New York: Simon and Schuster.**
8) **Durant، Will، & Durant، Ariel (1963). *The Age of Louis XIV*. New York: Simon and Schuster.**
9) **Durant، Will، & Durant، Ariel (1965). *The Age of Voltaire*. New York: Simon and Schuster.**
10) **Durant، Will، & Durant، Ariel (1967). *Rousseau and Revolution*. New York: Simon and Schuster.**
11) **Durant، Will، & Durant، Ariel (1975). The Age of Napoleon. New York: Simon and Schuster.**

فەرموودەکانی پێغەمبەر ئەوەمان بۆ روون دەکەنەوە کە (محمد) هانی وەرگرتنی زانستی دەدا وپێی خۆشبووە، کە بەم بۆچوونەی جیاوازبووە لە زوربەی ریفۆرمخوازە ئاینییەکان، لە فەرموودەیەکیدا دەڵێت: ﴿مَن سَلَكَ طَرِيقاً يَلْتَمِسُ فيه عِلْماً سَهَّلَ الله لَهُ طَرِيقاً الى الجنة﴾.

هەربۆیە دەبینین فێرکردنی منداڵەکان لای موسوڵمانان هەر لە دەستکردنیانەوە بە قسە کردن دەست پێدەکات، ولە تەمەنی ٦ ساڵییەوە دەنێردرانە بەر خوێندن کە زۆر جار کچانیشی دەگرتەوە، خوێندن لەوخوێندنگانەدا کە یان سەر بە مزگەوتەکان بوون یان بەجیابوون بەخۆڕایی بووە یان بەرامبەر پارەیەکی زۆر کەم بووە کە هەموو کەس توانیویتی[١٠٣]، منداڵان فێری قورئان وخوێندنەوەی

---

[١٠٣] قوتابخانەکان و پەیمانگاکان دوای نیوەی دووەمی سەدەی پێنجەمی کۆچی بە تەواوەتی زیادیان کرد، تەنانەت (ئیبن جوبەیر) تەنها لەلایەکی رۆژهەڵاتی شاری بەغدایا ٣٠ قوتابخانە دەژمێرێت، هەر لەو کاتەدا لە شاری دیمەشقیش نزیکەی ٣٠ قوتابخانە هەبووە، لەگەڵ قوتابخانەیەکی فێربوونی هەندەسە و ٣ قوتابخانەی فێربوونی پزیشکی، (الحکم بن عبدالرحمن الناصر) هەرخۆی لە ئەندەلوس ئەم قوتابخانانەی دروستکرد بۆ فێرکردنی منداڵە هەژارەکان: ٧ی گەورە لە (قورتوبە)، ١٧ی گەورە لە (غەرناتە)، و ١٢٠ قوتابخانەی بچووکی تر لەهەموو شوێنەکانی تری ئەندەلوسدا، کە کار گەیشتە رادەیەك کە لە ئەندەلوسدا وەك دەڵێن نەخوێندەوار نەمابوو و هەموویان خوێندنەوە و نووسینیان دەزانی، هەروەها (وستنفیلد) دەڵێت: لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا ٣٧ ئەکادیمیای زانستی هەبووە (هەروەك زانکۆی ئەمڕۆمان) کە مەبەستی سەرەکییان فێرکردنی زانست بووە، لەوانە (النظامیة) و (المستنصریة) لە بەغدا و (النظامیة) لە نەیسابور و (الغزالیة) لە دیمەشق و (الصلاحیة) لە قودس و (الأزهر) لە قاهیرە و غەیری ئەمانیش، نووسەری ئینگلیزی (ئیچ جی ویلز) دەڵێت: زانکۆکانی بەسرە و کوفە و بەغدا و شارەکانی تر رووناکییان بە هەموو جیهاندا بڵاودەکردەوە، و قوتابیان لە رۆژهەڵات و رۆژئاواوە بۆیان دەچوون، زۆرێك لە قوتابیانی زانست لە (قورتوبە) لە مەسیحییەکان بوون، فەلسەفەی موسوڵمانان لەرێی ئەندەلوسەوە

ولەبەرکردنی وئەحکامەکانی ئاین وچیرۆك ونووسین دەکران، هەروەها فێری تیربازی ومەلە کردنیش دەکران، ئەوەی خوێندنەوە ونووسین وئەمانەی بزانیایە پێی دەووترا مرۆڤی کامڵ وپایەیەکی بەرزی هەبووە لەلایان.

زانا وشاعیرەکان پلە وپایەیەکی بەرزیان هەبووە لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا، بۆیە خەڵکی پێیان خۆشبووە کە منداڵەکانیان بە زانستەوە سەرقاڵ بن، ئەوانەی بیانویستایە بەردەوام دەبوون لە خوێندندا وفێری پرۆگرامە سەرەکییەکانی ئاین دەکران لە: نەحو ورەوانبێژی وزانستەکانی تری زمان و وێژە ومەنتیق لەگەڵ بیرکاری وفەلەکیشدا، خوێندنی سەرەتایی مەبەست پێی رێککردنەوەی رەوشت وهەڵس وکەوت بووە، وخوێندنی بەرزتریش (دواناوەندی) مەبەست پێی دەست خستنی زانست بووە، کە لە دواییدا قوتابخانەکان خرانەژێر چاودێری راستەوخۆی حکومەت وخەرجییان بۆ دابین دەکرد، خوێندن لە قوتابخانە حکومییەکاندا بەبێ بەرامبەر بووە ومامۆستایان وقوتابیان مووچە وخەرجییان لە حکومەتەوە یان لە پارەی ئەوقافەوە وەردەگرت، زۆرجار قوتابیان بۆ وەرگرتنی زانست بە شارە بەناوبانگەکانی وەك (مەککە، وبەغدا، ودیمەشق، وقاهیرە)دا دەگەڕان، هەر کەسێك کە بە هەر شارێکی وڵاتی ئیسلامدا بگەڕایەوە گومانی نەبوو لەوەی کە لەهەر سەعاتێکدا بچێت بۆ مزگەوتی گەورەی شارەکە ئەوا گوێی لە موحازەرەیەك دەبوو.

---

گەیشتە ئەوروپا و لە زانکۆکانی (پاریس) و (ئۆکسفۆرد) و (سەرووی ئیتالیا)دا دەرکەوتن و کاریگەرییەکەی گەورەیان کردە سەر رێرەوی بیری ئەوروپی. (بڕوانە: المدخل في الحضارة العربية) لا ١٦٧.




موســــوڵمانان لـــــەرێی ڕۆژهەلاتـــەوە (دوای فـــەتحی شاری سەمەرقەند لە سەدەی یەکەمی کۆچیدا) فێری دروست کردنی هەویرێك بوون لە کەتان وڕووەکی ریشاڵدار، کە پاشان ووشکیان دەکردەوە وپارچەی باریکی پان وتەنکیان لێدروست دەکـــرد، ئـــیتر لێـــرەوە پیشەســازی دروســت کردنــی کاغەز هات ولەبری پێستەی ئاژەڵ بۆ نووسین بەکاردەهاتن، یەکەم کارگەی دروست کردنی کاغەز لە وولاتانی ئیسلامیدا لە ساڵی (٧٩٤ز) لە شاری بەغدا لەسەر دەستی (الفضل بن یحیی) وەزیری (هارون الرشید) کرایەوە، موسوڵمانان ئەم پیشەسازییەیان گواستەوە بۆ ئیسپانیا ودورگەی (صقلیة)، ولێرەوە گوێزرایەوە بۆ ئیتاڵیا وفەرەنسا کە پێشتر نەناسرابوو لە ئەوروپادا، دەبینین ساڵی (٨٠٠ز) کاغەز لە میسر بەکارهاتووە، وساڵی (٩٥٠ز) لە ئیسپانیادا، پاشان ساڵی (١١٠٠ز) گەیشتە (قوستەنتینیە) وساڵی (١١٠٢) لە صقلیە پەیدابوو، دوایی ساڵی (١١٥٤ز) لە (ئیتاڵیا)دا، وساڵی (١٢٢٨ز) لە (ئەڵمانیا)، ودواییش لە (١٣٠٩ز) لە (ئینگلتەرا)دا پەیدابوو، ئەم داهێنراوە گرنگە دانانی کتێبی ئاسانکرد لەهەر شوێنێك کە پێی گەیشت، (الیعقوبی) دەڵێت لە سەردەمی ئەودا (٨٩١ز) لە بەغدا زیاد لە (١٠٠) دوکانی کتێب فرۆشتن

هەبووە، کە دوکانەکانیان نەك تەنها بۆ فرۆشتن بەڵکوبۆ لەبەر گرتنـەوەی کتێبــەکان ونەخشــاندنیان بــەکاردەهاتن، چــەندین کەســی خولیــای کۆکردنـەوەی کتێبـەکان پەیدابوون کـە داوای نرخـی بـەرزیان دەکـرد لـە بەرامبەریاندا، لە زوربـەی مزگەوتەکانیشـدا کتێبخانـە هـەبووە، لـە هـەموو شارەکانیشدا کتێبخانەی گشـتی هـەبوون کـە ژمارەیـەکی ئێجگـار زۆر لـە کتێبی لەخۆگرتووە وکراوە بووە لەبەردەم قوتابیانی زانسـت وهەمووانـدا، تـەنها پێرسـتی ئـەو کتێبانـەی کەلـە کتێبخانـەی گشـتی شـاری (مـەرو)دا هەبووە لە ١٠ بەرگ پێکهاتووە، کتێبخانەکانی موسڵ وبەسرە کراوەبـوون بۆ وەرگرتنی کاغەز ویارمەتی بۆ فێرخوازان وزانست دۆستان.

(یـاقوت الحمـوي) بـۆ دانـانی کتێبـە جوگرافییەکـەی (معجـم البلـدان) مــاوەی ٣ســاڵ زانیــاری کــۆدەکردەوە لــە کتێبخانــەکانی (مــەرو) و(خــەواریزم)دا، کـاتێکیش کــە مەغۆلــەکان بەغـدایان کـاول کـرد ٣٦ کتێبخانــەی گشــتی تێـدابووە لەگـەڵ ژمارەیـەکی حیسـاب نـەکراو لـە کتێبخانـەی تـر، لـە کتێبخانـەی خەلیفـەکانیش لـە قـاهیرە لـە سـەردەمی (الحاکم بأمر الله)ی فاتیمیدا زیاتر لە ١٠٠٠٠٠ کتێب هەبووە ولـە سـەردەمی (المستنصر)دا گەیشتە ٢٠٠٠٠٠ کتێب کە بە خۆڕایی دەدران بە ئیسـتیعارە بـە هەرکەسـێك ئـارەزووی لێبکردایـە، کاتێـك کـە کاربەدەسـتێکی شـاری (بوخارا) داوای لە پزیشکێکی بەناوبانگ کرد بۆ ئەوەی بچێتە لای ئەو لـەو شارە رازی نـەبوو لەبەرئـەوەی ووتـی مـن پێویسـتم بـە ٤٠٠ ووشـتر هەیـە تەنها بۆ ئەوەی کتێبەکانمی پێبگوێزمەوە!!

کاتێکیش (الواقدي) مێژوونووس مرد لەدوای خۆی ٦٠٠ سندوقی پڕ لە کتێبی بەجێهێشت کـە هـەر سـندوقێکیان پێویسـتی بـە ٢ کـەس بـوو بـۆ

گواستنەوەیان، تەنانەت لەلای هەندێك لە كاربەدەستەكانی وەك (الصاحب بن عباد) لە (ئیشبیلیە) ئەوەندە كتێب هەبووە بەقەدەر هەرچی كتێب هەیە لە هەموو كتێبخانەكانی ئەورووپادا لەوكاتەدا !.

زانست ونووسین لە سەدەكانی هەشتەم ونۆیەم ودەیەم ویانزەیەم لە وولاتانی ئیسلامیدا گەیشتە لوتكە، ژمارەی زانایان لەو دەیان هەزار مزگەوتەی بەدرێژایی شارەكانی نێوان (قورتوبە لە ئەندەلوس) تا (سەمەرقەند لە ناوەڕاستی ئاسیا)دا لە ژمارەی پایەكانی مزگەوتەكان كەمتر نەبووە، كە هۆڵەكانی ئەم مزگەوتانە بەردەوام دەنگیاندەدایەوە بە زانست ورەوانبێژییان، لە مزگەوتی (الأزهر)یشدا لە قاهیرە یەكەم زانكۆ لە هەموو جیهاندا دروستكرا كە قوتابیانی بۆ دەهاتن لە هەموو شوێنێكی جیهانی ئیسلامییەوە.

رێگاوبانەكانیش خاڵی نەبوون لە جوگرافیزانەكان ومێژوونووسەكان وزانایان كە بە بەردەوامی هاتوچۆیان پیادا دەكرد وخەریكی وەرگرتنی زانست وحیكمەت بوون.

كۆڕی كاربەدەستانیش دەنگی دەدایەوە بە هۆنراوەكانی شاعیران وگفتوگۆكانی زانایان وفەیلەسوفەكان، هیچ كەسێكیش نەیدەوێرا پارە كۆبكاتەوە ئەگەر بێتو بەشێكی سەرف نەكردایە لە خزمەتی زانست ووێژە وهونەرەكاندا، سنگفراوانی ئەم فاتیحانە بەرامبەر ئەو نەتەوانەی كە بەسەریاندا سەركەوتن گەیشتە رادەیەك كە زوربەی هەرە زۆری شاعیران وزانایان وفەیلەسوفەكان لە نەتەوەكانی تردا پەیدابوون، كە هەموویان خزمەتێكی هەرە گەورەیان كرد بە زمانی عەرەبی وكردیانە دەوڵەمەندترین زمانەكانی دونیا لە زانستەكان وئەدەبدا، لەگەڵ ئەوەشدا

که عەرەبەکان خۆیان بە ژمارە زۆر کەم بوون لە نێوان ئەم فەیلەسوف وزانا وشاعیرانەدا.

موسوڵمانان بەو فەرهەنگ ومەوسوعانەی کە دایاننا زوربەی زانست و ووێژە پەرت وبڵاوەکانی جیهانیان کۆکردەوە وگەورەترین جێدەستیان هەبوو لە پاراستنیاندا، کە ئەگەر ئەمان نەبوونایە جیهان ئەم شاکارانەی لەدەستدەدا.

زۆرترین کەسانێك کە ناوەکانیان تا ئەمڕۆ زیندووە مێژوونووسە موسوڵمانەکانن کە بە نوسراوەکانیان مێژووی کۆنی وەك میسرییە فیرعەونییەکان ومێژووی ئیسلامیان بۆ پاراستین، لەوانە (محمد بن إسحاق) کە ساڵی (٧٦٧ن) مردووە وژیاننامەی پێغەمبەری نوسیوەتەوە کە دوای ئەم (إبن هشام– ٧٦٣ن) پیایدا چۆتەوە وبۆی زیادکردووە، وکۆنترین کتێبێکی ژیاننامەی خاوەن پایەیە کە گەشتۆتە دەستمان، پاشان زانایان کتێبی کۆکەرەوە ومەوسوعییان نوسیوە دەربارەی رووداوەکان، هەروەها ژیاننامەی پیاوچاکان وفەیلەسوفەکان ووەزیرەکان وپاساییەکان وپزیشکان وخۆشنووسەکان وکاربەدەستان وعاشقان وهەواداران وزانایانیان کۆکردۆتەوە، (ئیبن قوتەیبە) یەکێکە لەو زانا موسوڵمانە زۆرانەی کە هەوڵیداوە مێژووی هەموو جیهان کۆبکاتەوە وکەسێکی ئازا وچاونەترس بووە لە نووسینەکانیدا.

(محمد بن النديم) لە ساڵی (٩٨٧ن) کتێبی (فهرست العلوم)ی دەرکردووە کە لەم کتێبەدا ناوی هەموو کتێبێکی دەرکراو بە عەرەبی تێدا کۆکردۆتەوە لەوانەی کە دانراون یان وەرگێڕدراون لە هەموو لقەکانی زانستدا لەگەڵ ژیاننامەیەکی رەخنەگرانەی خاوەنەکانیان، ئەوەندە بەسە

بۆ دەوڵەمەندی ئەدەب ونووسینی ئیسلامی کە بزانین ئەو کتێبانەی کە ئەم ناوی بردوون یەك لەسەر هەزاریان لەمڕۆدا نەماونەتەوە !.

هاوشێوەی ئەم (أبوجعفر محمد بن جرير الطبري) (٨٣٨-٩٢٣ن) بووکە بە ڕەچەڵەك فارسە وخەڵکی (تەبەرستان)ە لە خوارووی دەریای قەزوین، کە چەندین ساڵ بەدوای زانست لە ناوچەکانی وولاتی عەرەب وشام ومیسردا گەڕاوە، و٤٠ ساڵی تەمەنی تەرخان کرد بۆ نووسینی کتێبێکی مێژوویی گشتی کە ناوینا (تأريخ الأمم والملوك)، وهەواڵەکانی نەتەوەکانی گێڕاوەتەوە هەر لە سەرەتای جیهانەوە تا ساڵی (٩١٣ن)، ئەو بەشەی لەمڕۆدا لەو کتێبە ماوە لە ١٥ بەرگی گەورەدایە ومێژوو نووسەکان دەڵێن ئەوەی لێی وونبووە دەکاتە ١٠ ئەوەندەی ئەم بەشەی کە ماوە !.

(المسعودی) مێژوونووسیش کە گەورەترین مێژوونووسە دوای (الطبري) دەڵێت (الطبري) گەورەترین کەس بووە پێش ئەم، (المسعودي) بەرەچەڵەك عەرەبە وبە ناوچەکانی سوریا وفەلەستین وووڵاتی عەرەب وزنجبار وفارس وناوەڕاستی ئاسیا وهیندستان وسیلاندا گەڕاوە ودەڵێت کە گەشتۆتە دەریای (چین)یش، بەرهەمی ئەم گەشتانەی لە مەوسوعەیەکی ٣٠ بەرگیدا کۆکردۆتەوە، کە تەنانەت زانایانی ئیسلامیش (کە بە چڕوپڕیی مادده وزانیارییەکانیان ناسراون) زۆر بە درێژیان زانیوە ولە توانایاندا نەبووە، کە پاشان زۆر کورتی کردۆتەوە بۆ ئەوکتێبەی کە ئەمڕۆ هەیە وخاوەنی ناونیشانێکی سەیرە (مروج الذهب ومعادن الجوهر)، کە تێیدا لە بارودۆخی وولاتانی کۆلیوەتەوە لە چینەوە تا فەڕەنسا لە لایەنەکانی: جوگرافیایی ورووەکی وئاژەڵناسی ومێژووییەوە، هەروەها

عـادات ودينـەكان وزانسـتەكان ووێـژەكانی دانیشـتوانی لێكداوەتـەوە، لـە كۆتایی ژیانیدا بۆچوونەكانی خۆی دەربارەی زانست ومێژوو وفەلسەفە لـە كتێبەكانی (الإستذكار لما مرّ في سـائر الأعمـار) و(كتـاب ذخـائر العلـوم)دا كۆكردۆتـــەوە، كـــە تێیـــدا ئامـــاژەی داوە بـــە پەرەســـەندن (یـــان گەشەســـەندن)ی زینـــدەوەرەكان لـــە نازینـــدووەكان وئاژەڵـــەكان لـــە رووەكـەكان وئـادەمیزادیش لـە ئاژەڵەكانـەوە[١٠٤]، هـەر ئـەم بۆچـوونانەی بوون كە وای لێكرد ئەو شاری بەغدایەی كە تێیـدا گـەورەبوو بـەجێبهێڵێت وسەرەنجام لە شاری قاهیرە دوای ١٠ساڵ بمرێت.



سەبارەت بە زانست لای موسوڵمانان[١٠٥] لەو سەدە زێڕینانەی مێژووی ئیسلامدا، موسـوڵمانان هـەموو هەوڵێكیانـدا بـۆ پەرەپێـدانی زانسـت، كـە

[١٠٤] لەگەڵ باوەڕمان بە پووچەڵیی بیردۆزی گەشەسەندن (نظرية التطور) كە رۆژئاوا دەیدەنـە پاڵ (چارلس داروین)، بەڵام بڕوانە ئەوەی كـە زانایـانی موسـوڵمان ئاماژەیـان پێیداوە پـێش داروین بە نزیكەی (١٠٠٠) ساڵ كە بۆچوونێكی ئاشكرای تێدایە لەوبارەوە (وەرگێڕ)!!.

[١٠٥] پێویستە لەسەر هەموو لێكۆڵەرەوەیەك لـە مێـژووی زانسـت لای موسـوڵمانان كـە كتێبـی جۆرج سارتۆن (George Sarton) كە ناوی (المدخل في تأريخ العلوم)ە بەرز بنرخێنێت، چونكە یەكێكە لە كارە هەرە گرنگەكانی مێـژووی لێكۆڵینـەوەی زانسـتی، كـە تێیـدا كـارێكی گرنگی كردووە لە پەردەلادان لەسەر دەوڵەمەندیی رۆشنبیری ئیسلامی و فراوانی بوارەكانیدا.

هێشــــتنەوەی قوتابخانـــە زانســـتییەکانی گاورەکـــان وفارســـییەکان وصـابیئییەکان بـەبێ زیـان، وئەوانـەی لـە (ئیسـکەندەریە) و(بـەیروت) و(ئەنطاکیە) و(حەڕان) و(نەصیبین) (جندیسـابور)دا هـەبوون گـەورەترین بەڵگەیە لەسـەر بۆچوونە پێشـکەوتن خوازەکـەیان، کـە ئـەم قوتابخانانـە نووسـراوە فەلسـەفی وزانسـتییەکانیان پـارێزران وزوربـەیان بـە زمـانی سریانی بوون کە پاشان وەرگێڕدرانە سەر زمانی عەرەبی.

فەرمانڕەوایانی ئومەوی وعەبباسی پشتگیری تـەواوی ئـەم جووڵانـەوە زانستییەیان کرد، ئـەوەبو (المنصـور) و(المـأمون) و(المتوکـل) نوێنـەریان نارد بۆ لای ئیمپراتۆری (قوستەنتینیە) وشارە یۆنانییەکان بۆ ئـەوەی کـە نوسـراوە ئیغریقییـەکانی بوارەکـانی بیرکـاری وفەلـەك وپزیشـکییان بـۆ بنێرن، بەم شێوەیە زۆرێك لە نوسراوەکان گەیشتن، خەلیفە (المأمون) لـە شـاری بەغـدا لـە سـاڵی (٨٣٠ز) خـانووی حیکمـەت (بیـت الحکمـة)ی دامەزراند، کە بریتـی بوولـە کۆمەڵگەیـەکی زانسـتی وبینگەیـەکی فەلـەکی وکتێبخانەیەکی گشتی کە لـە دروسـت کردنیـدا زیـاتر لـە ٢٠٠.٠٠٠ دینـاری ئاڵتونی سەرفکرد، لەم خـانووەدا کۆمـەڵێك وەرگێـڕی دانـا وموووچـەی بـۆ بڕینــەوە، مێـژوونووس (ئـیبن خەلـدون) دەڵێـت: ئیسـلام وموسـوڵمانان قەرزداری ئەم پەیمانگە زانستییەن بـۆ ئـەو رابوونـە زانسـتییە گـەورەیـەی کە روویدا، ئێمەش دەڵێین لـە ئاکامیـدا وەك راپـەڕینی ئـەوروپا بـوو دوای سەدەکانی ناوەڕاست.

بـەهۆی ئـەو وەرگێڕانانـەی لـەم پەیمانگەیـەدا ئەنجامـدران زۆرێـك لـە نوسراوە یۆنانییە بە نرخەکان لە فەوتان رزگاریان بوو، وەك دانراوەکـانی: (جـالینۆس)، و(ئەرسـتۆ) و(ئـەفلاتون) و(ئـەبوقرات) و(دیوسـکۆریدس)

و(بەتلیمۆس)، (المأمون) زۆر جاری بە کێشی کتێبەکە ئالتونی بە پاداشت دەدایە وەرگێڕەکەی، تا ساڵی (٨٥٠ز) زوربەی کتێبە یۆنانییە کۆنەکان لەبوارەکانی بیرکاری وفەلەك وپزیشکی وفەلسەفەدا وەرگێڕدرانە سەر زمانی عەرەبی، موسوڵمانان ناوی (المجسطي)یان نا لە کتێبەکەی (بەتلیمۆس) لە زانستی فەلەکدا، بەهۆی ئەم وەرگێڕانە عەرەبییانەوە بوو کە بۆچوونەکانی (أبولونیوس البرجاوي) و(كتاب الحيل لهيرو الإسكندري) وکتێبەکانی (فیلون البیزنطي) لە فەوتان پارێزران، گواستنەوەی زانستەکان وفەلسەفە لە میسر وهیندستان وبابل و وولاتی یۆنان وبیزەنتەوە بۆ لای موسوڵمانان وپاشانیش لەمانەوە بۆ ئەوروپا وئەمریکا بەردەوام بوو، **کە من بڕوام وایە ئەم گواستنەوە وپەرەپێدانە بریتییە لە مەزنترین وڕێزدارترین ڕووداوەکانی مێژووی جیهان.**

موسوڵمانان زانستەکانی یۆنان وهیندییەکانیان وەرگرت وداهێنانیان تێداکرد، لە ساڵی (٧٧٣ز)دا خەلیفە (المنصور)ی عەبباسی فەرمانی کرد بە وەرگێڕانی کتێبی (السدهنتا) کە بریتییە لە چەند نامەیەك لە زانستی فەلەکدا کە مێژووەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ (٤٢٥ پێش زایین)، لە ساڵی (٨١٣ز)دا (خەواریزمی) ژمارە هیندییەکانی[١٠٦] بەکارهێنا لە خشتە بیرکارییەکانیدا، لە ساڵی (٨٢٥ز)دا کتێبێکی بڵاوکردەوە کە لە ڕۆژئاوا بە (Algoritmi de numero Indorum) ناسراوە (واتە خەواریزمی لە ژمارە هیندییەکانەوە)، ئەوەندەی نەخایاند کە ناوی لۆگاریتم (Algorithm) کە لە ناوی ئەم زانایەوە وەرگیراوە بوو بە ناونیشانی ڕێگایەکی شیکاریی بیرکاریانەی ناسراو.

---

[١٠٦] لە ڕۆژئاوا ئەم ژمارانە (0، 1، 2، 3، 4، 5، 6، 7، 8، 9 ) بە ژمارە عەرەبییەکان ناسراون چونکە لە موسوڵمانانەوە وەریانگرتووە (بگەڕێرەوە بۆ بەشەکانی پێشتر).

له ساڵی (٩٧٦ن) (محمد بن أحمد) له (مفاتيح العلوم)دا ووتـی: ئەگـەر له کرداره بیرکارییەکاندا هێمایەك نەبوو کە تەعبیر له خانەیەك بکات ئـەوا لەبری بازنەیەکی بچکۆله دادەنرێت بـۆ ئـەوەی ریزەکـان رێکبێـت، دوایـی موسوڵمانان ئەم بازنەیەیان ناونـا (صـفر) واتـه (خـاڵی) ولەمـەوە ووشـەی ئینگلیـزی (Cipher) داتاشـرا، کـه دوایـی زانـا لاتینییـەکان دەسـتکاری ووشـــەی ســـفریان کـــرد وبووبـــه (Sifr) ودوایـــی (Zephyrum) ولـــه کۆتاییدا کورتکرایەوە بۆ (Zero).

زانستی جەبر (Algebra) قەرزاری ناوەکەیەتی بۆ موسوڵمانان، کـه ناودارترین کەسایەتی لەم بوارەدا (محمد بن موسى الخوارزمي) بوو کە لـه ناوچەی (خەواریزم) له رۆژهەڵاتی دەریای قەزوین لەدایکبووە، ئەم زانایـه کتێبی زۆر بەنرخی له ٥ زانسـتدا دانـاوە: دەربـارەی ژمـارە هیندییـەکان، چـەند کتێبێکـی فەلـەکی کـه بـۆ چـەندین سـەدە کـاری پێـدەکرا هـەر لـه (شنغان) له چینەوە بۆ (قورتوبه) له ئیسپانیا، هـەر ئـەم بووکـه کـۆنترین خشـتەکانی حیسـابی سێگۆشـەکاری دانـاوە، لەگـەڵ (٣٩) زانـای تـردا دەستیان دایە دانانی مەوسوعەیەکی جوگرافیـایی بـۆ خەلیفـه (المـأمون)، لـه کتێبەکەیـدا (الجـبر والمقابلـة) چـەند شـیکارێکی هەندەسـییانەی بـۆ هاوکێشـەکانی پلـه ٢ دانـاوە، کـه (جـیراد الكريمونـاني) لـه سـەدەی دوانزەیەمـدا وەرگێـڕاوە وتـا سـەدەی شـانزەیەمیش لـه زانکۆکـانی ئـەوروپادا دەخوێنـدرا، رۆژئـاوا لەمـەوە ووشـەی جـەبریان وەرگرتـووە وکردوویانـه بـەناوی ئـەو زانسـته بەناوبانگـە، هـەروەها (ثابـت بـن قـرة) بەناوبانگ بوو بە نوسراوەکانی لەبواری فەلەك وپزیشکیدا ویەکێك بـوو لـه گـەورەترین زانایـانی هەندەسـه، (أبوعبـدالله البتـاني)یـش زانسـتی

سێگۆشەکاری گەیاندە لوتکە بەوەی کە سێگۆشەکانی گۆڕییەوە بە چوارگۆشە لە شیکاری بابەتەکاندا، وهەر ئەمیش بووە کە ڕێژەکانی حیسابی سێگۆشەکاری داڕشت بەو شێوەیەی کە ئەمڕۆ بەکاردێت.

(المأمون) کۆمەڵێك لە فەلەکییەکانی بەکارهێنا بۆ تێڕوانین ولێکۆڵینەوەی تەنە ئاسمانییەکان وتۆمارکردنی ئاکامەکانیان، کە خەریکی زەوییان کرد بە بناغەیەك بۆ پێوانەکان وکارەکانیان لەسەر پلەی زەوی بەهۆی تێڕوانینی خۆر لە شارەکانی (تەدمور) و(سنجار) لە یەك کاتدا، لەمەوە توانییان پلەکە بە ٥٦ میل ودوو لەسەر سێی میلێك دیاری بکەن کە تەنیا بە نیو میل لە پێوانەی ئەمڕۆمان زیاترە، هەروەها چێوەی زەویشیان دەرهێنا، ئەم فەلەکییانە هیچ شتێکیان وەرنەدەگرت ئەگەر بە تاقیکردنەوە نەسەلمایە ولە توێژینەوەکانیشیاندا لەسەر بنەمایەکی زانستییانەی ڕاست دەڕۆیشتن.

یەکێکیان کە ناوی (الفرغاني) بووە (خەڵکی شاری فەرغانە بووە لەودیو ڕوباری جەیحون) کتێبێکی فەلەکی نووسیوە کە تا ماوەی ٧٠٠ ساڵ لە ئەورووپا وڕۆژئاوای ئاسیادا وەك سەرچاوەیەکی زانستی پشتی پێدەبەسترا، لەم بەناوبانگتر (بەتتانی) بووە کە ماوەی ٤١ ساڵ خەریکی تێڕوانینی فەلەکی بووە و بەوردیی وفراوانی ئاسۆ زانستییەکەی ناسراوە، لەم تێڕوانینانەیدا گەیشتە زۆرێك لە پێوانە کە بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر وعەجیب زۆر نزیکە لە پێوانە ڕاستەکانەوە لەمڕۆماندا، هەروەها (أبوالوفا) کە لە بەغدا کاری کردووە هەروەك (سادلوSadilot) دەڵێت توانی لادانی سێیەمی مانگ بدۆزێتەوە پێش زانا (تیکۆ براهی Tycho Brahe) بە ٦٠٠ ساڵ.

بۆ فەلەکییە موسوڵمانەکان چەندین ئامێری گرانبەها دروستکران کە تەنها (الإسطرلاب) نەبوون، بەڵکو چەندین ئامێری پێوانی گۆشەکان کە نیوە تیرەیان دەگەیشتە ۳۰پێ، هەروەها ئامێری شەشپاڵو کە نیوەتیرەکەی ۸۰پێ بووە، هەروەها موسوڵمانان (الإسطرلاب)یان دروستکرد وچەندین چاکسازییان تێداکرد، کە لەمانەوە گەیشت بە ئەوروپا لە سەدەی دەیەمی زاییندا وتا سەدەی حەڤدەیەمیش بەکارهێنانی باوبووە لەلایەن کەشتییەوانەکانەوە.

لە شاری قاهیرە (الحاکم بأمر الله)ی فاتیمی (دار الحکمة)ی دامەزراند کە پەیمانگایەکی فێرکردنی ئاین وفەلەك وزانستی پزیشکی بوو، وهەروەها بینگەیەکی فەلەکیشی بۆ دروستکرد ویارمەتی (علی بن یونس)ی دا بۆ ئەوەی بڕوانێتە ئاسمان، ئەوەبوو ماوەی ۱۷ ساڵ تێڕوانین ولێکۆڵینەوەی ئەنجامدا تاوەکو توانی (الزیج الحاکمي) بەناوبانگ دابنێت، کە جووڵەی هەسارە ونەستێرەکان وکاتەکانیانی بە وردیی روونکردۆتەوە لەگەڵ چەندین پێوانە وخشتەی فەلەکیشدا[۱۰۷].

بەهاوشێوەی گرنگیدانیان بە ئاسمان زانا موسوڵمانەکان گرنگییان بە زەویش داوە، یەکەم وەسفی وڵاتی چینیان کردووە پێش گەڕۆکی ئیتاڵی (مارکۆ پۆلۆ) بە ٤٥٠ ساڵ، یەکێك لەوانە (إبن خرذابة) بووە کە وەسفی هیندستان وسیلان ودورگەکانی هیندی رۆژهەڵات و وڵاتی چینی کردووە، لە نوسینەکانیدا پشتی بەو گەشتانە بەستووە کە بۆ ئەو

---

[۱۰۷] با خوێنەری بەڕێز ئاگادار بێت کە ۲ پەیمانگای زانستی جیاواز هەبوون لە جیهانی ئیسلامیدا: (بیت الحکمة) کە لە بەغدا لەلایەن (المأمون)ی عەبباسیەوە دروستکرا، و هەروەها (دار الحکمة) کە لەلایەن (الحاکم بأمرالله)ی فاتیمیەوە دروستکرا لە (قاهیرە).

ناوچانەی کردووە، هەروەها (إبن حوقل) وەسفی وولاتی هیند وئەفریقای کردووە، هەروەها (أحمد الیعقوبي) کە خەڵکی ئێرانە لە ساڵی (٨٩١ز)دا کتێبی (البلدان)ی داناوە کە وەسفی وولاتە ئیسلامییەکان و زۆرێك لە وولاتە بێگانەکانیشی بەشێوەیەك کردووە کە جێگای باوەڕپێکردنە، هەروەها (محمد المقدسي) هەموو وولاتە ئیسلامییەکان گەڕاوە لەگەڵ ئەندەلوسدا کە لەم گەشتەیدا تووشی چەندین ناڕەحەتی بووە، وپاشان ساڵی (٩٨٥ز) کتێبەکەی (أحسن التقاسیم فى معرفە الأقالیم)ی نوسیوە کە بریتین لە مەزنترین کتێبی جوگرافیایی دەربارەی هیندستان پێش کتێبەکەی (البیروني).

(أبوالریحان محمد بن أحمد البیروني) جوانترین نموونەی زانایەکی موسوڵمانە چونکە فەیلەسوف ومێژوونووس وگەڕۆك وجوگرافیناس وزمانەوان وبیرکاریزان وفەلەکی وشاعیر وسروشتزانیش بووە، چەندین کتێبی داهێنراوی هەیە لە هەر یەکێك لەم بوارانەدا، لەودیو دەریای (قەزوین) لەدایك بووە وکاربەدەستانی ئەو ناوچەیە پایە بەرزەکەیان ناسیوە ولەلای خۆیان دایانمەزراندووە، دوایی چووە لای (محمود الغزنوي) ولەگەڵیدا سەردانی هیندستانی کردووە وبەناوبانگترین زانای سەردەمی ئەو بووە، جارێکیان پیاوێك لای (محمود الغزنوي) وەسفی وولاتێکی بۆ کردووە لە باکور کە خۆر تێیدا بۆ ماوەی چەند مانگێك ئاوا نابێت، (محمود)یش بەلایەوە سەیر بوو وباوەڕی نەکرد وخەریك بوو لەو کابرایە تووڕەبێت وسەرزەنشتی بکات چونکە وای دەزانی گاڵتەی پێدەکات، لێرەدا بەیرونی هاتە پێشەوە وبە شێوەیەکی زانستییانە دیاردەکەی بۆ شەرح کرد کە پاشا قەناعەتی پێکرد، یەکەم کاری گرنگی

دانانی رۆژژمێرێك بوو لەسەر بنەمای شوێنەوار وبۆ جەژنەکانی فورس وشام ویۆنان وجولەکە وگاورەکان وصابیئییەکان وزەردەشتییەکان وعەرەب، گەورەترین دانراوەکانی بریتییە لە کتێبێك دەربارەی هیندستان کە سالّی (١٠٣٠ز) بلاّوی کردەوە کە مەوسوعەیەکی هەمەلایەنە دەربارەی ئەو ناوچانە.

هەروەها دەربارەی ژمارە هیندییەکان و(الإسطرلاب) وبازنەی بورجەکان نوسینی هەیە، زیجێکی بەناوبانگی بۆ سولّتان مەحمود نوسی، هیچ گومانێکی نەبووە لە خرێتی زەوی، وتێبینی ئەوەی کردووە کە هەموو شتەکان بەرەوچەقەکەی کێش دەکرێن، هەروەها وتوویەتی کە راستییە گەردوونییەکان دەتوانرێن راڤە بکرێن ئەگەر بێتو باوەڕمان وابێت کە زەوی رۆژی ١جار بە دەوری تەوەرەی خۆیدا دەسووڕێتەوە وهەروەها سالاّنەش ١جار بەدەوری خۆردا دەسووڕێتەوە، هەروەها وتوویەتی کە دۆلّی روباری (السند) لەوانەیە رۆژێك لە رۆژان بنکی دەریایەك بووبێت، کتێبێکی گەورەی دەربارەی بەردەکان نووسیوە کە وەسفی ژمارەیەکی زۆری لە بەرد وکانزاکان کردووە لە رووی سروشتی وهەروەها وەسفی نرخی بازرگانی وپزیشکییانی کردووە، وچڕیی هاوجۆری ١٨ جۆری لە بەردە بەنرخەکان دیاری کردووە، ئەو یاسایەی داناوە کە چڕیی هاوجۆری هەر تەنێك یەکسانە بەبڕی ئەو ئاوەی کە لایەدات، هەروەها گەیشتە رێگەیەك بۆ حیساب کردنی چەند جارەی ژمارەکان بەبێ ئەوەی کە هەستیت بەکردارە قورس ودرێژەکانی کۆکردنەوە ولێکدان، لە هەندەسەشدا چەندین شیکاری داناوە بۆ هەندێك بیردۆز کە دوایی بەناوی ئەمەوە ناونران، ئینسایکلۆپیدیایەکی داناوە

دەربارەی گەردوونزانی وئەستێرەگەری وزانستە بیرکارییەکان، شەرحی هۆکاری دەرچوونی ناوی کردووە لە سەرچاوە سروشتییەکان وبیرە ئیرتیوازییەکان بەهۆی بیردۆزی دەفرە ناچوونیەکەکانەوە، هەروەها مێژووی پاشا غەزنەوییەکانی نووسیوەتەوە لەگەڵ مێژووی ناوچەی خەواریزم، مێژوونووسە ڕۆژهەڵاتییەکان پێی دەڵێن (شێخ)، کە لەوانەیە مەبەستیان ئەوە بێت کە ئەم شێخ وگەورەی زانایانە.

زۆری دانراوەکان لەو نەوەیەی کە (ئیبن سینا) و(ئیبنولهەیسەم) و(فیردەوسی) تێیدا پەیدابوون بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو ماوەیەی دەکەوێتە نێوان کۆتایی سەدەی دەیەم وسەرەتای سەدەی یانزەیەم بریتییە لە سەردەمی زێڕینی ڕۆشنبیری ئیسلامی، وئەو کاتەیە کە فیکر وزانست لە سەدەکانی ناوەڕاستدا تێیدا گەیشتنە لوتکە.

زانا (إبن الهيثم)یش لە شاری بەسرە لەدایکبووە وبەناوبانگ بووە بە بلیمەتی لەبواری بیرکاریی وهەندەسەدا، گرنگترین دانراوەکانی بریتییە لە کتێبی (المناظر) لە ڕووناکیزانیدا کە بەرای من بریتییە لە مەزنترین دانراوە زانستییەکانی سەدەکانی ناوەڕاست کە شێوازی زانستییانەی بەکارهێناوە لە بیرکردنەوە وڕێبازەکەیدا، ئیبنولهەیسەم دەربارەی شکانەوەی ڕووناکی کاتێك بەناو ناوەندە ڕوونەکاندا دەڕوات وەك هەوا وئاودا کۆڵیویەتیەوە، زۆر نزیك بووەوە لە داهێنانی هاوێنە نزیککەرەوەکان، وکارەکانی کارێکی وایان کرد کە دوای زیاتر لە ٣٠٠ ساڵ (ڕۆجەر بیکۆن Roger Bacon) و(وینیلۆ Wenelo) وچەندین زانای تر بە پشتبەستن بە توێژینەوەکانی ئەم بتوانن کە ووردبین وتەلیسکۆپ دابێنن، ئەوەشی سەلماند کە بەهۆی شکانەوەی تیشکی

خۆر لە هەوادا ئێمە دەتوانین خۆر ببینین پاش ئەوەی کە دیسکەکەی بە ١٩ پلە لەژێر ئاسۆوە دیارنامێنێت، پەیوەندی نێوان قورسی وچڕیی بەرگەهەوای لێکداوەتەوە وهەروەها یاسای بیرکاری ئالۆزی بەکارهێناوە بۆ لێکۆڵینەوەی شکانەوەی رووناکی لە ئاوێنە گۆییەکاندا، یەکەم ئاماژەی داوە بە تێڕوانینی خۆر لە کونێکی بچووکەوە لەناو ژوورێکی تاریکدا کە ئەمە یەکەم ئاماژەیە بۆ ژووری تاریکی تەنها کون کە لە وێنەگرتنی فۆتۆگرافیدا بەکاردێت.

هەرچەندێك دەربارەی (ئیبنولهەیسەم) بلێین زیادڕەوی ناکەین لە کاریگەرییە گەورەکەی لەسەر زانستە ئەوروپییەکان، چونکە ئەگەر ئەم نەبوایە ئەوا کەس ناوی (رۆجەر بیکۆن)ی نەدەبیست، هەر (رۆجەر بیکۆن) خۆی باسی پێشدەستی ئەم دەکات بەسەریدا وهیچ هەنگاوێك نانێت لە دانراوەکەیدا لەسەر رووناکیزانی بەناوی (Opus Maius) بەبێ ئەوەی کە ئاماژە نەدات بە ئیبنولهەیسەم و ووتەکانی نەهێنێت ولە بەشی شەشەمیدا بەتەواوەتی پشتی بەستووە بە دۆزینەوەکانی ئەم زانایەی کە کوڕی (قاهیرە)یە، لێکۆڵینەوە ئەوروپییەکان بۆ رووناکی تا سەردەمە دواییەکانی کیپلەر ولیۆناردۆ پشتیان بە لێکۆڵینەوەکانی ئیبنولهەیسەم دەبەست.

دەتوانین بلێین موسوڵمانان داهێنەری زانستی کیمیان وەك زانستێکی سەربەخۆ، ئەویش لەبەرئەوەیە کە موسوڵمانان تێبینی وورد وتاقیکردنەوەی زانستی وگرنگیدانیان بە تێڕوانین هێنایە کایەوە، ژمارەیەکی ناکۆتایان لە ماددەکان بەشێوەیەکی کیمیایی شیکردەوە، ودانراویان دانا لەسەر بەردەکان، وجیاوازییان کردووە لە نێوان ترشەکان

وتفتەکاندا، هەروەها ئەو ماددانەشیان پشکنیوە کە ئارەزووی هەریەکێك لەم دووانەیان هەیە، لە سەدان گیراوەی پزیشکییان کۆڵیوەتەوە وسەدانی تریشیان دروستکردووە، ئەمەش بەهۆی رێگا زانستییەکانیان لەم بوارەدا کە دەتوانین بڵێین تەنها رێگایەك بووە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا کە رێباز وهۆکارە زانستییە راستەکانی تێدا بەکارهاتووە، توانییان کە سەدان دۆزینەوە ئەنجام بدەن وگەیشتنە زانستی کیمیای راست، دەتوانین بڵێین کە هەموو ئەو زانا موسوڵمانانەی بە زانستەکانی سروشتەوە سەرقاڵ بوون هەموویان کۆك بوون لەسەر ئەوەی کە کانزاکان هەموویان لە کۆتاییدا یەك بنچینەیان هەیە[108]، ولەبەر ئەمەیە کە لەوانەیە بتوانرێت یەکێکیان بگۆڕدرێت بۆ ئەوی تر.

بەناوبانگترین زانایانی کیمیا لەلای موسوڵمانان (جابیری کوڕی حەییان) بووە کە لای ئەوروپییەکان بە جیبیر (Geber) ناسراوە، جابیر کوڕی دەرمانسازێکی کوفە بووە وبە زانستی پزیشکییەوە خەریك بووە، بەڵام زوربەی کاتەکانی لەگەڵ لوولە ودەفری تاقیکردنەوەکاندا بەسەر دەبرد، مێژوونووسەکان زیاد لە ١٠٠ نوسراوی دەدەنە پاڵ، کە زۆرێك لەم دانراوانە وەرگێڕدران بۆ زمانی لاتینی وبەهۆی ئەم کتێبانەوە بوو کە زانستی کیمیا لە ئەوروپا پێشکەوت وشوێنی جادووگەریی گرتەوە.

شوێنەوارێکی کەمی زانستی زیندەوەرزانی موسوڵمانان لەو سەردەمانەدا گەیشتووە پێمان، لەوانە کتێبی رووەك (النبات) دانراوی (أبوحنیفة الدینوري) کە بۆ دانانی بۆ زۆرێك سەرچاوەی تر گەڕاوەتەوە

---

[108] بڕوانە: ئەم وتەیە چەند نزیکە لەو راستییەی کە زانایانی ئەمڕۆ دەریانخستووە کە هەموو ماددەکان لە گەرد و گەردیلە پێکهاتوون!!.

وتێیدا باسی دەرمانزانی کردووە وچەندین گیراوەی پزیشکی تری بۆ زیادکردووە، زانایانی زیندەوەرزانی موسوڵمانان ڕێگای بەرهەمهێنانی چەندین میوەی نوێیان ناسیوە لەڕێی بەکارهێنانی موتوربە کردنەوە، وداری گوڵ وداری بادامیان کۆکردۆتەوە ولەم ڕێگەیەوە چەندین گوڵی نوێی دەگمەن وجوانیان بەرهەم هێناوە، (عثمان بن عمر الجاحظ) کە ساڵی (٧٦٩ز) مردووە بیردۆزێکی گەشە سەندنی هاوشێوەی بیردۆزەکەی (المسعودي) باسکردووە، ووتویەتی کە ژیان لە نازیندووەوە بووە بە ڕووەك ولە ڕووەکیشەوە گەشەی کردووە بۆ ئاژەڵەکان ولە ئاژەڵەکانیشەوە بۆ ئادەمیزاد.

دەربارەی زانستی پزیشکیی موسوڵمانان لە سەرەتای فتوحاتی ئیسلامیدا زانیارییەکی کەمیان لەم بوارەدا هەبووە، بەڵام پاشان گرنگیی زۆریان پێدا وکۆمەڵێك پزیشکی بەناوبانگ لە شام وفارسدا پەیدابوون، هەروەها پزیشکی شارەزایان لە هیندستان ویۆنانەوە بانگهێشتکرد، گرنگییان داوە بە توێکاری ونەشتەرگەریشیان پێشکەوت، بەڵام بەهێزترین لقی پزیشکی ئیسلامی بریتی بووە لە چارەسەرکاری وبەکارهێنانی گیراوە پزیشکییەکان وخاسییەتەکانیان، چەندین دەرمانی نوێیان بەکارهێناوە وەك: عەنبەر وکافور وجیوە وچەندین شلەمەنییان بەکارهێناوە وەك ئاوی گوڵ وگیراوەکانی، لە گرنگترین کارە بازرگانییەکانی ئیتاڵیا وڕۆژهەلات بریتی بووە لە هاوردە کردنی گیراوە پزیشکییەکانی موسوڵمانان بۆ ئەورووپا، موسوڵمانان یەکەم کەس بوون کە سازنگەی دەرمان ودەرمانخانەکانیان دروستکرد ویەکەم کەس بوون کە قوتابخانەیەکی دەرمانسازییان دامەزراند، ونامە وکتێبی گەرەیان نووسیووە لەسەر دەرمانسازی (علم الأقراباذین).

زانایـانی موسـوڵمان زۆر گـەرم بـوون لـە بانگەشـەیان بـۆ خۆشـتن بـە تایبـەتی لـەکاتی تووشـبوون بـە نەخۆشـییە درمەکانـدا، زانسـتی نـوێی ئـــەمڕۆش هـــیچ زیادەیـــەکی نییـــە لەســـەر چارەســـەری ئـــەوان بـــۆ نەخۆشییەکانی (ئاوڵە وسووریژە)، هەروەها بەنجکردنیان بەکارهێناوە لـە هەنـدێك لـە نەشـتەرگەرییەکانیاندا بـە هەڵمـژینی دووکـەڵی حەشیشـە وهەندێك ماددەی تلیاکی تر بە مەبەستی خەوانـدنی قـووڵی نەخۆشـەکان، ئێمە ناوی ٣٤ نەخۆشخانەی بەناوبانگمان لەلایە کە لە وولاتانی ئیسلامیدا لەو کاتەدا هەبوون[١٠٩]، یەکەم نەخۆشخانە لە شاری بەغدا لـە سـەردەمی (هارون الرشید)دا دەمەزراوە، پاشـان بەدوایـدا ٥ دانـەی تـر دروسـتکران، مێژوونووسەکان بۆمـان بـاس دەکـەن کـە لـە سـاڵی (٩١٨ز)دا بەڕێوەبـەر هـەبووە بـۆ نەخۆشـخانەکانی شـاری بەغـدا، گـەورەترین نەخۆشـخانەش بریتی بووە لەوەی کە لە ساڵی (٧٠٦ز) لە شاری دیمەشق دروسـتکرا ولـە ساڵی (٩٧٨ز) زیاد لـە ٢٤ پزیشـك کاریـان تێـدا دەکـرد، نەخۆشـخانەکان گرنگترین شوێنێك بوون بۆ فێربـوونی زانسـتی پزیشـکی، یاسـاش رێگـەی نـەدەدا بـە مرۆڤێـك کـە ئـەم کـارەی مومارەسـە بکردایـە هـەتاوەکو کـە نەچووایە بۆ تاقیکردنەوەیەك بۆ ئەم مەبەستە ودەوڵـەت مۆڵـەتی نەدایـە، هـــەروەها دەرمانســـازەکان وسەرتاشـــەکان وئێســـك گرەوەکـــان لـــەژێر چاودێری دەوڵەت ویاساکانیدا بوون، (علـی بـن عیسـی)ی وەزیـر وپزیشـك دەسـتەیەك پزیشـك وفەرمانبـەری تـەرخانکرد بـۆ ئـەوەی کـە بـە شـوێنە جیاوازەکـانی وولاتـدا بگـەڕێن بـۆ چارەسـەری نەخۆشـەکان (٩٣١ز)، رۆژانەش پزیشکان دەچوون بۆ بەندینخانەکان بۆ چارەسەری گیراوەکـان،

---

[١٠٩] ژمارەی تەواوی نەخۆشخانەکان زۆر لەمە زیاتر بووە وەك لە دواییدا باسی دەکەین.

هەروەها ئەوانەشی کە نەخۆشی عەقڵی ودەروونییان هەبوو هەڵس وکەوتێکی تایبەتییان لەگەڵ دەکرا، وبەشێوەیەکی مرۆییانە چارەسەر دەکران کە هەمووی سۆز وبەزەیی بووە.

لە شاری بەغدا بە تەنیا لە ساڵی (٩٣١ن)دا ٣٦٠ پزیشکی مۆڵەتدراو هەبووە وموچەیەکی زۆر بەرزیان دەدرایە، بۆ نموونە (جبريل بن بختيشوع) ی پزیشك لە سەردەمی (هارون الرشيد) و(المأمون)دا سەروەتەکەی زیاتر بووە لە (٨٠) ملیۆن درهەمی زیو، هەروەها پزیشکی بەناوبانگی تر پەیدا بوون وەك (يوحنا بن ماسويه) کە شارەزا بووە لە توێکاریدا، و(حنين بن إسحاق)ی وەرگێڕ کە خاوەنی کتێبی (عشر مقالات في العين)ە، هەروەها (علي بن عيسى) کە بەناوبانگترین پزیشکی چاو بووە وکتێبەکەی کە بەناوی (تذكرة الكحالين) بووە تا سەدەی هەژدەیەمیش لە زانکۆکانی ئەوروپادا دەخوێندرا.

بەناوبانگترین پزیشکیش (أبوبكر محمد الرازي) بووە کە لەلای ئەوروپییەکان بە رازیس (Rhazes) بەناوبانگ بووە، رازی وەك زوربەی زانایان وشاعیرانی سەردەمی خۆی فارس بووە وبە عەرەبی نوسیوێتی، لە شاری (رەی) نزیکی تاران لەدایکبووە، کیمیا وزانستی پزیشکی لە بەغدا خوێندووە، دانەری (١٣١) کتێبە کە نیوەی لە پزیشکیدا بووە وزوربەی فەوتاوە، ناسراوترین کتێبەکانی بریتییە لە (الحاوي في الطب) کە لە ٢٠ بەرگدایە ولە هەموو لقەکانی پزیشکی کۆڵیوەتەوە، ئەم کتێبە وەرگێڕدرا بۆ لاتینی لەژێر ناوی (Liber Continens)، تا چەندین سەدە لە ئەوروپادا بەرزترین پلەی هەبووە لە فێربوونی پزیشکیدا وگرنگترین سەرچاوە بووە، یەکێك بووە لەو ٩ کتێبەی کە کتێبخانەی کۆلیجی پزیشکی زانکۆی (پاریس)ی لێپێکهاتووە لە ساڵی (١٣٩٤ن)دا،

نوسراوەکەی دەربارەی ئاوڵە وسورێژە نموونە بووە لە تێبینی راستەوخۆ ولێکدانەوەی ووردا، ویەکەم لێکۆڵینەوەی زانستییانەی راست بووە دەربارەی نەخۆشییە درمەکان ویەکەم هەوڵێکیش بووە بۆ جیاکردنەوەی ئەی ٢ نەخۆشییە لە یەکتری، دەتوانین کە حوکم بەسەر کاریگەریی گەورەی ئەم نامەیەدا بدەین کاتێك دەبینین کە بە زمانی ئینگلیزی ٤٠ جار چاپکراوەتەوە لەنێوان ساڵەکانی (١٤٩٨ن) بۆ (١٨٦٦ن).

بەناوبانگترینی هەموو کتێبەکانی رازی بریتییە لە کتێبێك لە ١٠ بەرگدا کە ناوی (المنصوري) بووە وکردوێتی بەدیاری بۆ کاربەدەستێکی خوراسان، (جیرارد الکریموني) وەریگێڕاوە بۆ لاتینی، بەرگی نۆیەمی ئەم کتێبە کە لای رۆژئاواییەکان بە (Nonus Almansoris) ناسراوە تا سەدەی شانزەیەمی زایینیش لای قوتابیانی پزیشکی ئەورووپا بەکاردەهات، رازی چەندین رێگەچارەی نوێی داهێنا وەك بەکارهێنانی مەرهەمی جیوە، وبەکارهێنانی ریخۆڵەی ئاژەڵان بۆ دوورینەوە، زۆرێك لە دانراوەکانی ناوی خۆشیان هەیە وەك: (پزیشکی زیرەك ئەوە نییە کە هەموو نەخۆشییەك چارەسەر بکات چونکە ئەوە لە توانادا نییە) هەروەها نامەیەکی تری داناوە بەناوی (هۆکاری ئەوەی کە زۆرێك لە پزیشکانی نەزان وعەوام وئافرەتان لە شارەکاندا دەتوانن چارەسەری هەندێك نەخۆشی بکەن باشتر لە زانایان وبەهانەی پزیشکان لەم بارەیەوە)، بە کۆی دەنگی زانایان (الرازي) گەورەترین پزیشکانی کلینیکی بووە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا کە لە تەمەنی ٨٢ ساڵیدا بە هەژاری مردووە، لە کۆلیجی پزیشکی زانکۆی (پاریس) ٢ وێنەی رەنگاوڕەنگی ٢ پزیشکی موسوڵمان هەڵواسراون کە بریتین لە زانایان (الرازي) و(إبن سینا).

(أبـوعلي الحسـين بـن سـينا)ش بـه گـەورەترین فەیلەسـوف وبەناوبانگترین پزیشکی سەردەمی خۆی دادەنرێت، ژیاننامەی خۆی کە بەدەستی خۆی نوسیویتییەوە (کە ئەمە شتێکی دەگمەن بووە لەو کاتەدا) شایەتی ئەمە دەدات، (ئیبن خەلەکان) دەربارەی دەڵێت: کاتێك گەیشتە تەمەنی ١٠ ساڵی قورئانی پیرۆز شارەزابوو وهەندێك ئەدەب وبنەماکانی ئاینی لەبەرکرد، وحیسابی جەبر وموقابەلە شارەزا بوو، فێری زانستی پزیشکیش بوو وتێیدا بلیمەت بوو بەشێوەیەك کە لە تەمەنی ١٧ ساڵیدا (نوح بن منصور)ی کاربەدەستی شاری (بوخارا)ی لە نەخۆشی چارەسەر کرد، لێرەوە ناوبانگی دەرکرد ولە خزمەتی کاربەدەستانی ئێراندا کاری دەکرد، ودەستی کرد بە نووسین ودانان وزیاد لە (١٠٠) کتێبی نوسیوە، کە دەربارەی هەموو لقەکانی زانست وفەلسەفە دواوە، چەندین کتێبی گەردووناسی داناوە وئامێریشی لەم بوارەدا داهێناوە، لێکۆڵینەوەی گرنگی هەیە لە بوارەکانی: جووڵەزانی، ووزە، وبۆشایی، ورووناکی، وگەرمی، وچڕیی هاوجۆریی.

نوسراوێکی هەبووە دەربارەی کانزاکان کە تا سەدەی ١٣ گرنگترین سەرچاوەی زانستی چینەکانی زەوی بووە لای ئەوروپییەکان، کە تێیدا دەربارەی پێکهاتەی شاخەکان دواوە کە نموونەیە لە روونکردنەوەی زانستییانەدا، وتوویەتی کە: {شاخەکان لە ٢ هۆکارەوە دروست دەبن: یان ئەوەتا بەهۆی تێکچوون لە توێکڵی زەویدا دروست دەبن وەك ئەوەی لەکاتی بوومەلەرزە سەختەکاندا روودەدات، یان ئەوەتا بەهۆی کاری ئاوەوە دەبێت کە رێگەیەکی نوێ بۆ خۆی دەکاتەوە بە داتاشینی دۆڵەکان، ئەویش بەهۆی ئەوەی کە چینەکانی زەوی جیاوازن لە

جۆرەکانیاندا، هەیانە نەرمە وهەیانە رەقە، ئاوەکان وباکان جۆری یەکەم دەپـرووکێنن وبـەردەکانی جـۆری دووەم وەك خـۆی دێڵنـەوە، کـە ئـەم گۆڕانکارییانـە پێویسـتی بـە کـاتێکی دوورودرێـژ هەیـە، بـەڵام بـوونی شوێنەوارە بەبەردبووەکانی گیاندارە ئاوییـەکان لـە زۆرێـك لـە شـاخەکاندا بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی کـە ئاوەکـان گـرنگترین هۆکـارێکن کـە ئـەم ئاکامانەیان دروست کردووە}[110].

ئـیبن سـینا ٢ کتـێبی هەیـە کـە هـەموو بۆچـوون وتەعالیمـەکانی لەخۆگرتووە، یەکـەمیان کتـێبی شـیفایە (شـفاء الـنفس) کـە بریتییـە لـە ئینسـایکلۆپیدیایەك لـە ١٨ بەرگـدا کـە زانسـتە بیرکارییـەکان وسروشـتی وئـەودیو سروشـت وزانسـتە ئاینییـەکان وئـابووری وسیاسـەت ومۆسـیقای لەخۆگرتووە.

دووەمیان کتێبی (القانون في الطـب)ە کـە بریتییـە لـە توێژینەوەیـەکی گـەورە دەربـارەی کـاری ئەندامـەکان وزانسـتی تەندروسـتی وچارەسـەر ودەرمانسازی، زۆر جاریش هەندێك بابـەتی فەلسـەفی تێـدا دەوروژێنێـت، پاش وەرگێڕانی کتێبی (القانون) شـوێنی کتێبـەکانی (رازی وجـالینۆس)ی گرتەوە لەدوای سەدەی دوانزەیەمەوە، وئەم بوو بە سەرچاوەی سـەرەکی خوێندنی زانستی پزیشکی لە زانکۆکانی ئەوروپادا، کە ئـەم پایـە بـەرزەی پاراست ومامۆستایانی پزیشکی لە هـەردوو زانکـۆی (مۆنپلییـە) و(لۆڤـان) لە فەرەنسا بە بەردەوامی تا کۆتـایی سـەدەی حەڤدەیـەمیش ئامۆژگـاری قوتابییەکانیان دەکرد بۆ گەڕانەوە بۆ ئەم کتێبە.

---

[110] خوێنەری بەڕێز بڕوانە: ئەم روونکردنەوە زانستیيە ووردە کە جیاوازییەکی ئـەوتۆی نییـە لە روونکردنەوەی کتێبە بەناوبانگەکانی زانستی زەویناسی (جیۆلۆجی) ئەمڕۆ.

دیارترین کتێبێك لە سروشتزانیدا کتێبی (میزان الحکمة)ی دانراوی (أبوالفتح) بووە (١١٢٢ن)، کە بریتییە لە کتێبێکی مێژووی زانستی سروشت، ویاساکانی بەندۆلەکان، وهەروەها چڕیی هاوجۆری زۆرێك لە ماددە شل ورەقەکانی دیاری کردووە، هەروەها باسی بیردۆزی کیشکردنی زەویشی تێدا کراوە بەوەی کە هێزێکە هەموو شتێك بەرەو چەقی زەوی رادەکێشێت، پلەوپایەی کیمیازانەکان زۆر بەرز بووەوە، وهەروەك (عبداللطیف) دەڵێت ٣٠٠ رێگایان دەزانی بۆ چەواشە کردنی خەڵکی، (یاقوت الحموي) (١١٧٩-١٢٢٩ن) هەڵگری ئاڵای زانستی جوگرافیا بووە، بۆ لێکۆڵینەوەی زەوی بەسەر زەویدا گەڕاوە ودەربارەی دانیشتوان لێکۆڵینەوەی زۆری کردووە، زۆری پێخۆشبووە کە لە شاری (مەرو) ١٠ کتێبخانەی گشتی دیوە کە تەنها لە یەکێکیاندا ١٢٠٠٠ بەرگ کتێبی تێدابووە وبەرپرسی ئەم کتێبخانەیە زۆر یارمەتی داوە، لە ساڵی (١٢٢٨ن)دا کتێبی (معجم البلدان)ی تەواوکردووە کە مەوسوعەیەکی جوگرافی گەورەیە وهەموو زانیارییە زانراوەکانی جوگرافیای سەدەکانی ناوەڕاستی تێدا کۆکردۆتەوە، هەر لە فەلەك وسرشت وزانستی شوێنەوار وجوگرافیای مرۆیی ومێژوو لەگەڵ دیاری کردنی دوورییەکانی زۆرێك لە شارەکان وگرنگییان وژیاننامەی خەڵکە بەناوبانگەکانیان، بەپێی زانیاری ئێمە هیچ کەسێك بە هاوشێوەی ئەم زانا پایەبەرزە زەوی خەشنەویستووە.

رووەکزانی لەو سەردەمانەدا بووژایەوە لەسەر دەستی زانایانی موسوڵمان، (ئیدریسی) کتێبێکی دانا لەسەر رووەك کە ٣٦٠ جۆری جیاوازی باسکردووە، کە تەنها گرنگی بەبوارە پزیشکییەکەی نەداوە

بەڵکو لەلایەنی زانستی ڕووەکناسیشەوە باسی کردوون، ناوبانگی (أبوالعباس الإشبيلي) دەرکەوت (١٢١٦ز) بە لێکۆڵینەوەکانی لەسەر جۆرە ڕووەکییە جیاوازەکان کە لەنێوان دەریای سوور وزەریای ئەتڵەسیدا گەشە دەکەن، (أبومحمد إبن البيطار)یش (١١٩٠-١٢٤٨ز) هەموو ئەوەی موسوڵمانان لەسەر ڕووەك زانیویانە کۆی کردەوە لە ئینسایکلۆپیدیایەکی مەزندا کە زۆر دەوڵەمەندە لە ماددەکانیدا وسەرچاوەی باوەڕپێکراو ودانپێدانراوی ئەم زانستە بوو تا سەدەی شانزەیەم، ئەم نوسراوە بەرزی کردەوە بۆ پلەی گەورەترین ڕووەکناس ودەرمانزان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، لە کتێبەکەیدا زیاد لە ١٤٠٠ جۆری ڕووەك وخواردەمەنی باسکردووە کە ٣٠٠ دانەیان پێشتر نەناسرابوون، هەروەها تێبینی ووردیشی داوە سەبارەت بە پێکهاتەی کیمیایی وبەکارهێنانیان لە چارەسەری نەخۆشییەکاندا.

موسوڵمانان لەم سەردەمەدا گەورەترین پزیشکانیان بەرهەم هێنا لە ئاسیا وئەفریقا وئەوروپادا، وبەتایبەتی بلیمەت بوون لە نەخۆشییەکانی چاودا کە تەنانەت نەشتەرگەری ئاوی سپی چاویشیان ئەنجامدەدا، پێشڕەو بوون لە ئامادەکردنی نەخۆشخانە باش وتەندروستییەکاندا، بۆ نموونە ئەو بیمارستانەی کە (نورالدين) لە شاری دیمەشق دروستی کرد لە (١١٦٠ز)دا بۆ ماوەی ٣ سەدە بەخۆڕایی چارەسەری نەخۆشەکانی دەکرد ومێژوونووسان دەڵێن: ڕووناکی ئەم نەخۆشخانەیە تا ماوەی ٢٦٧ ساڵ پرشنگی دەدایەوە، کاتێکیش (ئیبن جوبەیر) هات بۆ بەغدا لە ساڵی (١١٨٤ز)دا سەریسوڕما لە گەورەیی نەخۆشخانە مەزنەکەی ئەو شارە کە وەك کۆشکێکی مەزن لەسەر ڕۆخی ڕوباری دیجلە دروستکرابوو، کە

خۆراك وچارەسەری دەدا بە نەخۆشەكان بەبێ بەرامبەر، لە قاهیرەش سوڵتان (قەلاوون) لە ساڵی (١٢٨٥ن)دا دەستیكرد بە دروستكردنی نەخۆشخانەی مەنسور كە گەورەترین نەخۆشخانە بووە لە سەرتاپای سەدەكانی ناوەڕاستدا، چەندین بەشی جیاوازی تێدابووە بۆ نەخۆشییە جۆراوجۆرەكان وتاقیگە ودەرمانخانە وكلینیكی دەرەكی وچێشتخانە وچەندین حەمام وكتێبخانە ومزگەوت وهۆڵی موحازەرە وهۆڵی نەخۆشییە دەروونییەكانی تێدابووە، تەنانەت چەندین مەنزەرەی سەرنجراكێشی تێدابووە كە مایەی دڵخۆشی بووە.

نەخۆشەكان بەخۆڕایی چارەسەر دەكران جا ئەگەر پیاو یان ئافرەت یان دەوڵەمەند یان هەژار یان بەندە یان ئازاد بوونایە، هەموو نەخۆشێك پاش دەرچوونی بڕێك پارەی دەدرایە بۆ خواردن تا دەكەوێتەوە سەر كار، ئەو كەسانەی كە خەویان لێنەدەكەوت گوێیان لە مۆسیقایەكی ناسك وبەئاواز دەگرت وچیرۆكخوێنە شارەزاكان چیرۆكیان بۆ باس دەكردن وزۆر جار كتێبیان دەدرایە بۆ خوێندنەوەی، لە هەموو شارە گەورەكانی جیهانی ئیسلامیشدا نەخۆشخانەی چارەسەر كردنی نەخۆشییە دەروونییەكان هەبووە.

بەكورتی دەتوانین بڵێین (ئیبن سینا) گەورەترین نووسەر بووە لە سەدەكانی ناوەڕاستدا و(رازی) گەورەترین پزیشك بووە وبەیرونی گەورەترین جوگرافیناس وئیبنولهەیسەم مەزنترین زانای روناكیزانی وجابیری كوڕی حەییانیش گەورەترین كیمیایی ئەوسەردەمانە بووە، ئەمانە پێنج ناون كە جیهانی مەسیحی ئەمڕۆ دەربارەیان زۆر كەم دەزانێت وئەم نەزانینەمان بەڵگەیە لەسەر تەسكی بینینمان

وکەمتەرخەمیمان لە ناسینی مێژووی سەدەکانی ناوەڕاستدا، وناتوانین کە بیانوو بەوە بۆ خۆمان بێنینەوە کە زانستەکانی ئەو سەردەمە زۆر جار پۆخڵ دەبوون بە تێکەڵاو بوونی ئەفسانە وخورافیات، بەڵام بابزانین کە لە هەموو بوارەکاندا پێشکەوتوو بوون وئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ پێکەوە گرێدان ودەرهێنان لە ئاکامەکانەوە کە لەلایان کۆبوو بووەوە زیاتر لە پێشکەوتنیان لە دۆزینەوەکان ولێکۆڵینەوە ڕێکوپێکەکاندا، هەرچەندە لەم بوارەشدا کەم وکورت بووین بەڵام دەبینین کە زانستی کیمیا بەڕێگەی تاقیکردنەوەی زانستییانە پێشکەوت کە ئەم ڕێگەیە بریتییە لە گەورەترین شانازی ودەستکەوتی ژیریی نوێ، کاتێکیش کە (ڕۆجەر بیکۆن) ئەم ڕێبازەی بۆ ئەورووپا ڕاگەیاند پاش (جابیر) بە ٥٠٠ ساڵ ئەوەی کە ڕێنمایی کرد بۆ ئەو ڕێگە زانستییە بریتی بوو لەو ڕووناکییەی موسوڵمانانی ئەندەلوس کە ڕێگەی بۆ ڕۆشن کردەوە، وئەم ڕووناکییەی ڕۆژئاواش تیشکێك بوو لە ڕووناکی زانستی موسوڵمانانی ڕۆژهەڵات.

ئەوەی کە مایەی داخە ئەوەیە کە هەزاران نوسراوی دەستنووسی موسوڵمانان هی سەدەکانی هەشتەم ونۆیەم ودەیەم ویانزەیەم لە بوارەکانی زانست وئەدەب وفەلسەفەدا هێشتا شارراوەیە لە کتێبخانەکانی جیهانی ئیسلامیدا، بۆ نموونە لە تەنیا (ئیستەنبوڵ)دا ٣٠ کتێبخانەی سەر بە مزگەوتەکان هەیە کە زوربەی دەستنووسەکانیان هێشتا ڕووناکییان نەدیوە، لە (قاهیرە ودیمەشق وموصڵ وبەغدا ودەلهی)شدا کۆمەڵێکی ئیجگار زۆر لەم دەستنووسانە هەن کە هێشتا بە تەواوەتی ڕێکیش نەخراون وپێڕستیان نییە، لە کتێبخانەی

(الأسكوريال)یش لـە نزیـك شـاری (مەدریـد) کتێبخانەیـەکی هـەرە گـەورە هەیـە کـە تـا ئێسـتاش بـە تـەواوەتی سـەرژمێری هـەموو دەستنووسـە ئیسـلامییەکانی نـەکراوە کـە لـە بوارەکـانی زانسـت وئـەدەب وشـەریعەت وفەلسەفەدان، ئەوەی کە ئێمەش لەمڕۆدا دەیزانین لـە بـەری رەنجـی ئـەو سـەدانەی بـیری ئیسـلامی تـەنیا کەمێکـە لـە کەلـەپووری موسـوڵمانان، وئەمەش کە ماوە تەنیا بەشێکی کەمی بەرهەمی عەقڵ وژیرییانە وئـەوەی ئێمـە لـەم لاپەڕانـەدا نوسـیمان تـەنیا تنۆکێکـە لـە دەریـای ئـەو کەلەپوورەیان، ئەگەر زانایانیش بە تـەواوەتی پـەردە لادەن لەسـەر ئـەم کەلەپووره لەبیرکراوە ئـەوا بەدڵنیاییـەوە دەڵێم کـە ئێمـە ئـەو سـەدانەی مێژووی موسوڵمانان بـە یـەکێك لـە سـەردەمە زێڕینـەکانی عـەقڵ وژیریـی مرۆڤایەتی دادەنێین.

لەگـەڵ فـەتح کردنـی موسـوڵمانان بـۆ ئەنـدەلوس ودورگـەی (صـقلیة) کاریگـەریی رۆشـنبیری موسـوڵمانان لەسـەر ئـەورووپا دەسـتی پێکـرد بـە تایبـەتی لـەبواری زانسـتیدا، لـە پایتـەختی دورگەکـەدا (پـالیرمۆ) زانکۆیـەکیان دامەزرانـد وچـەندین پزیشـکی بـەناوبانگ تێیـدا پەیـدابوون، وزانسـتی پزیشـکی صـقلیەی ئیسـلامی کاریگـەریی گـەورەی کـردە سـەر قوتابخانەی پزیشکی (سالێرنۆ) لە ئیتاڵیادا.

لە ئەندەلوسی ئیسلامیش (ئیسـپانیای ئێسـتا) وەك رۆژهەڵاتناسـێکی بەناوبانگ دەڵێت (کە بریتییە لە ستانلی لین پۆل): (ئەندەلوس لە هـەموو مێژوویـدا فەرمانڕەواییـەکی دادپەروەرانـەی بەبەزەییانـەی نـەبینی وەك ئـەوەی لـە سـەردەمی فاتیحـە موسـوڵمانەکاندا بینـی)، ئیسـپانیا لـە سـەردەمی موسـوڵماناندا بەهەشـتێکی میـوە وگـوڵزار بـووە بـەهۆی

فەرمانڕەواییە چاکەکەیانەوە، کانزاکـان سـوودیان لێـوەردەگیرا ولـە کانەکانـەوە (ئـاڵتون وزیـو وتەنەکە وئاسـن وقورقوشـم وگـۆگرد وجیـوە) دەردەهێنران، پیشەسـازییەکان بـە تـەواوەتی پێشـکەوتن بـۆ نموونـە لـە شاری قورتوبە پێستەیەکی زۆر چاك دروست دەکرا کـە پـێڵاو دروومکـانی ئەوروپا دەیانکڕی وبەکاریان دەهێنا بۆ پێڵاو دروسـتکردن وناویـان نـابوو پێستەی قورتوبە (Cordovan) وخۆشیان بـەناوی ئـەم شـارەوە نـاوی (Cordwainer)یان لێنرا، لـە قورتوبـەدا بـە تـەنها ١٣٠٠٠ قوماشچـنەر هـەبووە، (المقـري) دەڵێـت: (عبـاس إبـن فرنـاس) لـە سـەدەی نۆیـەمی زایینیـدا چـاویلکەی داهێنـا، هـەروەها کاتـژمێرە ئـاڵۆزە چـرکەدارەکانی دروسـت کـردووە وهـەروەها ئـامێرێکی فڕینیشـی دروسـتکردووە، ئـازادی رادەربـــڕین وپەرســـتن دەســـتەبەر کرابـــوو لەلایـــەن حوکمڕانـــە موسـولْمانەکانەوە، تەنانـەت قەشـە گاورەکـان بۆڵـەیان بـوو لەدەسـت خـووگرتنی گـەنجانی مەسـیحی بـە زانسـت وئـەدەبی موسـولْمانان وبـە شـەوقەوە کتێبـەکانیان دەخوێنـد وکتێبخانـەکانیان پڕدەکـرد لـە کتێبـە عەرەبییەکان، ئاینی ئیسلام ئەوەندە کاریگەر بوو لەسەریان کە زوربـەیان موسـولْمان دەبـوون بـۆ نموونـە لـە سـاڵی (١٣١١ز)دا دانیشـتوانی شـاری (غرناطـة) بـە ٢٠٠٠٠٠ مەزەنـدە دەکـران کـە ٥٠٠ کەسـیان نـەبێت ئـەگینا ئەوانی تر لە رۆڵەی مەسیحییەکان بوون کە موسولْمان ببوبـوون وحـوکمی موسولْمانانیان پێباشتر بوو لە حوکمی مەسیحییەکان.

شـاری (قورتوبـە) لـە سـەردەمی (المنصـور)دا لـە گـەورەترین شـارە شارستانییەکانی دونیا بوو کە هیچی لە شارەکانی بەغدا وقوسـەتەنتینیە کەمتر نەبووە، وەك (المقري) دەڵێت: ٢٠٠٠٧٧ خانووی تێدابووە، لەگـەڵ

٦٠.٣٠٠ كۆشـك و٦٠٠ مزگـەوت و٧٠٠ حـەمامی گشـتی، مێژوونووسـە موسـوڵمانەکان وەسـفی شـارەکانی ئەنـدەلوسمان بـۆ دەکـەن کـە چـۆن لێوانلێـو بـوون لـە شـاعیران وزانـا سروشـتییە بلیمەتـەکان وئەدیبـەکان وگـەورە یاسـادانەرەکان وپزیشـکان، تەنانـەت (المقـري) مێـژوونووس ٦٠ لاپـەڕەی کتێبەکـەی بـەناوی ئـەو زانایانـە رەشـکردۆتەوە، قوتابخانـە سـەرەتاییەکان ژمارەیـان زۆر بـووە وخوێنـدن تیایانـدا بـەخۆڕایی بـووە وکچـان وەك کـوڕان دەچـوون بـۆ خوێنـدن، خوێنـدنی بـاڵاش لەلایـەن کۆمەڵێك مامۆستای تایبەتی دەووترانەوە، لە قورتوبـە زانکۆیـەك دامـەزرا کـە نموونـە بـووە لـە جیهـانی ئیسـلامیدا، هـەروەها کـۆلیجی تـریش لـە شـارەکانی (غرناطـة، وإشـبيلية، وطليطلـة، ومرسـية، وبلنسـية وقـادس) دامەزران، پیشەسازی کاغەز هاوردەکرا لە رۆژهەڵاتەوە وبـووە هـۆی زیـاد بوونی ژمارەی کتێبەکان بۆ چەندین قات بەشێوەیەك کـە لـە ئەندەلوسـدا زیاد لە ٧٠ کتێبخانەی گشتی هەبووە.

زانایان لە ئەندەلوس پلەوپایەیەکی بەرزیان هەبووە وبـەناوبانگ بـوون وخەڵکی زۆر بە گەورەیان زانیون وژمارەیان لەبـژاردن نـەهاتوون، لـە زانـا بەناوبانگەکان مێژوونووس (أبومحمد علي بـن حـزم) بـووە (٩٩٤-١٠٦٤ز) کـە خـاوەنی کتـێبی (الفَصـل في المِلَـل وَالأهْـواء والنِّحَـل)ە وبریتییـە لـە کتێبێکـی بـەراورد کردنـی ئاینـەکان ومەزهەبـەکان، (مسـلمة بـن أحمـد المجريطـي) کـە سـاڵی (١٠٠٧ز) مـردووە ئەزیاجـەکانی خـەواریزمی دەستکاری کرد بۆ ئەوەی گونجاو بێت لەگەڵ ئیسپانیادا، وهـەر ئـەم بـوو کە کیمیای جادووگەریی گۆڕی بۆ زانستی کیمیای راستەقینە بـەوەی کـە ئۆکسـیدی جیـوەی لـە جیـوە دروسـتکرد، نـاوی (إبـراهيم الزرقـالي)یـش

(١٠٢٩-١٠٨٧ز) كه يەكێكه له زانايانى (طليطلة) بوو به ناوێكى جيهانى، چونكه ئامێره فەلەكييەكانى باشتر كرد، (كۆپەرنيكۆس) چەند برگەيەكى نوسراوەكەى لەسەر (الإسطرلاب) نەقلّ كردووه له كتێبەكەيدا، ئەو خشته فەلەكييانەى كه داينا وناويان لێنرا (أزياج طليطلة) جوولّەى هەسارەكانيان ديارى دەكرد، بريتى بوون له باشترين خشتەى ئەو سەردەمە وتوانى بۆ يەكەم جار لەمێژوودا جوولّەى خۆر لەچاو ئەستێرەكاندا ديارى بكات.

(إبراهيم السهلي) كه يەكێكه له زانايانى (بلنسية)ى ئيسلامى له سالّى (١٠٨١ز)دا كۆنترين گۆى ئاسمانيى دروستكردووه كه تا ئێستا ناسيبێتمان، كه ئەم تۆپە له مسى زەرد دروستكراوه ودرێژى تيرەكەى (٢٠٩ملم) بووه، لەسەر رووەكەى ١٠١٥ ئەستێرەى كێشاوه كه دابەشى كردوون بۆ ٤٧ كۆمەڵە ئەستێره، له زانا فەلەكييە بەناوبانگەكانى تر (المجسطي) و(أبوإسحاق البطروجي) بوون كه به بۆچوون ورەخنەكانيان رێگايان بۆ (كۆپەرنيكۆس) خۆشكرد، له زانا موسولّمانە بەناوبانگەكان لەبوارى بيركارى وهەندەسه وسێگۆشەكاريدا زانا (حسن المراكشي) بووه كه سالّى (١٢٢٩ز) خشته بەناوبانگەكانى بڵاوكردەوه،هەروەها (نصيرالدين الطوسي)يش يەكەم كەسه كه نوسينێكى تايبەتى هەبووه لەسەر زانستى سێگۆشەكارى وەك زانستێكى سەربەخۆ وئەم كتێبەى بۆ ماوەى ٢٠٠ سالّ له ئەوروپادا هاوشانى نەبوولەم زانستەدا.

هەر ئەم سەردەمە زانايەكى بەناوبانگى بەرهەمهێنا لەبوارى جوگرافيادا كه (الإدريسي) بوو، ئيدريسى له (سەبته) له سالّى (١١٠٠ز) لەدايكبووه وزانستەكانى له قورتوبه وەرگرتووه وكتێبه جوگرافياييه

بەناوبانگەکەی نووسی کە تێیدا زەوی دابەشکردووە بۆ ٧ ناوچە وهەر ناوچەیەك بۆ ١٠ پارچە، وپاشان بۆ هەریەکێك لەم حەفتا شوێنە نەخشەی دوورودرێژ ورووونکراوەی دروستکرد کە ئەم نەخشانە گەورەترین کارێك بوون لە بواری کێشانی نەخشە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، پێش ئەمانە خەریتەی بەوجۆرە وورد وفراوان وتەفصیلتر دروست نەکراون، ئیدریسی بەهاوشێوەی زوربەی زۆری زانا موسوڵمانەکان دانی بە خڕێتی زەویدا ناوە وسەلماندوویەتی.

ناسراوترین پزیشکانی موسوڵمان بریتییە لە (أبومروان ابن زهر)ی ئیشبیلی (١٠٩١-١١٦٢ز) کە لە ڕۆژئاوا بە (Avenzoar) ناسراوە، سێیەم کەس بووە لە شەش نەوەی ناسراو لە پزیشکە بەناوبانگەکان بەهەمان ناوەوە ولە هەمان خێزاندا، کە هەر یەکێکیان سەرمەشقی زانستی پزیشکی بووە لە زەمانی خۆیدا، کتێبی پزیشکی (التیسیر)ی دانا لەسەر داوای (ئیبن روشد)ی فەیلەسوفی هاوەڵی، کە ئەم بە گەورەترین پزیشکی دادەنا لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، زۆرترین شتێك کە ئیبن زوهر تێیدا بلیمەت بوو وەسفی کلینیکیی نەخۆشییەکان بوو، کە پاش خۆی شیکردنەوەی ڕاست وپزیشکییانەی بەجێهێڵا بۆ وەرەمەکان وهەوکردنی پەردەکانی دڵ وسییەکان وتەدەرونی ریخۆڵەکان وئیفلیجی قورگ، هەردوو وەرگێڕانە عیبری ولاتینییەکەی کتێبی (التیسیر) گەورەترین کاریگەرییان کردە سەر زانستی پزیشکی ئەورووپی.

(أبوالقاسم الزهراوي)یش (٩٣٦-١٠١٣ز) پلە وپایەیەکی گەورەی هەبوو لە جیهانی مەسیحیشدا ولای ئەوان بە (أبوالکاسس Abulcasis) ناسراوە، هەڵگری ئاڵای نەشتەرگەرە موسوڵمانەکان بووە، مەوسوعە

پزیشـكییەكەی كـە بـەناوی (التصـريف)ەوەیـە ٣ كتـێبی نەشـتەرگەری لەخۆگرتووە، كە دوای ئەوەی وەرگێڕدران بۆ لاتینی بوون بە سەرچـاوەی سەرەكی نەشتەرگەری لـە ئـەورووپادا بـۆ مـاوەی چەندین سەدە، شـاری قورتوبە بوو كـە لەوكاتـەدا ئەورووپییـەكان بـۆی دەچـوون بـۆ ئەنجامـدانی نەشتەرگەرییەكانیان، دوای رووخانی دەوڵەتی ئیسـلامی وداگیركردنـەوەی شارەكانی ئەندەلوس لەلایەن مەسیحییەكانەوە موسـوڵمانان توانییـان بـۆ ماوەیەك بـوونی خۆیـان وڕۆشـنبیرییە درەوشـاوەكەیان بپـارێزن لـەدوایین جێپێیان كە شاری (غرناطة) بوو تا ساڵی (١٤٩٢ن) كە ئەویش داگـیر كـرا، بـەم شـێوەیە پاشمـاوەی ئـەو زانسـت و رۆشـنبیرییە نـەما كـە وولاتـی ئەندەلوسی كرد بە جێی فـەخر وشـانازی هـەموو مرۆڤایـەتی بـۆ مـاوەی چەندین سەدە ! !.

**بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە دەقی ئـەم نووسـینانە لـە بـەرگی حەوتـەم (بەشی ١٣)–(عصر الإيمان/ الحضارة الإسلامية) لاپەڕە (١٦٧) ودواتری لە كتێبی (قصة الحضارة) دانراوی (ول ديورانـت) ووەرگێڕانـی (محمـد بدران)– لە بڵاوكراوەكانی (دار الجيل)– بيروت/القاهرة–٢٠١٠.**

ئەمەی لەسـەرەوە هـاتووە شـایەتی زانایـەكی مێژوونووسـی ناسـراوی رۆژئاوایـــە لەســـەر گـــەورەیی وپرشـــنگداریی شارســـتانێتی ئیســـلامی وپێشدەستی ئاشكرا ومەزنی زانایانی موسوڵمان لە پێشكەوتنی زانست لە بـــوارە جۆراوجۆرەكانـــدا، كـــە وابـــزانم پێویســـتی بـــەهیچ جـــۆرە روونكردنەوەیەك نییە، لەلایەكی ترەوە بابزانین ئەم زانایـە خـۆی هـەڵگری بیروبـــاوەڕی مەســـیحییەتە، بـــەڵام بـــەهۆی دەركـــەوتنی راســـتییە

مێژووییەکانەوە بۆی ئەم شایەتییە گەورەیەی تۆمار کردووە لەم کتێبەیدا کە یەکێکە لە سەرچاوە گەورە وگرنگەکانی مێژووی شارستانییەت وزانستی مرۆڤایەتی کە پشتی پێدەبەسترێت، ولە هەموو جیهاندا یەکێکە لە سەرچاوە باوەڕپێکراوەکان ووەرگێراوەکان.

گەورەیی شایەتی ئەم زانایە بەئاشکرا دەبینین کاتێك باسی هێرشی مەغۆلەکان دەکات بۆ سەر جیهانی ئیسلامی لە سەدەی سیانزەیەمی زایینیدا، وخەفەتی گەورەی خۆی دەردەبڕێت بەرامبەر بەو کاولکارییە بێوێنەیەی کە بەرامبەر بە شارستانێتی ئیسلامی لە رۆژهەلاتدا ئەنجامیاندا، لە هەمان بەرگی کتێبەکەیدا کە دەڵێت:

هێرشی مەغۆلەکان ئەو راستییە مێژووییەمان بۆ دووپات دەکاتەوە کە شارستانێتی هەمیشە سەرنجی هەمەجییەکان رادەکێشێت بۆ هێرش کردنە سەری، جەنگیزخان هەستا بە رێکخستنی ئەو کۆمەڵە خەڵکە بەو یاسا پتەوانەی کە بەسەریاندا چەسپاندی ورێبەرایەتی کردن بۆ داگیر کردنی هەموو جیهان هەر لە چینەوە بۆ روباری ڤۆلگا، لەکاتی داگیرکردنی شارە ئاوەدانەکانی (بوخارا وسەمەرقەند)دا کاولکاری وخوێنڕشتنێکی وایان بەسەر هێنان کە کاتێك (ئیبن بەتوتە) پاش ١٠٠ ساڵ لەم کارەساتە سەریلێدان دەربارەیان دەڵێت کە هێشتا زوربەی ئەو ناوچانە هەر کاولە وهێلانەی کونەپەپووە!

(تولوی) کوڕی جەنگیزخان بەسوپایەکی حەفتا هەزار کەسییەوە بەناو خوراساندا تێپەڕی ولەرێیدا هەر شارێکی داگیر دەکرد کاولی دەکرد، شاری (مەرو) بە خیانەت داگیرکرا وهەمووی سوتێنرا، هەر لەم کڵپەی ئاگرەدا کتێبخانە گشتییەکەشی سووتا کە مایەی شانازی وسەربەرزی

موسوڵمانان بوو، ڕێگایاندا بە دانیشتوانەکەی کە بە تەنیا شارەکە بەجێبێڵن بەڵام لەکاتی راکردنیان یەك یەك تالآن کران وکوژران، لەم قەسابخانەیەدا کە ١٢ ڕۆژی خایاند زیاد لە ١.٣٠٠.٠٠٠ کەس گیانیان لەدەستدا، شاری (نەیسابور) بەگری کرد بەرامبەر داگیرکەران بەڵام کاتێك خۆیدا بەدەستەوە هەموو دانیشتووانەکەی کوژران بە پیاوژن وپیر ومنداڵەوە!

تەنیا ٤٠٠ کەسی زیرەك لە دەست ڕەنگینەکانیان نەبێت کە نێردران بۆ مەنگۆلیا، لە کەللەسەری کوژراوەکان گردۆلکەیەکی ترسناك دروستکرا.

هەروەها شاری (رەی) رەنگینیش کاولکرا لەگەڵ مزگەوتەکانیدا کە ژمارەیان دەگەیشتە (٣٠٠٠)، هەروەها هەموو کارگەکانی دروستکردنی فەخفوریش کە لە هەموو جیهاندا ناوبانگیان دەرکردبوو کاولکران، هەموو دانیشتوانەکەشی کوژران، کاتێکیش شاری (هەرات) لەدژی داگیرکەران راپەری سزادرا بە کوشتنی ٦٠ هەزار لە دانیشتوانەکەی.

پاشان سوپایەکی تری بێشوماریان هات وناوچەکانی ئەزەربایجان وکەرەج وناوچەی دوو رووبار وئەرمینیەی کاولکرد، دوای مردنی جەنگیزخان هۆلاکۆ بەسوپایەکی مەزنەوە ناوچەکانی سەمەرقەند وبەلەخ وئێرانی ژێردەست وکاولکرد وبەرەو (بەغدا) بەڕێکەوت.

لەم کاتەدا (المستعصم باللە)ی عەبباسی کە کۆتایین خەلیفەی عەبباسی بوو یەکێك بوو لە زانا پایەدارەکان ودەستخۆشە بلیمەتەکان ونموونە بوو لە رەوشتبەرزی ونەرم ونیانیدا وزۆر گرنگی بە کاروباری ئاین دەدا، مەغۆلەکان ئابلۆقەی بەغدایاندا وپاش مانگێك خەلیفە دیاری

ونامەیەكی ئاشتیخوازیی بۆ نارد، ئەوەبوو خەلیفە هەڵخەڵەتا بە بەڵێنی بەزەییان وخۆی ٢ كوڕی تەسلیم بوون پێیان[١١١]، هۆلاكۆ وسەربازەكانی لە ١٣ی شوباتی (١٢٥٨ز) چوونە ناو بەغدا ولە بەڵێنەكانیان پاشگەزبوونەوە وبۆ ماوەی ٤٠ رۆژ كوشتن وبڕین ودزینیان ئەنجامدا، كە لەو ماوەیەدا ٨٠٠.٠٠٠ كەسیان كوشت[١١٢]، لەم قەسابخانە گشتییەدا هەزاران لە زانایان وشاعیران وقوتابیان تیاچوون.

لە ماوەی ١ هەفتەدا ئەو كتێبخانە وگەنجینانەی بە چەند سەدەیەك كۆكرابوونەوە دزران وفەوتێنران، سەدان هەزار لە بەرگە كتێبەكان سوتێنران، تەنانەت روباری دیجلە بۆ ماوەیەك ئاوەكەی رەشبوو بەهۆی مەرەكەبی ئەوكتێبانەی فڕێدرابوونە ناوی، جیهانی ئیسلامی لە تیاچوون وفەوتان رزگاری بوو تەنیا بەهۆی سەركەوتنی سوپای میسرییەكان لە (عەین جالوت)دا.

هیچ شارستانییەتێكم نەدیوە كە تووشی كاولكردنی كوتوپڕ بووبێت وەك شارستانییەتی ئیسلامی لەسەر دەستی مەغۆلەكان، ئەم داگیركەرانە لەماوەی ٤٠ ساڵدا هاتن وچوون، نەهاتن بۆ ئەوەی بمێننەوە بەڵكو بۆ كوشتن وتالانی وكاولكاری هاتن ولەگەڵ خۆیاندا دەستكەوتەكانیان بردەوە بۆ مەنگۆلیا، كاتێكیش شەپۆلی داگیركەرانەی خوێنینیان گیرسایەوە، پاش خۆیان ئابوورییەكی شلۆق وكەناڵە رووخاوەكان وقوتابخانە كاولەكان وكتێبخانە سووتاوەكان وحكومەتە لاوازەكانیان جێهێڵا، دانیشتوانیش نیوەیان لەناوچوو بوون وئەوانی تر

---

[١١١] بەلام دوایی هەموویان كوژران.

[١١٢] هەندێك مێژوونووس وەك (إبن كثیر) ژمارەی كوژراوان دەگەیەننە (٢ ملیۆن)!!

دەروونیان تێکشکابوو، ئەم هۆکارە بوو لەگەڵ نوقمبوونی خەڵکی لە ئارەزووەکاندا کە بووە هۆی ئەوەی کە خۆرئاوای ئاسیا لە سەرکردایەتی جیهانەوە بکەوێتە زۆنگاوی هەژارییەکی سەخت وکاولکارییەکی هەمەلایەنەوە، لەجێی دەیان شاری ئاوەدان وشارستانی لە ناوچەکانی شام وعێراق وجەزیرە وفارس وتورکستان کاولکاری وهەژاری ونەداری ونەخۆشی جێی گرتەوە[113].

---

[113] بالێرەشدا شایەتیی مێژوونووسێکی موسوڵمان بێنینەوە کە هاوسەردەم بووە لەگەڵ دەستپێکردنی هێرشی مەغۆلەکان بۆ سەر وولاتی موسوڵمانان، ئەویش زانا (إبن الأثیر)ە کە ساڵی (٦٣٠ك) کۆچی دوایی کردووە، کە لە رووداوەکانی ساڵی (٦١٧ك)دا باسی کردووە، کە سەرەتای دەستپێکی دەرچوونی مەغۆلەکان بوو بۆ سەر وولاتی ئیسلام، باسی ئەو کارەسات و کاولکارییە دەکات کە دووچاری جیهانی ئیسلامی بوو کە لە کاتی ئەودا تەنها لە سەرەتایدا بووە، ئەی باشە چی دەووت ئەگەر تەمەنی درێژەی بکێشایە و دەیەکانی دواتر و کارەساتە جەرگ برەکانی بدیایە؟!! ئەم پیاوە دەڵێت:

چەند ساڵێك مامەوە کە حەزم نەدەکرد باسی ئەم رووداوە بکەم لەبەر گەورەیی لەلام و حەزنەکردنم لە باس کردنی، دەبێت کێ حەزی لە نووسینی هەواڵنامەی کوشتنی ئیسلام و موسوڵمانان بێت؟ و کێ بەلایەوە ئاسایی بێت کە ئەمە باس بکات؟ خۆزگە دایکم منی نەدەبوو، یان بمردمایە پێش ئەوەی ئەمە رووبدات و منیش یادم نەدەما! بەڵام ئەوەبوو کە کۆمەڵێك لە هاوەڵانم هانیان دام کە بینووسمەوە ...

دەڵێین: ئەم کردارە باس کردنی ئەو رووداوە گەورە و کارەسات و موسیبەتە مەزنە لەخۆدەگرێت کە رۆژەکان و شەوەکان ناتوانن هاوشێوەی بێنن، هەموو مرۆڤەکان و بەتایبەتی موسوڵمانانی گرتەوە، ئەگەر یەکێك بڵێت کە: لەوەتەی خوای گەورە ئادەمی دروستکردووە تا ئەمڕۆ مرۆڤەکان دووچاری کارەساتی لەوجۆرە نەبوون، ئەوا راست دەکات، چونکە مێژووەکان شتی لەم جۆرە یان هاوشێوەی یان نزیکی ئەمەیان تۆمار نەکردووە، یەکێك لە گەورەترین ئەو رووداوانەی کە باسی دەکەن بریتییە لە کردەوەکەی (بخت نصر) بەرامبەر بە نەوەکانی ئیسرائیل لە کوشتنیان و کاولکردنی (بیت المقدس)، بەڵام (بیت المقدس) هەر هیچ نییە لەچاو ئەو وولاتانەی کە ئەم نەفرەت لێکراوانە رووخاندیان و کاولیان

دەبینین لێرەدا زۆر بە ئینسافانە باسی هۆكاری سەرەكی دواكەوتنی موسوڵمانان دەكات لە سەدەكانی دواییدا كە زوربەی دەرەكی بووە وكارێكی وای كرد كە جیهانی ئیسلامی بۆ ماوەیەكی زۆر نەتوانێت لەو كارەساتە هەستێتەوە، پاشان لە كۆتایی ئەم بەشەی كتێبەكەیدا ولە سەرەتای بەشی (١٧)ی بەرگی (٩)دا كە ناوی گواستنەوەی زانیارییەكان (إنتقال المعارف)ی لێناوە باسی كاریگەری زانست وشارستانێتی موسوڵمانان دەكات لەسەر ئەوروپا وڕۆژئاوا پاش ئەوەی كە گوێزرانەوە و وەرگێڕدران بۆ زمانە ئەوروپییەكان[١١٤]، جالێرەدا پێم خۆشە كە دووبارە وتەكانی ئەم بەرگە وبەرگەكەی پێشتریش لەمبارەیەوە نەقڵ بكەم:

---

كردن كە هەر شارێكیان چەند بەرامبەری (بیت المقدس) دەبێت! و نەوەكانی ئیسرائیل چین بەرامبەر بەوانەی ئەمان كوشتیان؟! بەڵكو خەڵكی تەنها شارێك لەوانەی كوژران لە هەموو نەوەكانی ئیسرائیل زۆرتر بوون، لەوانەشە مرۆڤەكان تا تیاچوونی جیهان و فەوتانی یەكجارەكی مرۆڤەكان شتی لەم شێوەیە نەبینن ... ئەوان كەسیان نەهێڵایەوە، بەڵكو پیاوان و ژنان و منداڵانیان كوشت، و سكی دووگیانەكانیان هەڵدڕی و كۆرپەلەكانیشیان كوشتن! .... ئیتر تەنها دەڵێین (إنا لله وإنا إليه راجعون ولا حول ولا قوة إلا بالله العلي العظيم). {بڕوانە:: (الكامل في التأريخ) ڕووداوەكانی ساڵی (٦١٧ك)}.

[١١٤] مێژوونووسان لەمڕۆدا كۆكن لەسەر ئەوەی كە (٣) ڕێگای سەرەكی هەبووە بۆ گواستنەوەی زانستەكانی موسوڵمانان بۆ ئەوروپا و كاریگەر بوونیان پێی: ١- لە ڕێگەی جەنگەكانی خاچپەرستانەوە: بەتایبەتی ئەوانەی لەم جەنگانەوە دەگەڕانەوە بۆ ئەوروپا كە كاریگەریی تەواوی شارستانێتی ئیسلامییان لەسەربوو، و لەگەڵ خۆیاندا ئەم كاریگەرییەیان بردەوە بۆ ئەوروپا و بڵاویانكردەوە. ٢- لە ڕێگەی دوورگەی (صقلية)وە كە ماوەی ٢ سەدە زیاتر لەژێر فەرمانڕەوایی موسوڵماناندا بوو. ٣- ڕێڕەوی سەرەكی بریتی بوو لە وڵاتی ئەندەلوس: كە ماوەی زیاد لە ٨ سەدە لەژێر فەرمانڕەوایی موسوڵماناندا بوو، و نموونەی پێشكەوتنی شارستانێتی بووە و كاریگەریی گەورەی كردە سەر پێشكەوتنی زانستی و شارستانێتی لە ڕۆژئاوادا.

ئیسلام بۆ ماوەی ٥ سەدە (٧٠٠-١٢٠٠ز) سەرکردایەتی هەموو جیهانی دەکرد لە هێز وپاسا وفراوانی دەسەلات وبەرزیی خووڕەوشت وبەرزیی ئاستی ژیان وپاسایەکی مرۆیی بە بەزەیی وچاوپۆشی وسنگفراوانی ئاینی وئەدەبیات وتوێژینەوەی زانستی وزانستەکان وزانستی پزیشکی وفەلسەفەدا، هونەر ورۆشنبیری وزانست لە وولاتە ئیسلامییەکاندا زۆر فراوانتر وبڵاوتر بووە لەچاو وولاتە مەسیحییەکاندا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، تەنانەت پاشاکان خۆیان خەتخۆش وبازرگان وپزیشکیش بوون، موسوڵمانان مرۆڤێکی کاملتر بوون لەچاو مەسیحییەکاندا، چونکە زیاتر لەوان پارێزگارییان لە پەیمانەکانیان دەکرد وبە بەزەییتر بوون بەرامبەر بە ژێردەستەکانیان، بەدەگمەن لە مێژوویاندا کاری وەحشیگەرانەیان ئەنجامداوە بەهاوشێوەی ئەو کارەی کە خاچپەرستەکان ئەنجامیاندا لەکاتی گرتنی شاری (بیت المقدس)دا لەساڵی (١٠٩٩ز).

شەریعەتی ئیسلامی بنەما یاساییە بڵندەکانی دادەنا وکۆمەڵێك لە حاکمانی بیرووناکیش جێبەجێیان دەکرد، ئاینی ئیسلامیش ئاسانترە لە پەرستنەکانیدا وکەمتر پشتدەبەستێت بەرووکەش وئاینێکی عەقڵانییە ودوورە لەدراما وەك لە دینی مەسیحیدا دەیبینین.

جیهانی ئیسلامی کاریگەرییەکی ئێجگار گەورەی هەبووە لەسەر جیهانی مەسیحی لەهەموو بوارێکدا، ئەورووپا لە وولاتانی موسوڵمانەوە خواردن وخواردنەوە وگیراوەکان ودەرمانەکان وچەکەکان ورزێپۆشەکان وپاڵنەرە هونەرییەکان وخشڵەکان وپیشەسازییەکان وکاڵا بازرگانییەکان، وتەنانەت یاساکان وهۆکارەکانی دەریاوانیشیان وەرگرت، بۆ کاریگەریی ئیسلام لەسەر رۆژئاوا بڕوانە ئەم ووشە ئینگلیزی ولاتینییانە کە بە ئاشکرا دیارە لە ووشە عەرەبییەکانەوە داتاشراون:

- Orange (أترجة) برتقال.
- Lemon ليمون.
- Sugar سكر.
- Syrup شراب.
- Sherbat الشربات.
- Julep جلّاب.
- Elixir إكسير.
- Azure أزرق.
- Arabesque (أرابيسك) النقش العربي.
- Mattress مطرح.
- Sofa صُفه (أريكة).
- Satin ساتان.
- Fustian فستان.
- Bazar البازار (السوق).
- Chech mate الشاه مات.
- Douane ديوان.
- Magazine مخزن.
- Risk خطر.
- Cable حبل.
- Admiral أمير البحار.

هەروەها ئەگەر بڕوانینە ئامێرە مۆسیقییەکان دەبینین کە زۆرێکیان ناوەکانیان لە سەرچاوەی عەرەبییەوە وەرگیراوە، وەك (Lute) کە لە (العود)ەوە وەرگیراوە، (Rebeck) کە لە (الربابة)وە وەرگیراوە،

و(Guitar) لە (القیثارة)وە وەرگیراوە، و(Tambourine) کە لە (الطنبور)ەوە وەرگیراوە.

چیرۆکە ئەفسانەییەکان وژمارە هیندییەکان کە عەرەبەکان ڕێکیانخست گەیشتنە ئەورووپا وتا ئەمڕۆش بەشێوازە عەرەبییەکەی دەنووسرێن، زانا موسوڵمانەکان بوون کە پارێزگارییان لە کەلەپووری یۆنان وڕۆمان وهیندستان و وولاتەکانی تر کرد لە بوارەکانی: بیرکاری وسروشتزانی وکیمیا وفەلەك وپزیشکیدا، وبەرەوپێشیان بردن ولەلایەن خۆیانەوە گەنجینەیەکی مەزنیان خستەسەر وگواستیانەوە بۆ ئەورووپا، تا ئێستاش زمانە ئەورووپییەکان پڕە لە زاراوە زانستییە عەرەبییەکان، بۆ نموونە: (Algebra) بۆ زانستی جەبر، و(Cipher) یان (Zero) بۆ سفر، و(Azimuth) لە (السُّمُوت)ەوە وەرگیراوە، (Alembic) لە (الأنبیق)ەوە وەرگیراوە، و(Almanac) کە بۆ ڕۆژمێر بەکاردێت ولە ووشەی (المناخ)ی عەرەبییەوە وەرگیراوە.

پزیشکە موسوڵمانەکان بۆ ماوەی ٥٠٠ ساڵ تاکە هەڵگری ئاڵای پزیشکی بوون لەجیهاندا، لە ئەورووپادا زانایانی وەك (ئیبن سینا) و(ئیبن روشد) جێگەی متمانەی زانایان وفەیلەسوفان بوون بەهاوشێوەی فەیلەسوفە یۆنانییەکان وپشتیان بە کتێبەکانیان دەبەست لە فەلسەفەدا، تەنانەت لەبواری بیناسازی ودروستکردنی کڵێساکانیاندا بە هونەری موسوڵمانان کاریگەر بوون، بوژانەوەی پیشەسازی فەخفوری ودەسترەنگینی لە ئیتاڵیا وفەرەنسا لە سەدەی دوانزەدا هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ موسوڵمانان وبۆ سەردانی پیشەسازە ئیتاڵییەکان بۆ وولاتی ئەندەلوسی ئیسلامی، پیشەکارەکانی ئاسن وشووشە لەشاری ڤینیسیا وبەرگ تێگرەکانی ئیتاڵیا ودروستکەری زرێپۆش وچەکەکان لە

ئیسپانیا ئەمانە هەمووی هونەری پیشەسازییەکانیان لە پیشەکارە موسوڵمانەکان وەرگرت، بەرگدروو وقوماش چنەکانی هەموو ئەورووپا بە ئاواتی سەردنی وولاتانی موسوڵمانەوە بوون بۆ ئەوەی نموونەکان و وێنەکانیان لێیانەوە وەرگرن.

کاریگەریی شارستانێتی ئیسلامی لەسەر ئەورووپا لەرێی چەند کەناڵێکەوە بوو: لەرێی بازرگانی وبازرگانەکانەوە، ولەرێی جەنگەکانی خاچپەرستانەوە، وهەروەها ئەو هەزاران کتێبەی کە لە زمانی عەرەبییەوە وەرگێڕدرانە سەر زمانی لاتینی، هەروەها ئەو گەشت وسەردانانەی کە زانایانی هاوشێوەی (گێربەرت Gerbert) و(مایکل سکۆت Michael Scot) و(ئەدیلار دو باث Adelard du Bath) ئەنجامیاندا بۆ ئەندەلوسی ئیسلامی وکاریگەر بوونیان بە زانیاریی موسوڵمانان، وهەروەها ئەو گەنجە مەسیحییانەی کە باوکە ئیسپانییەکانیان دەیانناردن بۆ خزمەتی کاربەدەستە موسوڵمانەکان بۆ ئەوەی لەوێ پەروەردە بکرێن وفێری سوارچاکی بکرێن، ئەمەش لەبەرئەوە بوو کە پایەدارە موسوڵمانەکان بە کەسانێکی سوارچاك وخاوەن رەووشت وبەئەدەب دادەنران لەگەڵ ئەوەشدا کە موسوڵمان بوون، هەروەها ئەم کاریگەرییە لەرێی پەیوەندی بەردەوامی موسوڵمانان ومەسیحییەکانەوە بوو لە وولاتی شام ومیصر وصقلیە وئیسپانیادا.

هەرجارێکیش تەووژمێکی ئەم کاریگەرییە دەگەیشتە رۆژئاوا یەکسەر بەدوایدا تەووژمێکی تر پەیدا دەبوو لە ئەدەب وزانست وفەلسەفە وهونەری موسوڵمانان ودەگەیەنرایە وولاتە مەسیحییەکان، بۆ نموونە دەتوانین باسی ئەوە بکەین کە کاتێك مەسیحییەکان شاری (طليطلة)یان لە ئەندەلوس داگیرکرد لە ساڵی (١٠٨٥ن)دا زانیارییە فەلەکییەکانیان تەواو زیادی کرد وباوەڕیان بە خڕێتی زەوی چەسپا.

بەلام لەگەڵ ئەم سوود وەرگرتنە زانستییەدا ئاگری بوغز وكینە نەكوژایەوە، بەڵكو ئەوان هیچ كاتێك ئەوەیان لەبیرنەچووەوە كە موسوڵمانان بۆ ماوەی ۳ سەدە زیاتر لە سەركەوتنی بەردەوامدا بوون و وولات لەدوای وولات لە وولاتە مەسیحییەكانیان فەتح دەكرد، هەربۆیە چاوەڕانی پێداكێشان بوون لەگەڵیاندا وئەوەبوو لە جەنگەكانی خاچپەرستەكاندا ئەمە هاتەدی، لەكۆتاییدا رۆژئاوا جەنگەكانی خاچپەرستی دۆڕاند، بەلام ئەم سەركەوتنە هێواشە خوێنێك وهێزێكی زۆری موسوڵمانانی سەرفكرد وهەروەها مەغۆلەكانیش وولاتیانی كاولكرد، كە ئەمانە بووە هۆی ئەوەی كە سەردەمێكی تاریكیان بەسەردابێت كە هەژاری ونەزانی بالادەست بێت، بەلام لەهەمان كاتدا رۆژئاوا دۆڕاندنەكانی خۆی لەبیركرد ولە دوژمنەكانییەوە تینوێتی بۆ زانست وپێشكەوتن وەرگرت، وئەوەبوو كە لەبوارەكانی ژیریی وعەقڵدا تاودانی دەكرد وبەرەو سەردەمی راپەڕین بە هیممەت وعەزیمەتەوە رۆیی.

سەردەمە زێڕینەكانی مێژوو بێگومان ئەو كاتانە بوون كە كۆمەڵگا توانی لە ماوەیەكی كەمدا ئەو ژمارە ئێجگار زۆرەی كەسانی بەناوبانگ وپایەبەرزی بەرهەم هێنا، لە هەموو بوارەكانی: حیكمەت وفەرمانڕەوایی وفێركردن وئەدەب وزمانەوانی وجوگرافیا و مێژوو وبیركاری وفەلەك وكیمیا وفەلسەفە وپزیشكیدا، ئەو سەردەمە ئەو ٤ سەدەیە بوو لەنێوان (هارون الرشید) و(ئیبن روشد)دا كە ئیسلام توانی بەرهەمیان بهێنێت، هەندێك لەم چالاكیانە كاریگەربوون بە زانستی یۆنانییەكان بەلام لە زوربەیدا چالاكییەكی داهێنراوبوو كە نرخەكەی مەزەندە ناكرێت، ئەو لوتكەی رابوونە ئیسلامییە خۆی لەخۆیدا رزگاركردنێكی گەورەی رۆژهەلات بوو.

کەلـەپووری یۆنـانی ورۆمـانی لـە رۆژئـاوادا بـە تـەواوەتی لەبیرچـوو بـووەوە، بـەڵام هەنـدێك لـەم کەلـەپوورە پارێزگـاری لێکـرا بـەهۆی موسـوڵمانانەوە لـە شـارەکانی بەغـدا وقـاهیرە وتـونس وئیسـکەندەریە وقودسـدا، جوولەکـە رۆڵێکـی باشـیان بینـی لـە گواسـتنەوەی کـارە عەرەبییەکان بۆ ئەورووپا ووەرگێڕانی بۆ زمانی عیبری لە سەدەکانی یـانزە ودوانـزە وسـیانزەی زایینیـدا، وەك کتێبـەکانی ئـیبن سـینا ورازی وئـیبن روشد وهەروەها کتێبە فەلەکییەکانی موسوڵمانان، زۆرێك لـەم وەرگێڕانـە عیبرییانەی کتێبە عەرەبییەکان وەرگێڕدران بۆ زمانی لاتینـی وەك کتـێبی (التیسیر)ی (ئیبن زوهر) لە ساڵی (١٢٨٠ن)دا، بەڵام رێڕەوی سـەرەکی کـە بەهۆیەوە گەنجینەی فیکریی ئیسلامی رژایە جیهانی رۆژئاواوە بریتـی بـوو لە وەرگێڕانی راستەوخۆی کتێبە عەرەبییەکان بۆ زمانی لاتینی.

لەو وەرگێڕانە: (قسطنطین الأفریقي) کە کتێبە پزیشـکییەکانی (رازی) وەگێـڕا لـە سـاڵی (١٠٦٠ن)ەوە، هـەروەها لـە شـاری (طلیطلـة) دوای سـەندنەوەی لـە موسـوڵمانان کۆمـەڵێك وەرگێـڕ پەیـدابوون کـە کتێبـە پزیشکی وسروشتییەکانی موسـوڵمانانیان وەرگێـڕا، یـەکێك لـە چالاکترین ئەم کەسانە (حنا الإشبیلي) بوو کـە بـە (إبـن داود) ناسـرابوو (لـە رۆژئـاوا بە Avendeath ناودەبرێت) کە هەسـتا بـە وەرگێڕانـی کتێبخانەیـەکی تەواوله کتێبەکانی ئیبن سینا وغـەزالی وفـارابی وخـەواریزمی، کـە یـان لـە ئەسڵە عەرەبییەکە یان لە وەرگێڕاوە عیبرییەکانیانـەوە وەریـدەگرت، ئـەم وەرگێڕانانە ئەوەندە بڵاوبوویەوە لە ئەورووپادا کە کتێبی وا هەیە ئێسـتاش زیاد لە ٢٠٠ دەستنووسی ماوەتەوە!!

لەو فەیلەسوفانەی کە کتێبەکانیان وەرگێـڕدرا (إبـن جبیرول) بوو(کـە لە رۆژئاوا بـە Avicebron ناسـراوە)، زانایـەکی خـەڵکی بـاث (Bath)

بەناوی ئەدیلارد کە فێری عەرەبی بوو بوو لە (أنطاكیة وطرسوس وطلیطلة) هەستا بە وەرگێڕانی کتێبەکانی خەواریزمی کە بەهۆی ئەمەوە حیسابی سێگۆشەکاری گەیشتە ئەوروپا، (ڕۆبەرت)ی خەڵکی چێستەر هەستا بە وەرگێڕانی کتێبێکی کیمیا لە ساڵی (١١٤٤ز)دا وبەهۆی ئەمەوە ئەم زانستەش هاتە ئەوروپا.

گەورەترین وەرگێڕ بریتی بوو لە (جێرارد)ی خەڵکی (کریمۆنا) کە کاتێك ساڵی (١١٦٥ز) چووە شاری (طلیطلة) زۆر سەرسام بوو بە گەنجینەی موسوڵمانان لە زانستەکان وفەلسەفەدا، هەربۆیە بڕیاریدا کە وەریانگێڕێت بۆ زمانی لاتینی وئەوەبوو ٩ ساڵی کۆتایی ژیانی بۆ ئەم مەبەستە تەرخانکرد، کە بە یارمەتی چەند کەسێك هەستا بە وەرگێڕانی ٧١ کتێب لە کتێبەکانی فەلسەفە وبیرکاری وفەلەك و٤ کتێب لە سروشتزانیدا و١١ کتێبی پزیشکی زانایان (ڕازی وئیبن سینا وفارابی وکیندی) و١٤ کتێبی بیرکاری وهەیئە وسێ کۆمەڵ لە زیجە فەلەکییەکان و٧ دانراوی عەرەبی هەندەسە وفەلەك.

لە دورگەی (صقلیە)ش دوای داگیرکردنی نۆرمانییەکان لە ساڵی (١٠٩١ز)دا نوسراوە عەرەبییەکانی بیرکاری وفەلەك وەرگێڕدران، یەکێك لە بلیمەتترین ئەوکەسانە (میخائیل إسکت) بوو لە سەدەی سیانزەی زاییندا کە هەستا بە وەرگێڕانی کتێبە فەلەکی وبیرکاری وفەلسەفییەکان، کاتێك ئەم وەرگێڕدراوانە گەیشتنە دەستی (ڕۆجەر بیکۆن) وکەسانی تر کاریگەرییەکی گەورەیان کردە سەر جموجوڵی زانستی لە سەدەی سیانزەیەمی زاییندا، لە خوارووی ئیتاڵیاشدا لە شاری (سالێرنۆ) مەوسوعە پزیشکییە قەبەکەی (ڕازی) وەرگێڕدرا بۆ لاتینی لە ساڵی (١٢٧٤ز)دا، ئەم وەرگێڕانانە شۆڕشێکی گەورەیان لە

ئەورووپای لاتینیدا بەرپاکرد، چونکە گەیشتنی ئەم دەقە زانستییانە لە وولاتانی موسولمان وهەروەها لە یۆنانیشەوە بووە هۆی راپەراندنی زانایان لە متبوونیان وچەندین گۆرانکاری نوێ هاتنە کایەوە، پرۆگرامەکانی خوێندن فراوان کران وبوونە هۆی پەیدابوونی زانکۆکان وگەشە کردنیان لە سەدەکانی دوانزە وسیانزەی زایینیدا، دەستەوسانی وەرگێرەکان بۆ دۆزینەوەی ووشەی گونجاو لەکاتی وەرگێراندا بووە هۆی ئەوەی کە زۆرێك لە زاراوە و ووشە عەرەبییەکان بچنە زمانە ئەورووپییەکانەوە، لەمانە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە جەبر وهێمای سفر ویاسای ژمارەی نوێ بەهۆی ئەم وەرگێرانانەوە هاتنە وولاتە مەسیحییەکانی رۆژئاواوە.

یەکێك لە سەرکەوتووترین لقە زانستییەکان رووناکیزانی (علم البصريات) بوو کە بەهۆی وەرگێرانی کتێبێکی (إبن الهيثم) بۆ لاتینی ئاسۆی نوێی لە رۆژئاوادا کردەوە، یەکێك لە بۆچوونە باوەرپێکراوەکان داهێنانی دەرزی موگناتیسیی قیبلەنوما دەداتە پاڵ موسولمانان، کە بۆ یەکەمجار لە رێنیشاندانی کەشتییەکانیان لە دەریادا لە ساڵی (١٠٩٣ن)دا بەکارهاتووە.

لە سەدەی سیانزەیەمی زایینیدا چەندین قوتابخانەی پزیشکی لە شارەکانی (پۆلۆنیا وبروچیا ورۆما ومۆنپلییە وپاریس وئۆکسفۆرد) دروستکران، کە بۆچوونە پزیشکییەکانی موسولمانان ویۆنان بربرەی پشتی پرۆگرامەکانیان بوو، زانستی پزیشکی تیۆری وپراکتیکی بەتەواوەتی پێشکەوت بەهۆی وەرگێرانی کتێبەکانی موسولمانانەوە، زانستی فەلەکی موسولمانان کاریگەرییەکی گەورەی دروستکرد تەنانەت لە بۆچوونە ئاینییەکانیشدا، کە بە ئاشکرا ئەم کاریگەرییە گەورەیەی

(ئیبن سینا وئیبن روشد وفارابی) لە کارەکانی (کۆپەرنیکۆس) و(رۆجەر بیکۆن)دا دەبینرێت، ئەوەتا (رۆجەر بیکۆن) خۆی دەڵێت: ئێمە فەلسەفەمان لە موسوڵمانانەوە بۆ هاتووە، ئا بەم شێوەیە موسوڵمانان ئەم زانستانەیان گێڕایەوە بۆ ئەوروپا، ئەم وەرگێڕانانە هانی عەقڵییەتەکانی ئەوروپایدا بۆ بیرکردنەوە وگەڕان، وناچاری کرد کە ئەو پەیکەرە عەقڵییە گەورەیە دابمەزرێنێت، ئیتر بەم شێوەیە یاسای فەلسەفی سەدەکانی ناوەڕاست لە سەدەی چواردەیەمی زاییندا داڕووخا وفەلسەفەی نوێ دەستی پێکرد کە سەرەتای سەردەمی رابوونی ئەوروپا (عصر النهضة) بوو.

ئەمەی سەرەوە کورتەیەك بوو لە شایەتی زانایەك ومێژوونووسێکی ناسراوی سەردەمی خۆمان لەسەر پێشدەستی وکاریگەریی زانستەکانی موسوڵمانان لەسەر پێشکەوتنی هەموو لقەکانی زانست لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا، کە وابزانم زۆر روون وئاشکرایە لەگەڵ ئەوەشدا کە حەزدەکەم خوێنەری بەڕێز بزانێت کە هەموو راستییەکانی نەهێناوە وبە تەواوەتی لە هەموو لایەکەوە راستییەکانی تۆمار نەکردووە ولە هەندێك شوێنیشدا کەوتۆتە هەڵەوە، بەڵام ئەمەندەی کە باسی کردووە شایەتییەکی ناوازە تۆمار دەکات لەم بوارەدا.

بابزانین هەر ئەم زانایە نییە کە دانیناوە بە پێشدەستی موسوڵماناندا لە بواری زانستەکاندا، بەڵکو چەندینی تر لەبەرئەوەی بابەتەکە روون وئاشکرا وسەلمێنراوە هەمان شایەتییان تۆمار کردووە، کە هەوڵ دەدەین لەکاتی باسەکاندا نموونە لەو شایەتییانە بێنینەوە ولە کۆتایی کتێبەکەشدا بە یارمەتی پەروەردگار بەشێکی تایبەت بە باسکردنی زۆرێك لە شایەتی ئەو زانایانە تەرخان دەکەین، بۆ ئەوەی بەروونی دەرکەوێت

کە زۆرێك لەو زانایانەی کە بە هیچ شێوەیەك ئیسلامیشیان نەناسیوە بەڵام بە تێڕوانینی شارستانێتی ئیسلامی ودەستکەوتەکانی لەمێژوودا شایەتی خۆیان لەسەر پێشدەستی موسوڵمانان تۆمار کردووە[115] .

## خشتەیەك کارە پزیشکییە سەرەکیەکانی موسوڵمانان
## کە وەرگێڕدراون بۆ لاتینی دەردەخات

کتێبەکان بە زمانی عەرەبی

| وەرگێڕاوەکان الترجمات | الأصل في اللغة العربية | وەرگێڕەکان المترجمون |
|---|---|---|
| IOHANNITIUS<br>*Isagoge ad Tegni Galeni* (éd. G. Maurach, 1978) | حنين بن اسحق وحبيش<br>مسائل في الطب (S، ص ٢٤٩ ـ ٢٥٠) | قسطنطين الأفريقي؟<br>مجهول. ايطاليا الجنوبية. القرن الحادي عشر<br>CONSTANTIN L'AFRICAIN?<br>Anonyme. Italie du Sud. XI^e s. |
| ISAAC ISRAELI<br>*Liber de febribus* (éd. Lyon, 1515)<br>*Liber de dietis universalibus et particularibus* (éd. Lyon, 1515)<br>*Liber de urinis* (éd. Lyon, 1515 et J. Peine, 1919) | اسحق بن سليمان الإسرائيلي<br>كتاب الحميات (S، ص ٢٩٦)<br>كتاب الأغذية (S، ص ٢٩٦)<br>كتاب البول (S، ص ٢٩٦ ـ ٢٩٧) | قسطنطين الأفريقي<br>إيطاليا الجنوبية. القرن الحادي عشر<br>CONSTANTIN L'AFRICAIN<br>Italie du Sud. XI^e s. |
| CONSTANTINUS AFRICANUS<br>*Liber de oculis* (éd. Lyon, 1515 et P. Pansier, fasc. 7, 1909-1933) | حنين بن اسحق<br>تركيب العين (S، ص ٢٥١) | |
| CONSTANTINUS AFRICANUS<br>*Pantegni* (éd. Lyon, 1515) | علي بن العباس المجوسي<br>كامل الصناعة الطبية (S، ص ٣٢١) | |
| CONSTANTINUS AFRICANUS, RUFUS<br>*De melancolia* (éd. K. Garbers, 1977) | اسحق بن عمران<br>المقالة في الماليخوليا (S، ص ٢٦٦) | |
| CONSTANTINUS AFRICANUS<br>*Viaticum* (éd. Lyon, 1515)<br>*De gradibus* (éd. Lyon, 1515)<br>CONSTANTINUS AFRICANUS<br>*Liber de stomacho* (éd. Lyon, 1515)<br>*De elephantiasi* (éd. Lyon, 1515)<br>*De coitu* (éd. E. Montero Cartelle, 1983)<br>*De oblivione* (éd. Lyon, 1515) | ابن الجزار<br>زاد المسافر وقوت الحاضر (S، ص ٣٠٥)<br>كتاب اعتماد الأدوية المفردة (S، ص ٣٠٤)<br>ابن الجزار؟<br>كتاب المعدة (S، ص ٣٠٦)<br>كتاب الجذام (S، ص ٣٠٧)<br>زاد المسافر، VI (S، ص ٣٠٥ ـ ٣٠٦)<br>[مؤلف إلى سلطان في النسيان] (S، ص ٣٠٦) | |
| IOHANNIS DAMASCENI<br>*Aphorismi* (éd. D. Jacquart et G. Troupeau, 1980) | يوحنا بن ماسويه<br>نوادر الطب (S، ص ٢٣٣) | مجهول، إيطاليا<br>القرنان الحادي عشر ـ الثاني عشر |

[115] هەندێکیان شکست هێنانەکانی موسوڵمانان لە هەندێك شوێندا بۆ بڵاوکردنەوەی شاین وشارستانییەتەکەیان بە نوشستی ونەگبەتی هەموو مرۆڤایەتی دەزانن، دەبا گوێ لە یەکێك لە زاناکانیان بگرین کە لە ووتەیەکیدا دەڵێت: بەهۆی شکستهێنانی موسوڵمانان لە جەنگی (بلاط الشهداء)دا ئەورووپا ماوەی (٢٠٠٠) ساڵ دواکەوت، واتە ئەگەر موسوڵمانان لەو جەنگەدا سەربکەوتنایە کە ساڵی (٧٣٢ز) لە خوارووی فەرەنسا لە نێوان هەردوو شاری (پور) و(بواتیە)دا روویدا کە موسوڵمانان لە ئەندەلوسەوە هاتبوون بۆ فەتحی فەرەنسا بە سەرکردایەتی (عبدالرحمن الغافقي) وئەورووپییەکانیش بە سەرکردایەتی (شارل مارتل) بوون، ئەم زانایە دەڵێت ئەگەر موسوڵمانان سەربکەوتنایە وفەتحی ئەورووپایان بکردایە ئێستا ئەورووپا ٢٠٠٠ ساڵی تر پێشکەوتووتر دەبوو! !.

| | | |
|---|---|---|
| | أبو الصلت<br>كتاب الأدوية المفردة (U، ص ٢٧٦) | ALBUZALI<br>*De medicinis simplicibus* (TK, 801) |
| بروفاتيوس وبرناردوس هونوفريدي<br>مونبوليه، القرن الثالث عشر<br>PROFATIUS et BERNARDUS HONOFREDI<br>Montpellier, XIIIs. | ابن زهر<br>كتاب الأغذية (U، ص ٢٠١) | AVENZOAR<br>*De regimine sanitatis* (TK, 187) |
| أرمانغو بلاز<br>مونبوليه، القرن الثالث عشر<br>ARMENGAUD BLAISE<br>Montpellier, XIIIs. | ابن سينا ـ ابن رشد<br>الأرجوزة في الطب (U، ص ١٥٥ ـ ١٦٧) | AVICENNA - AVERROES<br>*Cantica cum commento* (éd. H. Jahier et A. Noureddine, 1956; Venise, 1523) |
| جان دو كابو؟ وجاكوب<br>پادو، القرن الثالث عشر<br>JEAN DE ÇAPOUE? et Jacob<br>Padoue, XIIIs. | ابن زهر<br>كتاب التيسير (U، ص ١٦٣) | AVENZOAR<br>*Theisir*, trad. faite d'après l'hébreu (éd. Venise, 1490) |
| فرج بن سالم<br>صقلية، القرن الثالث عشر<br>FARAJ BEN SALEM<br>Sicile, XIIIs. | الرازي<br>الحاوي (S، ص ٢٧٨ ـ ٢٨٠) | RASIS<br>*Continens* (éd. Brescia, 1486) |
| صقلية، القرن الثالث عشر<br>Sicile, XIIIs. | ابن بطلان<br>كتاب تقويم الصحة (U، ص ١٥٧) | IBN BOTLAN, ELLUCHASEM ELIMITHAR<br>*Tacuinum sanitatis* (éd. Strasbourg, 1531) |
| سيمون دو جان<br>أبراهام تورتوينسيس<br>إيطاليا القرن الثالث عشر<br>SIMON DE GÊNES<br>ABRAHAM TORTUENSIS<br>Italie, XIIIs. | ابن سرابيون المزعوم<br>؟ (U، ص ٢٨٣ ـ ٢٨٤) | SERAPIO<br>*Liber de simplicibus medicinis* (éd. Venise, 1479) |
| | الزهراوي<br>التصريف لمن عجز عن التصنيف (S، ص ٣٢١<br>٢٨ | ALBUCASIS<br>*Liber servitoris* (éd. Venise, 1471, rep. dans M. Engeser) |
| ؟<br>جان جاكم<br>ليريدا؟ القرن الرابع عشر<br>JEAN JACME<br>Lérida?, XIVs. | ؟<br>(U، ص ٢١١، ٢١٢، ٣١٨) | ALCOATI<br>*Congregatio sive liber de oculis* (éd. P. Pansier, fasc. 2, 1903)<br>*Liber de la figura del uyl*, version catalane (éd. L. Deztany et J. M. Simon de Guilleuma, 1933) |

سەرچاوە : ( موسوعة تاريخ العلوم العربية ).

لێرەدا پـێم باش بـوو کـەمێك بـە دوور ودرێـژی دەربـارەی ژیاننامـە و کارەکـانی پۆلێـك لـە زانـا موسـوڵمانە دیـار و بەناوبانگـەکان لـە هـەموو لقەکانی زانستدا بـدوێم، دیـارە ئەمانـە چـەند نموونەیـەکی کـەمن لـە زانـا موسـوڵمانەکان و لـە بەشـی پێشـتردا چـەندین نـاوی تـر هـاتوون کـە لێرەدانین، ئەمـەش بـە ئومێدی رەواندنـەوەی زیـاتری ئـەو تـەم و مـژەی دراوە بەسـەر رۆڵـی پرشـنگداری زانـا موسـوڵمانەکان لـەبوارە زانسـتییە جۆراوجۆرەکاندا.

با خوێنەری بەڕێز ئاگادار بێت کە ئەو زانایانەی لێرەدا ناویـان هـاتووە تەنها ئەوانەن کە لە بواری زانسـتی تاقیکاریـدا پێشدەسـتی و داهێنانیـان کـردووە، ئـەگینا چـەندین کەڵـەزانای تـر هەڵکـەوتوون لـە بوارەکـانی: (تەشریع) و (دەستوور) و (یاسا دانـان) و (تیۆرەکـانی پـەروەردە) و .... هتد.

لەلایـەکی تـرەوە داهێنـان و پێشدەسـتی زانـا موسـوڵمانەکان لـە دوو خاڵدا خۆی دەبینێتەوە:

١- وەرگـرتن و تێگەیشـتنی بیروبۆچـوونی کەسـانی پـێش خۆیـان و پاراستنیان لە فەوتان، و هەروەها رەخنەگرتن و راستکردنەوەی بۆچـوونە هەڵەکانیان و دەرخستنی راستییەکان.

٢- داهێنـان و دۆزینـەوەی نـوێ کـە پێشـتر نـەزانراوە، دیـارە ئـەم هەوڵانەیان وەك لە درێژەی ژیانی زانـا موسوڵمانەکاندا دەبیینین بەپلـەی یەکـەم بەرهـەمی پاشـخانە ئیسـلامییەکەیان بـووە لەلایـەك و لەلایـەکی تریشەوە بەرهەمی تێڕوانین و لێکۆڵینەوەی خودی خۆیان بووە.

ئێستاش فەرموون ئێوە و پۆلێك لەو زانا بەڕێزانە:



محمد بن موسى الخوارزمي

## خەواریزمی:

وەك پێشتر باسمان کرد ناوی (أبوجعفر محمد بن موسى الخوارزمي)یە، لە سەدەی دووەم و سێیەمی کۆچیدا ژیاوە (٢٣٢ك-٨٤٨ز مردووە)، و زانایەکی هەڵکەوتووی بواری بیرکارییە لە مێژوودا، یەکەم کەسە کە کتێبی لەسەر زانستی (جەبر) داناوە، کە ئەم ناوە خۆی دایهێناوە، توانی هاوکێشە پلە دووەکان شیکاربکات.

گرنگترین کتێبەکانی بریتین لە: (كتاب الزيج) کە دوو بەرگە و (كتاب العمل بالإسطرلاب) لە گەردوونزانیدا، (صورة الأرض) و (تقويم البلدان) لە جوگرافیادا، و (الجبر والمقابلة) و (كتاب الهندسة) و (الحساب الهندي) لە بیرکاریدا، کە تێیدا رووبەری شێوەکانی وەك: بازنە و سێگۆشە و چوارگۆشە و مەعین و برگەکەی دیاری کردووە، یاسای لۆگاریتمی گشتی داناوە کە تا ئەمڕۆ بەناوی ئەوەوەیە، و ئەو بنەما بیرکارییانەی کە دایناون لە زۆرێك لە زانستەکانی ئەمڕۆدا بەکاردێن بە تایبەتی لە زانستی فەزا و فڕۆکەوانیدا، زانایانی رۆژئاواش دانیان بە لەپێشدەستی و کارە گەورەکانیدا ناوە، (خەواریزمی) یەکەم کەس بووە کە بەووردیی (سفر)ی بەکارهێناوە لە شیکارکردنی هاوکێشە بیرکارییەکاندا، کە کەسانی ماتماتیکی سوودیان لێ وەرگرت و وای لێکردن کە بتوانن هاوکێشە درێژەکان شیکار بکەن، و یەکەم کەس بووە کە پەیوەندی نێوان (جەبر) و (هەندەسە)ی دۆزیوەتەوە، هەروەها بەکارهێنانی هاوکێشە جەبرییەکان بۆ شیکار کردنی بابەتە هەندەسییەکان، و یەکەم کەس بووە بنچینەکانی شیتەڵ کردنی هەندەسی داناوە.

## صوفی:

ناوی (أبوالحسن عبد الرحمن بن عمر الرازي الصوفي)یە، لە سەدەی چوارەمی کۆچیدا ژیاوە (۲۹۱-۳۷٦ك) (۹۰۳-۹۸٦ن) و لە شاری (رەی و شیراز و ئەصفەهان) کاری کردووە، لە بواری زانستی فەزا و فەلەکدا پلە و پایەیەکی بەرزی بەدەست هێناوە بەهۆی تێبینی کردنی ووردی بۆ زۆرێك لە ئەستێرەکان، (سارتۆن) بە مەزنترین گەردوونزانانی ئیسلام وەسفی کردووە، لە گرنگترین کتێبەکانی بریتین لە:

(کتاب صور الکواکب الثابتة) کە کتێبێکی وێنەدارە و وێنەی ئەستێرە و هەسارەکانی تێدایە لەسەر شێوەی مرۆڤ یان ئاژەڵەکان، وەسفێکی وورد و تەواوی کۆمەڵە ئەستێرەکانی ئاسمانی تێدایە (بە ۱۲ بورجەکەوە) ئەم کتێبەی وەك دیارییەك دانا بۆ فەرمانڕەوای بوەیهی (عضد الدولة)، هەروەها کتێبەکانی:

(الأرجوزة في الکواکب الثابتة)، و (کتاب التذکرة)، و (العمل بالأسطرلاب) لە دانراوی ئەون.

گرنگترین کارەکانی ئەوەیە کە ئەم یەکەم کەس بووە کە گەلەستێرەی (ئەندرۆمیدا)ی لەسەر نەخشەی ئاسمان دیاریکردووە (کە ئەمڕۆ بە هەڵە دراوەتە پاڵ کەسانی تر)، ئەویش بەپێی سنوورەکانی بازنەی بورجەکان، کە ئەو ئەنجامانەی پێی گەیشت ئەمڕۆ زانایان بەهۆی بەکارهێنانی مانگە دەستکردەکانەوە زۆریان پشتڕاست کردۆتەوە، کتێبەکانی ئەم زانایایە بە یەکێك لە سەرچاوە گرنگەکانی گەردوونزانی نوێ دادەنرێن، (سارتۆن) دەڵێت: کتێبی (الکواکب الثابتة)ی صوفی بە یەکێك لە ۳ کتێبی سەرەکی گەردوونزانی موسوڵمانان دادەنرێت.




## بەتتانی:

ناوی (أبو عبدالله محمد بن سنان الحرّاني الصابيء)ە، لە (٢٤٤-٣١٧ك) بەرامبەر بە (٨٥٨-٩٢٩ز)دا ژیاوە، لەلای ڕۆژئاواییەکان بە (Albategni یان Albatenius) ناسراوە و یەکێکە لە گەورەترین زانایانی گەردوونی موسوڵمان، بنەماڵەکەی لە بیروباوەڕی (الصائبة) بوون هەربۆیە بە (الصابيء) ناسراوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە خۆی کەسێکی موسوڵمان بووە.

ئەم زانایە بەناوبانگ بووە بە لێکۆڵینەوە فەلەکی و بیرکارییەکانی و بە تێڕوانین کردنی ئەستێرەکان، زۆر بیردۆزەی داناوە لەبواری فەلەکدا، یەکەم کەس بووە کە خشتەکانی (سایە تەواو- الظل التمام)ی داناوە، بەناوبانگ بووە بە تێڕوانینی ئەستێرەکان و تێبینی کردنیان، زۆر هەڵەی کتێبی (المجسطي)ی زانا (بەتلیمۆس)ی ڕاست کردۆتەوە، زۆرێك لەوانەی کە ژیاننامەکەیان نووسیوە دەڵێن ئەم کارانەی بۆیە ئەنجامداوە بۆ دەرخستنی تاك و تەنهایی خودا و حیکمەت لە دروستکراوەکانیدا[116]، لە پێشەکی یەکێك لە کتێبە فەلەکییەکانیدا دەڵێت: {ئەوەی لەم تێڕوانینە وورد و بیرکردنەوە بەردەوامەی لە دروستکراوەکان دەستمان دەکەوێت

---

[116] هەندێك کەس ڕەخنەیان لە بیروباوەڕی ئەم زانایە گرتووە، بەلام بۆ سەلماندنی ئەم شتانە دەبێت بگەڕێینەوە بۆ ووتەی زانا سەر ڕاستەکانی موسوڵمانان، بەلام بەهەرحاڵ ئەوەی من مەبەستمە لە باسکردنی کارەکانی ئەم زانایە و زانایانی تری ناو ئەم کتێبە بریتییە لە دەرخستنی ڕۆڵی موسوڵمانان و ئەوانەی لە سایەی دەوڵەتی ئیسلامدا ژیاون لە پێشکەوتنە زانستییەکاندا، دەبا خوێنەری بەڕێز ئاگاداری ئەمە بێت و لە هەموو کەسێك شتە باشەکانیان وەرگرێت و واز لەوانەی تریان بهێنێت.

بریتییه له سه‌لماندنی یه‌کتاپه‌رستی بۆ خودا، و درك کردنه به گه‌وره‌یی ده‌سه‌لاتی په‌روه‌ردگار و فراوانیی حیکمه‌تی و تۆکمه‌یی دروستکراوه‌کانی و ورده‌کارییه تێیاندا}، په‌روه‌ردگار ده‌فه‌رموێت: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لآيَاتٍ لِّأُوْلِي الألْبَابِ﴾ (آل عمران:١٩٠)، واته: به‌دڵنیاییه‌وه بزانن له دروستکردنی ئاسمان و زه‌وی و جیاوازی نێوان شه‌و و رۆژدا چه‌ندین به‌ڵگه‌ی تێدایه بۆ ئه‌وانه‌ی که خاوه‌نی ژیرین و بیرده‌که‌نه‌وه.

ئه‌م زانایه به زانست و ئارامیی و خۆبه‌که‌م زانین ناسراوه، له گرنگترین کتێبه‌کانی بریتییه له (الزيج الصابيء)، که له ئه‌وروپادا به به‌ربلاویی به‌کار ده‌هێنرا، و چه‌ندین جار وه‌رگێردراوه و له چاپ دراوه‌ته‌وه، له گرنگترین بابه‌ته‌کانی دیاریکردنی وردی پێوانه‌ی لاریی خولگه‌ی بورجه‌کانه له خولگه‌ی رێژه‌یی رۆژ، و به‌ش به‌ش کردنی ئه‌م لارییه، که حیسابی کرد و بینی بریتییه له (٢٣.٥ پله)، که نوێترین پێوانه فه‌له‌کییه‌کان ده‌ریانخست که راستی کردووه له‌م پێوانه‌یدا (به جیاوازی ته‌نها به‌شێك له پله‌یه‌ك نه‌بێت)، ئه‌مه ئه‌نجامێکی زۆر سه‌رنج راکێشه ئه‌گه‌ر ئێمه حیسابی جیاوازی سه‌رده‌مه‌کان و ئامێره به‌کارهاتووه‌کان بکه‌ین، هه‌روه‌ها پێوانه‌ی ساڵی شه‌مسی کردووه به وردیی له‌گه‌ڵ وه‌رزه‌کاندا، و جیاوازی نێوان پێوانه‌که‌ی ئه‌و و پێوانه‌ی نوێی ئه‌مڕۆ ته‌نها ٢ ده‌قیقه‌یه!

هه‌روه‌ها خولگه‌ی حه‌قیقی و ناوه‌ندیی خۆری دیاریکردووه، و زۆر به وردیی لادانی بازنه‌ی خۆرگیرانی دیاریکردووه، بیردۆزێکی نوێی زیره‌کانه‌ی داناوه بۆ ئه‌و بارانه‌ی که مانگی تێدا ده‌بینرێت له کاتی

لەدایکبوونیدا، زۆر تێڕوانینی بەنرخی هەیە لەسەر خۆرگیران و مانگگیران کە زانا (دنثورن Dunthorne) ساڵی (١٧٤٩ن) پشتی پێبەست بۆ دیاریکردنی خێرابوونی جووڵەی مانگ لە ماوەی سەدەیەکدا، زۆر شیکاری ناوازەی پێشکەش کردووە بۆ مەسەلەکانی سێگۆشەکاری، کە ئەم شیکارانە (رجیومونتانس Regiomontanns)ی بەناوبانگ پێیزانیوە و لەسەریان ڕۆیشتووە لە شیکارەکانی خۆیدا.

کتێبەکەی بەتتانی (الزيج الصابيء) گەورەترین کاریگەریی هەبووە لەسەر زانستی فەلەك لە ڕۆژئاوادا، و بە تەواوەتی وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی لاتینی لە سەدەی دوانزەیەمی زایینیدا و پاشان بۆ ئیسپانی لە سەدەی سیانزەیەمدا، بەناوی (Albategni یان Albatenius) ناسراوە و ئەم کتێبەی تا سەردەمانێکی نزیك لە زانکۆکانی ئەوروپادا دەخوێنران، ئەم زانا موسوڵمانە لەلایەن ئەوانەی کە نوسراویان لە بواری مێژووی زانستی فەلەکدا هەیە بە گەورەترین و بلیمەتترین زانای فەلەك تا سەردەمی خۆی ناوزەد کراوە، ئەم زانایە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشدا لە کۆمەڵە زانستییەکاندا بەردەوام ناوی دەهێنرێت و دەستکەوتەکانی باس دەکرێت، تەنانەت لەبەر بەرزیی پلە و پایەکەی یەکێك لە دۆڵەکانی سەر ڕووی مانگ بەناوی ئەمەوە ناونراوە.

زانای فەلەکی فەرەنسی ناسراو (لالند Lalande) بە یەکێك لەو (٢٠) گەردوونزانە دیارانەی دادەنێت کە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا دەرکەوتوون، هەندێکی تر لە کتێبە دانراوەکانی بریتین لە:

١- کتێبی (معرفة مطالع البروج فيما بين أرباع الفلك): ئەم کتێبە بەشێوەیەکی بیرکارییانە لایەنەکانی بینینی ئەستێرەکان شیکاردەکات.

٢- (رسالة في تحقيق أقدار الإتصالات): واتە شيكاری وورد بۆ هەسارەگەری بە بەکارهێنانی سێگۆشەکاری، کە کتێبێکی ووردی هەندەسە و گەردوونزانییە..

٣- (الزيج الصابيء): کە گرنگترین دانراوەکانێتی، و ئەنجامی تێبینی و تێڕوانینەکانی ساڵانی تەمەنی بەتتانی تێدایە.

٤- (شرح المقالات الأربع لبطليموس).

## بوزجانی:

ناوی (أبوالوفاء محمد بن يحيى بن إسماعيل البوزجاني)یە، و لە سەدەی چوارەمی کۆچیدا ژیاوە (٩٤٠-٩٩٨ن)، دانەری یەکەم کتێبە لەبواری وێنە هەندەسییەکاندا، کتێبەکەی کە بەناوی (عمل المسطرة والبركال والكونيا)یە وەرگێڕدراوە و لەلایەن رۆژئاواییەکانەوە کاری پێکراوە، رێگەیەکی گرنگی دۆزییەوە بۆ شیکارکردنی هاوکێشەکانی (تەژێ)، یەکەم کەس بووە کە رێژەی سێگۆشەیی یان (سایە)ی داناوە و یەکەم کەس بووە کە بەکاری هێناوە بۆ شیکارکردنی مەسەلە بیرکارییەکان.

رۆژئاواییەکان دەستپێشخەری ئەمیان پشتگوێ خست، کاتێکیش کە زانایان جیاوازییان هەبوو لە پێوانەی خەلەل لە جووڵەی مانگدا، و ئەم بابەتەیان لە ئەکادیمیای زانستی فەرەنسیدا موناقەشە کرد لە سەدەی نۆزدەیەمدا، لە کۆتاییدا زانینی رێژەی راستی ئەم خەلەلەیان دایە پاڵ گەردوونزانێکی دانیمارکی، ئەمەش پێش ئەوەی کە لێکۆڵەرەوان لە دواییدا بیسەلمێنن کە زانای موسوڵمان (بوزجانی) پێش سەدان ساڵ

پـێش گەردوونزانـە دانیمارکییەکـە زانیویـەتی و پێوانـەی کـردووە، وەك زۆرێکی تـر گەردوونزانـە دانیمارکییەکـە ئـەم دۆزینەوەیـەی موسـوڵمانانی داوەتە پاڵ خۆی، کە ئـەم دۆزینەوەیە گرنگیی هـەرە گـەورەی هەیـە لـە گەردوونزانیدا، و هەروەها ئەم راستییە دەیسەلمێنێت کە (کیپلـەر) یەکـەم کـەس نـەبووە کـە بلێـت هەسـارەکان و پاشـکۆکان لـە خولگەکانیانـدا دەسـوورێنەوە بـەڵکو زانـای موسـوڵمان (بوزجـانی) بـووە کـە حیسـابی خەلەلی سووڕانەوەی مانگی لە خولگەکەیدا کردووە.

لە کتێبەکانی (بوزجانی) بریتین لـە: (کتـاب فیمـا یحتـاج إلیـة الصـناع من أعمال الهندسة) کە لە کتێبخانەی (ئایا صۆفیا) لـە تورکیـا پـارێزراوە، و کتـێبی (الـدائرة مـن الفلـك) و کتـێبی (المجسـطي) کـە لـە کتێبخانـەی نیشتمانی لە (پاریس) پارێزراوە.


أبو علي محمد بن الحسن بن الهيثم .
رائد علم البصريات

## ئیبنولهەیسەم:

نـاوی (أبـوعلي الحسـن بـن الحسـن بـن الهیـثم)ە، و لـە سـەدەی پێنجـەمی کۆچـیدا ژیـاوە (٣٥٤ تـا ٤٣٠ك) (بەرامبـەر بـە:٩٦٥-١٠٣٩ز)، لـە شـاری بەسـرە لـەدایکبووە و زانستەکانی سەردەمی خۆی خوێندووە لە فەلسەفە و زانستەکانی سرشت و بیرکاری و پزیشـکی، پاشـان چـووە بـۆ میسـر لە سـەردەمی خەلیفـەی فاتیمی (الحـاکم بـأمر الله)دا، ئیبنولهەیسـەم پرۆگرامـی چـاودێری کـردن و خوێندنـەوەی بـەکاردەهێنا، ئـەم زانایـە لەسـەر رووونـاکی لێکۆڵینـەوەی کردووە، بە تایبـەتی ئـەو بەشـەی کـە ئـەمڕۆ پێـی دەڵێن رووناکیزانیی

هەندەسی (البصريات الهندسية)، کە لە بەناوبانگترین کتێبەکانیدا کە بریتییە لە (کتاب المناظر) باسی لێوە کردووە، خاوەنی زیاتر لە ٢٠٠ دانراوە کە ٤٧ دانەیان لە بیرکاری و سروشتزانیدا بووە، و ئەوانی تری لە بوارە جۆراوجۆرە زانستییەکانی تردا داناوە.

گرنگترین بۆچوونەکانی ئەم زانایە لە بواری هاوێنەسازی و رووناکیزانیدایە (علم البصريات)، کە لێکۆڵینەوەی کردووە لەسەر دیاردەی شکانەوەی رووناکی و گەڕانەوەی رووناکی لە ئاوێنەکانەوە، جا چ تەخت بن یان ئاوێنەی گۆیی (چاڵ و قۆقز) یان لوولەیی بن و چۆنێتی دروست بوونی وێنە تیایاندا، بۆچوونەکانی تا ئەمڕۆش لە هەموو زانستەکاندا بەکاردێن بەتایبەتی لە بواری فەلەکدا، تەلسکۆب و بینگەی ئاسمانی هەبڵ (Hubble space telescope) و تەلسکۆبی فەزایی ئەورووپی بۆچوونەکانی ئەویان بۆ بەکارهێنراوە لە بواری هاوێنەسازیدا.

بۆچوونەکانی ئەم شۆڕشێکیان بەرپاکرد لە بواری بینین و رووناکیدا، کاتێك خەڵکی تا سەردەمی ئەو (بە تایبەتی زانایانی یۆنانی کۆن) وایاندەزانی کە بینین روودەدات بەهۆی دەرچوونی رووناکی لە چاوەوە بۆ شتەکان و پاش گەڕانەوەی بۆ چاو جارێکی تر مرۆڤ دەتوانێت بیانبینێت، بەڵام ئەم بە پێچەوانەوە سەلماندی کە بینین بەهۆی دەرچوونی فاکتەرەکان لە چاوەوە نابێت بەڵکو بەهۆی ئەو رووناکییەوە دەبێت کە لە تەنەکان خۆیانەوە دەردەچێت و دەچێتە ناو چاوەوە، و ئەم بیردۆزەی بە چەندین تاقیکردنەوەی کرداری لە کتێبی (المناظر)دا سەلماندووە (ساڵی ٤١١ك-١٠٢١ز ئەم کتێبەی تەواو کردووە)، ئەم

بۆچـوونانەی (ئیبنولهەیسـەم) بنـەمابوون بـۆ لێکۆڵینـەوەکانی دواتـر لـە بـواری بینینـدا بەتایبـەتی لێکۆڵینـەوەکانی: (ئـەلبێرتی گـەورە) (١٢٨٠ز مردووە)، و رۆجەر بیکۆن و زانایانی دوای ئەمان.

هەروەها وەسفی پێکهاتەی چاوی کردووە لە رووی: توێکاری وەسفی (کە بە وورد ی بەشـەکانی چـاو لـە: دەمـاری چـاو و بەشـەکانی نـاوەوە و هاوێنە و رەشێنەی شیکردۆتەوە لەگەڵ کێشانی وێنەی وورد لەم بوارەدا) و توێکاری وەزیفی (کارەکانی بەشەکانی چاو)، گەیشتۆتە ئـەو راستـییەی کە ئەو وێنانەی چاو دروستی دەکەن لەسـەر تـۆڕی چـاو (الشـبکیة) چـاپ دەبێـت! لـە زانـا ناودارەکـانی تـر لـەبواری توێکـاری و کـاری چـاوەکان (الـرازي) بـووە کـە گەیشـتۆتە ئـەو راسـتییەی: کـاری رەشـێنەی چـاو میکانیزمێکی تایبەتی هەیە بۆ رێکخسـتنی چـوونە نـاوەوەی روونـاکی بـۆ چاوەکان و پاشان بینینی شتەکان.

هــەروەها ئیبنولهەیسـەم زانیویـەتی کـە روونــاکی خێرایــی هەیـە و ئاماژەی بەوە داوە کە لەگەڵ ئەوەشـدا روونـاکی زۆر بـە خێرایـی دەڕوات بەڵام پێویستی بـە ماوەیـەك هەیـە بـۆ ئـەوەی لـە شـوێنێکەوە بچێت بـۆ شوێنێکی تر، لە مێژووی هاوێنەسازی و رووناکیـدا بابـەتێك هەیـە بـەناوی ئەمەوە نـاونراوە لـە بـواری تیشـکدانەوەدا، ئـەم زانایـە لـە رۆژئـاوا زیـاتر بـەناوبانگ بـووە وەك لـە رۆژهـەڵات، و لـە نزیکـەی حـەوت سـەدە پـێش ئێستاوە ناسراوە.

هەروەها رەخنەی زۆری لە بۆچـوونە هەڵـەکانی (بـەتلیمۆس)ی یۆنـای گرتـووە لـەبواری فەلەکـدا، و زۆر شـتی نادیـاری روون کردۆتـەوە و بـۆی راستکردۆتەوە بەتایبەتی لە کتێبێکیدا بەناوی (الشکوك علی بطلیموس).

(جۆرج سارتۆن) لە کتێبەکەیدا کە بە ناوی (زانستی کۆن و مەدەنییەتی نوێ)یە دەربارەی (إبن الهیثم) دەڵێت: بریتییە لە گەورەترین زانای سروشتزانی موسوڵمان، و یەکێکە لە گەورەترین ئەو زانایانەی کە بە رووناکیزانییەوە خەریك بووە لە هەموو سەردەمەکاندا، بنەمای رەووشتی لای (إبن الهیثم) بریتی بووە لە پێشخستنی هەق و راستی نەك دواکەوتنی هەوا و ئارەزووەکان، کە ئەمە بریتییە لە رەووشتی زانای پایەدار و رێزدار، ئەمڕۆ ئەم زانایە بە نموونە دادەنرێت لەدوای تێپەڕبوونی نزیکەی ١٠٠٠ ساڵ.

لە گرنگترین دانراوەکانی لە هەموو بوارەکانی زانستدا ئەمانەن:

مقالة في كيفية الأرصاد، مقالة في ضوء القمر، مقالة في قوس قزح والهالة، مقالة في رؤية الكواكب، مقالة في السمت، مقالة في أضواء الكواكب، مقالة في صورة الكسوف، مقالة في حركة القمر.


أبو الريحان البيروني
العالم في رأس حكم

## بەیروونی:

ناوی (أبوالریحان محمد بن أحمد البیروني)یە کە بە رەچەڵەك فارسە، لە سەدەی پێنجەمی کۆچیدا ژیاوە (٣٦٢-٤٤٨ك) بەرامبەر بە (٩٦٣-١٠٤٨ز)، و لەشاری (غەزنە)ی ئەفغانستانی ئێستا مردووە، زانستەکانی بیرکاری و فەلەك و پزیشکی و دەروونناسی و مێژوو و رۆژژمێرەکانی خوێندووە، زانایەکی دیاری بواری گەردوون بووە، بەیرونی زانایەکی لێبڕاو و کۆڵنەدەر بووە و خاوەنی عەقڵییەتێکی ناوازە بووە، هەڵەی زانایانی پێش خۆی راست کردۆتەوە لە نووسراوەکانیدا

وەك: (ما استشنع علی أرسطو– هەڵە ناقۆلاكانی ئەرستۆ) و (أخطاء بطليموس– هەڵەكانی بەتلیمۆس)، ئەم زانایە بە زانستەوە خەریك بووە تەنانەت لە سەرەمەرگیشدا، زۆر گرنگیداوە بە لێكۆڵینەوە و تیڕوانینی تەنە ئاسمانییەكان و دانانی ڕۆژژمێرەكان، یاسای هاوڕێژەی تەژێكانی دۆزییەوە و خەریكی دانانی خشتە بیركارییەكان بووە.

لە گەورەترین دەستكەوتەكانی ئەم زانایە لە بواری فەلەكدا ئەوەیە كە یەكەم كەس بووە ئەو بۆچوونەی یۆنانی و ئیغریقییەكانی راست كردۆتەوە كە دەیانووت خۆر بە دەوری زەویدا دەسوڕێتەوە و دەبێتە هۆی دروست بوونی شەو و ڕۆژ، و ئاشكرای كرد كە بە پێچەوانەوە زەوی خۆی بە دەوری خۆردا دەسوڕێتەوە لە خولگەیەكدا، و بە دەوری خۆشیدا دەخولێتەوە، بەیرونی ئەم بیردۆزەی خۆی بە شێوەیەكی زانستی سەلماند پێش زانای ئەڵمانی (كۆپەرنیكۆس) بە پێنج سەدە.

هەروەها لێكۆڵینەوەی دوور ودرێژی كرد لەسەر هەردوو دیاردەی خۆرگیران و مانگگیران، تەنانەت دەڵێن بەهۆی زۆر تێڕوانینی بۆ خۆر بەچاوی ئاسایی خۆی لەكاتی گیرانیدا بۆ لێكۆڵینەوەی بووە هۆی لاواز كردنی راددەی بینینی، بەلام ئەمە ساردی نەكردەوە لە كارەكانی و بەردەوام بوو لەسەر لێكۆڵینەوە و نووسین تا چەندین نوسراوی لەم كاتانەدا دانا وەك كتێبەكانی: (إمتحان الشمس)، (تحقيق منازل القمر)، و(الشعاعات والقمر).

هەروەها هێڵەكانی درێژی و پانی پێواوە و شوێنی وولاتانی دیاری كردووە، كە مەبەستی لەم كارە بریتی بووە لە دیاریكردنی شوێنی كەعبەی پیرۆز، وەك ووتمان یەكەم كەس بووە دەربارەی خڕێتی زەوی و

سوورِانەوەی زەوی بەدەوری خۆیدا قسەی کردووە و سەلماندوویەتی، لە بەڵگەکانی لەسەر خرِێتی زەوی وتوویەتی: {هەر کاتێك کەشتییەك لە دوورەوە دێت سەرەتا ئاڵاکەی (واتە بەشی سەرەوەی) دەبینرێت، و پاشان بەشەکانی تری وردە وردە دەردەکەون، بەهەمان شێوەش شاخەکان دەتوانین ببینین، کە لە دوورەوە سەیری دەکەین و بەرەو رووی دەرِۆین سەرەتا لوتکەکەی دەبینین و تا بەردەوام نزیك ببینەوە وردە وردە بەشەکانی تریمان بۆ دەردەکەوێت، کە ئەمە بۆمان دەسەلمێنێت ئێمە لەسەر گۆیەکین}.

هەروەها بیردۆزێکی زۆر گرنگی دانا بۆ دەرهێنانی چێوەی گۆی زەوی، کە بە (یاسای بەیرونی بۆ دەرهێنانی چێوەی زەوی) ناسراوە کە بەسەر ووشکانی و ئاویشدا جێبەجێی کرد، یەکەم کەس بوو کە شێوەی گۆیی پان کردەوە بۆ سەر روویەك بە گوێزانەوەی هێڵەکانی بۆ سەر روویەکی تەخت، کە ئەمە بووە هۆی ئاسان کردنی کاری گەردوونزانان و جوگرافی ناسان تا رۆژگاری ئەمرِۆمان.

لە کتێبە فەلەکییەکەیدا بەناوی (القانون المسعودي) چەندین تێبینی بەنرخی تۆمار کردووە سەبارەت بە جووڵەی تەنە ئاسمانییەکان لە فەزادا و جووڵەی خۆریش کە بە شێوەیەکی هەندەسییانە روونی کردوونەتەوە، بەئاشکرا وتوویەتی زەوی بەدەوری خۆیدا دەسوورِێتەوە، لێکدانەوەی هەبووە بۆ هێزی کێشکردنی زەوی و باوەرِی وابووە کە هێزێکی کێشکردن هەیە لەنێوان تەنە ئاسمانییەکاندا کە وای لێکردوون نەکێشن بە یەکتریدا، هەروەها لە دیاردەکانی خۆرگیران و مانگگیرانی کۆڵیوەتەوە و حیسابی بینینی هەیڤەکان (سەرەتای مانگەکان)ی کردووە.

لەبواری کیمیادا ئەم زانایە گەیشتە دۆزینــەوەی کێشــی هــاوجۆری ١٨ ئاوێتە و توخم، لەوانـە ئـاڵتون کـە (١٩.٢٦)ە، ئەمـەش ئـەو کێشـەیە کـە ئەمڕۆ سەلمێنراوە و کاری پێدەکرێت.

هەروەها هەستا بە لێکۆڵینەوەی پەستانی شلەکان و هاوسـەنگییان و بەرزبوونەوەیان لە دەفرەکاندا کـە ئەمانـە زۆر گـرنگن لـە بـواری زانسـتی هایدرۆستاتیکدا، بە تایبەتیش باسی هۆکارەکانی چۆنێتی دەرچوونی ئـاو لـە سەرچـاوە سروشـتییەکان و بـیرە ئیرتیوازییەکانـەوە کـردووە بـەهۆی بیردۆزەکەی کە بەناوی دەفرە ناچوونیەکەکان (الأواني المستطرقة)وەیە.

یەکـەم کەسـێك لـە رۆژئاواییـەکان کـە ئـەم کـارە گەورانـەی بـەیرونی لێکدایــەوە رۆژهــەڵاتناس (نیکـۆلاس دی خـانیکۆف) بــوو لــە ســەدەی نۆزدەدا، پاشان لێکۆڵـەرەوەی ئـەڵمانی (سـاخاو) بـوو کـە ٢ کتێبـی ئـەم زانایـەی وەرگێڕایـە سـەر زمانـەکانی ئینگلیـزی و ئـەڵمانی، و دەربـارەی بـەیرونی ووتوویـەتی: (بـەیرونی مـەزنترین عەقڵیەتێکـە کـە لـە مێـژوودا دەرکـەوتبێت، و لــە مــەزنترین ژیرییەکانـە کـە لـە جیهانـدا پەیـدابوون، و گـەورەترین زانـای سـەردەمی خۆیـەتی و یەکێکـە لـە مـەزنترین زانایـانی هـەموو سـەردەمەکانیش)[١١٧]، هـەروەها رۆژهەڵاتناسـی ئـەمریکی (ئیریـو بۆب) دەربارەی دەڵێت: لە هەموو قائیمەیەکدا کە نـاوی گـەورە زانایـانی مێژووی تێدابێت پێویستە کە ناوی (بەیرونی) پلەیەکی بەرزی پێبدرێت.

---

[١١٧] ئێمەی موسوڵمان لەگەڵ ئـەم ووتەیـەدا نـین لەبەرئـەوەی باوەڕمـان وایـە کـە عەقڵیـەتی ئیسلامی لەو گـەورەتر پەیـدا بـووە، کـە لەسـەروو هەموویانـەوە پێغەمبـەرمان محمـد (ﷺ) بووە، بەڵام ئەم ووتەیە بەڵگەیە لەسەر رێز و پلەی بەرزی ئەم زانا هەڵکەوتووە، گەورەییش ئەوەیە کە دوژمنان دانی پێدادەنێن.

ئەمڕۆش لە وولاتی (ئۆزبەکستان) شارێك هەیە بەناوی ئەم زانایەوە، زۆرێك لە زانکۆکانی دونیاش شانازی بەم زانایەوە دەکەن و ڕێز لە شوێنەوارەکانی دەگرن، گومانیش وایە کە یەکەم کەسێك بیری لە بیردۆزی کێشکردنی زەوی کردبێتەوە بەشێوەیەکی زانستی ئەم زانایە بوبێت نەك (نیوتن)، خاوەنی زیاتر لە (١٥٠) کتێب بووە لە بوارە زانستییە جۆراوجۆرەکاندا لەوانە ٣٥ کتێبی تەنها لەسەر گەردوونزانی داناوە، لە گرنگترین دانراوەکانی بریتین لە:

١- کتێبی: (مقاليد علم الهيئة وما يحدث في بسيطة الكرة).

٢- (الآثار الباقية عن القرون الخالية): کە یەکەم نووسراوێتی دەربارەی گەردوونزانی، و تێیدا ڕۆژژمێری ساڵەکانی میللەتانی کۆن و مێژووەکەیانی لێکداوەتەوە.

٣- القانون المسعودي في الهيئة والنجوم: کە بە نرخترین نوسراوێتی، و بە گەورەترین ئینسایکلۆپیدیا دادەنرێت دەربارەی فەلەك و حیسابی سێگۆشەکاری کە لە ١١ جوزئی گەورە پێکدێت، بەیرونی ئەم کتێبەی ساڵی (٤٢١ك) دانا و بەناوی سوڵتان (مسعود بن محمود الغزنوي)یەوە ناوی نا (القانون المسعودي)، ڕۆژهەلاتناس (نللینو) بابەتەکانی ئەم کتێبەی کورت کردۆتەوە کە گرنگی دەدات بە بابەتەکانی فەلەك و مێژووی میللەتە جۆراوجۆرەکان، و حیسابی سێگۆشەکاری تەخت و گۆیی و وێنەکانی زەوی و دوورییەکانی، هەروەها جووڵەکانی خۆر و ڕوونکردنەوەیان بە شێوەیەکی هەندەسی، و جووڵەکانی مانگ و پلەکانی و حیسابی خۆرگیران و مانگگیران.

٤- تأريخ الهند. ٥- التفهيم لأوائل صناعة التنجيم. ٦- كتاب الصيدلة. ٧- الجواهر في معرفة الجواهر.

## ئیبن یونس:

ناوی (أبوالحسن علي بن عبدالرحمن بن أحمد بن یـونس المصـري)یـە، لە سەدەی چوارەمی کۆچیدا ژیاوە و ساڵی (٣٩٩ك-١٠٠٩ن) کۆچی دوایـی کـردووە، هەڵکـەوتوو بـووە لـە زانسـتی فـەزا و فەلەکدا، بـە گـەورەترین گەردوونزانی سـەردەمی خـۆی دادەنرێـت دوای (بـەتتانی و بوزجـانی) لـە سەدەی یانزەیەمی زایینیـدا، دەسـەڵاتدارە فاتیمییـەکان لـە میسـر پلـەی ئەم زانایەیان زانیوە، ئەوەبوو بینگەیـەك (مرصـد)ێکیان بـۆ دروسـت کـرد لەسـەر (جبـل المقطـم) لـە نزیـك شـاری قـاهیرە کـە کـاری تێڕوانینـی تێدادەکرد و هەموو ئامێرێکی پێویستی تێدابووە.

لە گرنگترین نووسراوەکانی بریتییە لە کتێبی (الزیج الحاکمي) کە لـە ٤ بـــەرگ پێکـــدێت، لەلایـــەن (العزیـــز)ی فاتیمییـــەوە داوای لێکـــرا کـــە ئینسـایکلۆپیدیایەك لـە زانسـتی (الهیئـة) و فەلەکـدا دابنێـت، ئـەوەبوو دەستی پێکرد و لە سەردەمی کوڕی (العزیز)دا کە ناوی (الحاکم بـأمر الله) بوو تەواوی کرد، هەربۆیـە بـەناوی ئەمیانـەوە نـاوی نـا (الـزیج الحـاکمي)، ئـیبن یـونس سـەرکەوتوو بـوو لـە تێـڕوانین و لێکۆڵینـەوەی خـۆرگیران و مانگگیران لە میسردا لە ساڵی (٩٧٨ن)، لێکۆڵینەوەکانی مـۆرکێکی ئـاینی پێوەبـووە، تەنانـەت لـە پێشـەکی کتێبەکەیـدا (الـزیج الحـاکمي) هـەموو ئایەتەکانی گەردوونی لە قورئانی پیرۆزدا کۆکردۆتەوە.

بە یەکەم کەسێك دادەنرێت کە (بەندۆل)ی کاتژمێری داهێنابێـت (نـەك گـالیلۆی ڕۆژئـاوایی!) کـە لـەپێش ئـەودا بـە شـەش سـەدە ئـەم زانـا موسوڵمانە بەکاری هێناوە!.

هـەردوو زانـای فەرەنسـی (سـیدیو) لـە کتێبەکەیـدا (تـأریخ العـرب) و زانـای ئینگلیـزی (تایلـەر) لـە کتـێبی (تـأریخ الریاضـیات)دا دانیـان بـەم

راستییەدا ناوە، کتێبەکەی ئیبن یونس لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمی زایینیدا وەرگێڕدراوە بۆ زمانی فەرەنسی و یەکێك بووە لە سەرچاوە گرنگەکانی زانستی فەلەك لە رۆژئاوادا بە تایبەتی لە دانانی خشتە فەلەکییەکاندا، هەروەها لێکۆڵینەوەی هەیە لەزانستی سێگۆشەکاریدا، دەکرێت بڵێین ئەو یەکەم کەس بووە کە بۆچوونی گۆڕینی کرداری لێکدان بۆ کۆکردنەوەی دانابێت لە پێش (نابیر)ی ئەورووپی بە ٧ سەدە، کە ئەم بۆچوونە لەدواییدا لەلایەن زانا (إبن حمزة المغربي) گۆڕدراوە بۆ زانستی لۆگاریتم، ئیتر دوای ئەمان (نابیر) هات و بەهۆی کارەکانی ئەمانەوە زانستی لۆگاریتمی بەشێوازی ئەمڕۆ دانا.

## خازین:

ناوی (أبوالفتح عبدالرحمن المنصور الخازن) بووە، لە سەدەی شەشەمی کۆچیدا ژیاوە (ساڵی ٥٥٠ك-١١٥٥ز مردووە)، بە زانستەکانی بیرکاری و هەندەسە و فەلەك و سروشتزانی (فیزیا) و زانستی جووڵە (زانستی میکانیك)وە خەریك بووە، هەروەها لە زانستی شلەکانیشدا کاری کردووە، لەبواری فەلەکدا کتێبی (الزیج المعتبر السنجاري) و (کتاب الآلات العجیبة)ی داناوە، هەروەها خاوەنی چەندین توێژینەوەی بەنرخە لەبواری ئاوێنەکان و گەرمیی دانەوەیان و چۆنێتی دروستبوونی وێنە تیایاندا، کتێبێکی لەسەر رووناکیزانی (البصریات) داناوە، کە پاشان وەرگێردرایە سەر زمانی لاتینی و ئیتاڵی، و زانا (کیپلەر) زۆر پشتی پێبەستووە لە کتێبەکەیدا لەسەر رووناکیزانی، زانایەکی تر بەناوی (مسیو شاسل) دەربارەی خازین دەڵێت: کتێبەکەی ئەم بە سەرچاوە وبناغەی

زانيارييەكانی ئەمڕۆمان دادەنرێت لە زانستی ڕووناكيزانيدا، وئەم بەڕێزە مامۆستای زۆرێك لە زانايانی ئەوروپا بووە لە سەدەكانی ناوەڕاستدا.

بۆ ماوەيەكی زۆر ناو و كارەكانی ئەم بەهەڵە تێكەڵاوی زانايانی تر كرابوو، لە گرنگترين دانراوەكانی بريتييە لە (ميزان الحكمة) كە لە سەدەی نۆزدەيەمدا دۆزرايەوە و بڵاوكرايەوە، كە يەكێكە لە كتێبە دانپێدانراوەكانی سروشتزانی و جووڵەزانی (لەوانەشە تەنها كتێبی ئەم بوارانە بێت لە چاخەكانی ناوەڕاستدا)، ڕۆژهەڵاتناسی ئيتاڵی (نالينۆ) پشتی بەلێكۆڵينەوەكانی خازين بەستووە لە لێكۆڵينەوەی بابەتەكانی جوگرافيا و فەلەك لای موسوڵمانان، خازين كاريكردووە لەسەر دەرهێنانی كێشی هاوجۆری تەنەكان، كە ژمارەكانی زۆر نزيكە لە ژمارە نوێيەكانی ئەمڕۆ.

هەروەها زانايەكی ناسراوی تريش پێش ئەم هەبووە بەناوی (خازين)ەوە كە (أبوجعفر محمد بن الحسين الخازني الخراساني) بووە لەنێوان ساڵەكانی (٣٥٠-٣٦٠ك)دا مردووە، خاوەنی چەندين كتێبی گەردوونزانييە، لەوانە: (كتاب جوامع قوانين علم الهيئة)، و (كتاب زيج الصفائح)، و (شرح المسائل العديدة).


أبو عبد الله محمد الإدريسي
جغرافي عربي علّم أوربة

## ئيدريسی:

ناوی (أبوعبدالله محمد بن إدريس) بووە و ناسراوە بە (الشريف الإدريسي)، لە سەدەی شەشەمی كۆچيدا ژياوە، زانستەكانی بيركاری و هەيئە و جوگرافيا و ڕووەكزانی خوێندووە و بەسەر زەويدا گەڕاوە، ئەوروپييەكان

نەخشـەكانى ئـەميان وەرگـرت و بـەكارهێنا چـونكە لەسـەر راددەيـەكى بەرزى ووردەكاريى بوو، يەكـەم كـەس بـووە كـە نەخشـەيەكى راسـتى بـۆ جيهان كێشاوە[118].

لـە يـەكێك لـە كتێبەكانيـدا دەڵێـت: {زەوى خـۆى لـە شـێوەيەكى گۆييدايە بەڵام گۆييـەكى راستەقينە نييـە ..... راددەى خرێتـى لـە هێڵـى كەمەرەى زەويدا بريتييە لـە (٣٦٠ پلـە) بـەڵام لـە جەمسـەرەكانى زەويـدا بريتييە لە (٩٠پلە).....}.

لەكتێبە گرنگەكانى بريتييە لە (نزهة المشتاق في اختراق الأفاق) كـە بـۆ هەموو زمانە ئەورووپييەكان وەرگێـڕدراوە (وەك: ئـەڵمانى ١٨٢٢ز، ئيتـاڵى ١٨٨٥ز، ئيسپانى ١٧٩٣ز، فەرەنسـيى ١٨٣٩ز) و زانيارييـەكانى نـاوى تـا ماوەيـەكى دوورودرێـژ لـەوێ پشـتى پێدەبەسـترا، بيريـارى رۆژئـاوايى (گوتيـە) دەربـارەى دەڵێـت: زانـاى جوگرافيـايى (ئيدريسـى) مامۆسـتاى هەموو ئەورووپا بووە لە جوگرافيادا.

## قەزوينى:

ناوى (أبوعبدالله زكريا بن محمد القزويني) بووە، لە سەدەى حەوتـەمى كۆچـيدا ژيـاوە (٦٠٠-٦٨٢ك)، دەڵـێن هۆكـارى دانـانى نووسـينە زانسـتييەكانى بريتـى بـووە لـە بانگـەوازێك لەمـەوە بـۆ بيركردنـەوە لـە دروستكراوەكانى خودا و بەرز راگرتنـى، هەربۆيـە نووسـينەكانى پشـتيان بەستبوو بە باوەڕبوون بەخودايەكى تاك و تەنها بۆ بوونەوەر كە بـەڕێوەى

---

[118] پێش ئەم زانايەش موسوڵمانان نەخشەيان بۆ جيهان كێشاوە كە زۆر لە راستييەوە نزيك بووە، بە تايبەتى نەخشەكەى سەردەمى خەليفەى عەبباسى (المأمون).

دەبات، کە ئەمە ڕێگر نەبوو لە بەرامبەر هەستانی بە لێکۆڵینـەوە زانسـتی و مەیدانییەکان و هەستان بە تاقیکردنەوەکان، لـە گـرنگترین دانراوەکـانی بریتییە لە کتێبی (عجائب المخلوقات وغرائب الموجودات).

قەزوینی لەم کتێبەیدا وەسفی گەلەستێرە (مجرة)ی بەوە کـردووە کـە بـریتین لـە (کۆمەڵـە هەسـارەیەکی بچـووکی لەیـەك نزیـك)، کـە ئەمـەش بەڵگەیــە لەســەر ئــەوەی بــیری بــوونی گەلەســتێرە و پێکهاتــەیان لــە گەردووندا لەلای زانایانی موسـوڵمان هـەبووە پـێش ئەوەی زانسـتی نـوێ بیدۆزێتــەوە، هــەروەها هــەردوو دیــاردەی خــۆرگیران و مــانگگیرانی بەشێوەیەکی زانستییانە لێکداوەتەوە و زۆر وورد بووە تێیدا، کە دەڵێـت: (هۆکـاری گیرانــی مــانگ بریتییــە لــەوەی زەوی دەکەوێتــە نێـوان ئـەو و خــۆرەوە و مــانگ دەکەوێتــە نــاو تاریکــایی زەوییــەوە و بــە تــەواوەتی دیارنامێنێــت، گیرانــی خــۆریش کاتێـك ڕوودەدات کــە مــانگ بکەوێتــە بەردەمی خـۆر و ڕووناکییەکـەیمان لێبگرێـت)، کەواتـە ئەمـە زانیارییـەکی تەواوە بە خولگە فەزاییەکان پێش هاتنی (کیپلەر)ی ئەورووپی کـە ڕۆژئـاوا پڕوپاگەنـدەی ئـەوە دەکـەن کـە خـاوەنی ئـەم یاسـایەیە، کـە ئـەم دوای سەردەمی قەزوینی بە سەدان ساڵ هاتووە.

قەزوینی تەئکیدی کردۆتە سـەر خڕێتـی وگـۆیی زەوی و سـووڕانەوەی بەردەوامی، کە لەمبارەوە وتوویەتی: (ئەوەی دەیبیـنین لـە سـووڕانەوەی ئاسمان لە سەرمان بریتییە لە سووڕانەوەی زەوی بـەدەوری خۆیـدا، نـەك بەهۆی سووڕانەوەی تەنەکانی ئاسمان!!).

کەواتە بەم قسەیەی پێش (گالیلۆ) کەوتووە بە سـەدان سـاڵ لـە بـاس کردنـی سـووڕانەوەی زەویـدا، هـەروەها کتێبەکـەی (عجائـب المخلوقـات

وغرائب الموجودات) کتێبێکی زیندەوەرزانیشە لەبەرئەوەی بە دوورودرێژی باسی زۆرێك لە رووەك و ئاژەڵانی کردووە.

## ئیبنو لعەووام:

زوربەی زانایانی موسوڵمانی هەڵکەوتوو لە بواری کشتوکاڵ و رووەکناسیدا لە وڵاتی ئەندەلوس (ئیسپانیای ئێستا) دەرکەوتن، کە رۆڵێکی شارستانییانەی گەورەیان هەبوو بۆ گوێزانەوەی ئەم زانستە بۆ ئەوروپا، لەو هەڵکەوتووانە زانا (أبو زكريا يحيي بن محمد بن أحمد بن العوام الإشبيلي)یە، لە کۆتایی سەدەی دوانزەیەمی زایینیدا مردووە، و زانستەکانی کشتیاریی خوێندووە و تێیدا بلیمەت بووە، کتێبی کشتیاریی (كتاب الفلاحة)ی داناوە، باسێکی هەمەلایەنەی بابەتە کشتیارییەکانمان بۆ دەکات، کشتیاریی بە هونەرێك دادەنێت، و دەڵێت هەر کەسێك کە دەیەوێت ئەمە بکاتە هۆکاری بژێوی خۆی و خێزانی ئەوا لەم کتێبەدا پێویستی خۆی دەبینێتەوە.

مانای کشتیاریی لای ئیبن لعەووام بریتییە لە چاککردنی زەوی و رواندنی دار و درەخت تێیدا، هەروەها رواندنی تۆوە ئاساییەکان و ئامادەکرنی پێویستییەکان بۆ روانیان و دوورخستنەوەی بەڵاکان لێیانەوە، هەروەها زانینی جۆری زەوییەکە و ئەو جۆرانەی کە دەنگوجێت تێیدا بروێن لە درەخت و دانەوێڵە و سەوزە و میوە، هەروەها کاتی گونجاو بۆ رواندنی هەر جۆرێك و چۆنێتی ئاگادار بوونیان.

ئەم زانایە کتێبەکەی کردووە بە دوو بەرگی گەورەوە کە لە ٣٥ بەش پێکهاتوون، لە بەشی یەکەمدا مەسەلەکانی کشتیاریی هێناوە لە:

هەڵبژاردن و ناسینی زەوییەکان و پێکهاتەیان و کانزاکانیان و گونجانی هەر جۆرێك بۆ رواندن لە زەوییەکی دیاری کراودا، هەروەها چۆنێتی ئامادەکردنی پەینەکان و سوودەکانیان بۆ زەوی و درەختەکان، و جۆری ئاوەکان و چۆنێتی ئاودانی درەخت و سەوزەکان، و دروست کردنی باخەکان و هەڵبژاردنی جۆری درەختەکان و میوەکان و کاتی رواندنیان، هەروەها چۆنێتی موتوربە کردنی درەختەکان و پیتاندنیان و چارەسەر کردنیان لە نەخۆشییەکان، و چۆنێتی کارکردن لە کێڵان و رواندندا، و هەڵگرتن و عەمبار کردنی دانەوێڵە و میوە تەڕ و ووشکەکان و زۆر بابەتی کشتیاریی تریش.

بەشی دووەمی کتێبەکە باسی چۆنێتی بەخێوکردنی مەڕوماڵات و نەخۆشییەکانیان و چارەسەریان دەکات، هەروەها لێکۆڵینەوەی سیفاتە توێکارییەکانیان و چۆنێتی چارەسەرکردنی هەر ئەندامێك و هەر نەخۆشییەکیانی بەجیا باس کردووە، لەناو ئەم لێکۆڵینەوانەدا بەشێکی تەرخان کردووە سەبارەت بە ئەسپەکان و جۆرەکان و سیفاتەکانیان و چۆنێتی پەروەردەکردنیان و سوارچاکی، هەروەها باسی پەلەوەرەکان و پەروەردەکرنیان و ئاگادار بوونیان دەکات، ودەربارەی هەنگ و شانەکانیان و پەروەردەردنیان دەدوێت، کە لە هەموو ئەم باسانەیدا زۆر وردەکارە و بابەتەکان بەجوانی روون‌دەکاتەوە.

ئەم کتێبە لە ساڵی (١٨٠٢ز) لە شاری (مەدرید) چاپکراوە لەسەر نوسخە دەستنوسەکەی کە لە کتێبخانەی (الأسکوریال) هەڵگیراوە، ئیبنو لعەووام هەروەکو هەموو زانا موسوڵمانەکان لەزانیارییەکانیاندا پشتیان بەستووە بە رێنومایییە ئیسلامییەکان کە سەرەکیترینیان قورئان و

فــەرموودەکانی پێغەمبــەرن (ﷺ)، کــە لــەم کتێبەیــدا هەنــدێك لــە فەرموودەکانی پێغەمبەری (ﷺ) هێنـاوە وەك: ﴿عَنْ أَنَسٍ – رضـی الله عنه – قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ (ﷺ): « مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَغْرِسُ غَرْساً ، أَوْ يَـزْرَعُ زَرْعاً ، فَيَأْكُلُ مِنْهُ طَيْرٌ أَوْ إِنْسَانٌ أَوْ بَهِيمَةٌ ، إِلاَّ كَانَ لَهُ بِهِ صَدَقَةٌ »﴾ (رواه البخاري وسلم)، واتـە: هـەر موسـوڵمانێك درەختێك بروێنێـت یـان شـتێك بچێنێت و مرۆڤێك یان باڵندەیەك یان ئاژەڵێك لێـی بخـوات ئـەوا بـە چـاکە بۆی حیساب دەکرێت.



**مەدریدی (مەجریطی)[119]:**

لە سەردەمی خەلیفە (حەکەمی دووەم)دا (٩٦١–٩٧٦ز) ئەنــدەلوس گەشــەکردنێکی گــەورەی بــەخۆوە بینــی لــەکار و بەرهــەمی زاناياندا، یەکێك لەوانە کـە نـاوی (مسـلمة بـن أحمـد) بـووە بـە رەچـەڵەك خـەڵکی (قورتوبە)یـە بـەڵام لەبەرئـەوەی ماوەیەکی زۆر لە شاری مەدرید ماوەتەوە بـە مەدریـدی (یـان مـەجریطـی) ناوبـانگی دەرکـردووە، هــەموو زانسـتە ئیسـلامییەکانی خوێنـدووە، بـە تايبـەتی بـەهۆی کـارە گـەورەکانی لـەبواری گەردوونزانیـدا ناسـراوە، کـە کتێبێکـی لەسـەر (الإسـطرلاب) دانـاوە و وەرگێـردراوە بـۆ لاتینـی و زۆر بەهۆیانەوە بەناوبانگ بووە.

---

[119] شاری (مەدرید) موسوڵمانان دروستیانکرد لـە ناوەڕاستی سـەدەی نۆیـەمی زایینیـدا (٨٦٠ز) بـە فەرمانی (محمد بن عبدالرحمن بن الحکم) ئەمیری ئومەوی ئەندەلوس کە ناوینا (مجریط **Magerit**)، دەکەوێتە سەرووی شاری (طلیطلة) و شوێنی دەرکـەوتنی چـەندین زانـای موسـوڵمان بـووە، مـاوەی ٢ سەدە هێڵێکی بەرگری بەهێز بووە لە بەرامبەر هێرشی ئیسپانییەکان بۆ ئەندەلوس، ئەم شارە ئێستا پایتەختی شانشینی ئیسپانیایە.

کتێبێکی کیمیایی گرنگ دراوەتە پاڵی بەناوی (رتبة الحکیم ومدخل التعلیم) کە ساڵی (١٢٥٦ز) بە فەرمانی پاشای (قشتالة) وەرگێڕدراوە بۆ لاتینی، لەم کتێبەیدا سەرەتا باسی پێویستییەکانی قوتابی کیمیای کردووە لە خوێندنی بیرکاری و زانستەکانی سروشتدا، و دوایی دەڵێت دەبێت خاوەنی لێهاتوویی و تێڕوانینی وورد بێت و بڕوانێتە کارلێکە کیمیاییەکان، وپاشان باسی چەندین کارلێکی کیمیایی کردووە وەك: پوختەکردنی ئاڵتوون و زیو بەهۆی ئۆکساندنی کانزاکانی تر کە لەگەڵیدان و هەروەها چۆنێتی ئامادەکردنی ئۆکسیدی جیوەی باسکردووە، و چەندین تاقیکردنەوەی تر کە بۆمان دەسەلمێنێت ئەم دانەرە کاری پراکتیکی تاقیگەیی زانیوە.

## ئیبن لبیتار:

ناوی (ضیاءالدین أبومحمد عبدالله بن أحمد الأندلسي)یە، لە ئەندەلوس (شاری مالقة) لەدایکبووە (٥٧٥ك)، و لە شاری ئیشبیلیە ژیاوە و لە دیمەشق مردووە (٦٤٦ك-١٢٤٨ز)، ئەم زانایە بە گەورەترین ئاژەڵناس و رووەکناس و دەرمانزانێك دادەنرێت کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا پەیدا بووبێت، کە هەستاوە بە چەندین گەشت بۆ زۆر شوێنی سەر زەوی و رووەك و ئاژەڵە جۆراوجۆرەکانی لێکداوەتەوە، و تێبینییەکانی نووسیوە کە بوونە هۆکاری ئەوەی ئەم زانستانە نرخێکی گەورە پەیدابکەن و بەرەو پێشەوە بڕۆن، خاوەنی کتێبی (المغني في الأدوية المفردة)یە.

کتێبە بەناوبانگەکەی کە بە ناوی (الجامع لمفردات الأدوية والأغذية)یە، بە سەروەتێکی گەورە دادەنرێت لە مێژووی زانستیی موسوڵمانادا، لەم

کتێبەیدا پشتی بەستووە بە بینین و تێڕوانین و تاقیکردنەوە و شێوازی هەواڵپێدانی بە تەنها وازلێهێناوە، ئەو شتانەی کە بێکەڵکن و سەلماوە کە بێسوودن روونی کردوونەتەوە، ئەو دەرمانانەشی پشکنیوە کە پێشتر هەڵەی تێدا کراوە و راستی کردوونەتەوە.

لە کتێبەکەیدا ناوی دەرمانەکانی بە زمانە جیاوازەکان هێناوە لەگەڵ سەرچاوە و چۆنێتی دەرهێنانیان و سوودەکانیان، ناوەکانی بە شێوەیەکی راست تۆمار کردووە و لێی دڵنیابووە و هەروەها خاڵەکان و شکڵەکانی بە ووردی بۆ داناون و تێبینی لەسەر نووسیون، ئەمە هەمووی بۆ ئەوەی لە هەڵە و دەستکاریی لە نووسینیاندا بەدووربێت، بەمە نموونەیەکی بەرزی نیشانداوین لەسەر وورد‌ەکاریی زانا موسوڵمانە رەخنەگرەکان کە پشتیان بەستووە بە لێکۆڵینەوە و بینین و تاقیکردنەوە، هەر ئەمە کردی بە یەکێك لە زانا سەرمەشقەکانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا، لەم کتێبەیدا باسی زیاد لە ١٤٠٠ ماددەی کردووە کە ٣٠٠ جۆریان ماددەی نوێن، و لەنێوانیاندا ٢٠٠ جۆری رووەکی نوێ هەیە، ئەم کتێبە وەك پاشماوە زانستییەکانی تری موسوڵمانان وەرگێڕدرا بۆ لاتینی و ساڵی (١٧٥٨ز) بەچاپ گەیەنرا.

## الجاحظ:

ناوی (أبوعثمان عمرو بن بحر بن محبوب الكناني)یە، لە (١٥٩ تا ٢٥٥ك) ژیاوە، ئەم زانایە بە شێوەیەکی زانستیانە گەورە بوو لە دانیشتنی لەگەڵ زانایان و گفتوگۆ کردنیان، و هەروەها کۆچ کردن و گەڕانی بەدوای زانستدا و بینینی گەورە پیاوانی دەوڵەتی عەبباسی لە

بەغـدا و سـامەڕا، لـە قوتابخانـەی موعتەزیلـەکان بـووە کـە لـە لێکۆڵینەوەکانیانـدا پشـت بـە بەڵگـەی ژیریـی و مـەنتیق و سـەلماندن دەبەسـتن، گـەورەترین دانراوەکـانی بریتییـە لـە کتـێبی ئـاژەڵان (کتـاب الحیوان)، لە سەرەتاکەیدا باسی هۆکارەکانی دانانی دەکات، لەوانە:

١- سەلماندن و بەڵگە هێنانەوە بۆ گـەورەیی دەسـەڵاتی پـەروەردگار لە دروستکراوەکانیدا.

٢- بڵاوکردنەوەی لایەنەکانی زانیاریی لەناو خەڵکیدا.

٣- سەرخستنی بیروبۆچوونی موعتەزیلـەکان کـە دەربـارەی ئـاژەڵان قسەیان کردووە و موجادەلەیان کردووە و شیعریان لەسەر داناون.

٤- سەرخسـتنی زمـانی عـەرەبی و موسـوڵمانان، کـە هەنـدێك کـەس هەندێك جۆری ئاژەڵیان ناشرین کردووە و داویانەتە پـاڵ عەرەبـەکان وەك (الضب).

پرۆگرامـی (الجـاحظ) لـە نووسـینەکانیدا بریتـی بـووە لـە پرۆگرامـی خوێندنەوە و تێڕوانین و لێکۆڵینـەوەی دیـاردە جۆراوجۆرەکـان، هـەروەها گرتنەبـەری ڕێگـەی تاقیکردنـەوە و دانـانی بـیردۆز و پاشـان چەسـپاندنی یاسـاکان، (الجـاحظ) لـە سـەرەتای کتێبەکـەدا وەسـیلە وپێویسـتییەکانی پرۆگرامەکەی دیاری کردوون کە بریتین لە:

بیسـتن، تاقیکردنـەوە، قورئـان وسـوننەت، غـەریزە، بیـنین بەچـاو، ژیریـی، و گومـان کـردن، سەرچـاوە سـەرەکییەکانی کتێبەکەشـی بـریتی بـوون لـە: قورئـان و سـوننەت و دیـوانی شـیعرە عەرەبییـەکان و کتێبـە بێگانـە وەرگێڕدراوەکـان، و لێکۆڵینـەوەکانی فەیلەسـوفەکان و ڕەخنەگرتنی زانستییانە.

## جابیری کوڕی حەییان:


جابر بن حيان الكوفي
عالم تعتز به الإنسانية

(أبو موسى جابر بن جعفر بن حيان الكوفي) مەزنترین زانایانی کیمیای موسوڵمان بووە کە لە نیوەی دووەمی سەدەی هەشتەمی زاییندا ژیاوە (لە شاری طوس لەنێوان ٧٢١-٧٢٢ز لەدایکبووە و هەرلەوێ ساڵی ٢٠٠ك-٨١٥ز مردووە).

لە خزمەتی (بەرمەکییەکان)ی سەردەمی (هارون الرشید)دا کاری کردووە، نووسینەکانی بۆ خۆیان ئینسایکلۆپیدیایەکی زانستی پێکدێنن و پوختەیەکی کیمیای نوێ پێشکەش دەکەن.

ئەم زانایە لە ڕۆژئاوا بە (Geber) ناسراوە، زوربەی دانراوەکانی وەرگێردران بۆ زمانە ئەوروپییەکان کە گرنگترینیان بە (الإستتمام) (Sum of Perfection) ناونراوە، لەدوای سەدەی چواردەیەمی زایینی و پاش وەرگێڕانیان دانراوەکانی (جابر) بوون بە گرنگترین سەرچاوەکانی لێکۆڵینەوەی کیمیا لە ڕۆژئاوادا، دانراوەکانی خۆیان لە چەند سەدێك دەدەن کە هەرە گرنگەکانی ئەمانەن:

١- (الكتب المئة والإثناعشر) کە پێشکەشی بەرمەکییەکانی کردووە.

٢- (الكتب السبعون)، کە وەرگێڕدراوە بۆ زمانی لاتینی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا.

٣- (الكتب العشرة) یان (المصححات).

٤- (كتب الموازين).

٥- كتاب القمر الأكبر.



٦- كتاب الشمس الأكبر.

٧- كتاب الشمس الأصغر.

٨- كتاب إخراج ما في القوة الى الفعل.

٩- كتاب المريخ، زحل، الزهرة، عطارد.

(جابیری كوری حەییان) یەكەم كەس بووە كە باسی هاوكێشی (الأوزان المتكافئة)ی كردووە، و ناوی ناوە (زانستی میزان)، و یەكەم كەس بووە كە ووتویەتی (مس) ئاگرێكی ڕەنگ سەوز دروست دەكات، توانیویەتی هەردوو ترشی ئەسیتیك و كبریتیك ئامادە بكات، هەروەها دۆزیویەوە كە ئاڵتوون و زیو لە تێكەڵاوێكی ئەم ٢ ترشەدا دەتوێنەوە.

جابیر لەگەڵ زانستەكانی لەبواری كیمیادا خاوەنی چەندین داهێنراوی زۆر و سەرسوڕهێنەر بووە، لەوانە:

١- ئامێرێكی دروستكرد كە دەیتوانی مرۆڤ بەرزبكاتەوە لە ئاسماندا و بتوانێت بسووڕێتەوە وەك ئەوەی بە چەند پەتێكی نادیار هەڵواسرابێت، كە (خالد البرمكي) چەند جارێك تاقیكردەوە.

٢- پۆلیسێكی ئۆتۆماتیكی دروستكرد كە لەبەر دەرگای یەكێك لە وەزیرەكان داینا، ئەگەر یەكێك ڕەچاوی هەندێك یاسای نەكردایە كە جابیر داینا ئەوا سەلامەت دەرنەدەچوو، وەك ئەوەی كە روویدا لەگەڵ یەكێك لە كەنیزەكانی (یحیی البرمكي) كە ئەم شمشێرە ئۆتۆماتیكییەی بەركەوت.

٣- شتێكی دروستكرد بە هاوشێوەی تەلەفۆن، زانایان دەڵێن ٢ سندووقی دروستكرد كە بەهۆی چەند تەلێكەوە پێكەوە گرێدرابوون، كاتێك یەكێك لە سندووقێكەوە قسەی دەكرد لە سندووقەكەی ترەوە گوێیان لێیدەبوو.

## ئیبن جوبەیر:

ئەم زانایە لە وولاتی ئەندەلوس لەدایك بووە لە سالّی (٥٣٩ك-١١٤٤ن)دا و لە وولاتی میسر لە سالّی (٦١٤ك-١٢١٧ن)دا کۆچی دوایی کردووە، زانایەکی بواری فەرموودە و فیقە و ئەدیبێکی ناسراو بووە، لە هەمان کاتدا حەزی لە بواری گەشت و جوگرافیای وولاتان بووە، ٣ گەشتی ئەنجامداوە بۆ وولاتانی رۆژهەلاتی زەوی کە یەکێکیان ٣ سالّی خایاندووە، لە رۆژی دووشەممە (١٩ی شەووال)ی (٥٧٨ك) دەستی پێکردووە و لە رۆژی پێنج شەممە (٢٢ی موحەڕڕەم)ی (٥٨١ك) کۆتایی پێهێناوە (واتە لە ١١٨٢/٢/٣ بۆ ١١٨٥/٤/٢٥ن)، لە کتێبەکەیدا بەناوی (رحلة إبن جبير) وەسفی هەموو ئەو شارانەی کردووە کە پێیدا تێپەڕیوە، هەموو ئەو شتە سەرسوڕهێنەرانەی کە بینیویەتی بە ووردی وەسفی کردوون، لە وولات و دیمەنە سەیرەکان، و لە دروستکراوە ناوازەکان، و باری سیاسی و کۆمەلایەتی و ئەخلاقی ئەو شوێنانە، بە تایبەتی گرنگی داوە بە وەسفی لایەنە ئاینییەکان و مزگەوتەکان و گۆڕی هاوەلانی پێغەمبەر و پیاوچاکان، و ئەرکەکانی حەج و کۆڕەکانی ئامۆژگاری کردن، و نەخۆشخانەکان و بیمارستانەکان، و کلێساکان و پەرستگاکان و قەلاکان، هەروەها وەسفی گەردەلوولە دەریاییەکانی کردووە و ئەو ناڕەحەتییانەی کە گەشتیاران دەیبینن لە دەریادا لە ناخۆشی و ترس.

هەروەها باسی شەڕەکانی نێوان موسولّمانان و خاچپەرستانی پشتگوێ نەخستووە، و زۆر موعجەب بووە بە (صەلاحەددینی ئەیوبی) و بەردەوام لە کتێبەکەیدا باسی کردووە، لە کارە باشەکانی و رێك وپێکی بەرێوەبردنی دەسەلاتەکەی و جیهادە گەورەکەی لە بەرامبەر

خاچپەرستاندا، ئیبن جوبەیر نووسەرێکی وورده و نووسینەکانی بە شێوازێکی ئاسان و ئەدەبیانە نووسیوە، کە وەسفی ڕووداوەکان ئەوەندە وورد و زیندووانە دەکات کاتێك دەیخوێنیتەوە وا تەصەور دەکەیت کە خۆت لەناو ئەو دیمەنانەدایت، لە ڕاستیدا کتێبی گەشتەکەی ئیبن جوبەیر دەتوانین بڵێین کتێبێکی مێژوو و جوگرافیا و ئەدەبە.

## ئیبن بەتوتە:

(أبو عبدالله محمد بن عبدالله اللواقي الطنجي) ناسراو بە (إبن بطوطة) لە ساڵی (٧٠٣ك) لە شاری (طنجة)ی وولاتی مەغریب لەدایك بووە، و ساڵی (٧٧٩ك) لە مەراکیش کۆچی دوایی کردووە.

بە وولاتانی موسوڵماندا گەڕاوە، وزوربەی ناوچە شارستانییەکانی دونیاش گەڕاوە، ئەوەبوو گەشتی کردووە بۆ حیجاز و وولاتی شام و عێراق و فارس و ناوەڕاستی ئاسیا و وولاتی بیزەنتە، هەروەها بوخارا و ئەفغانستان هیندستان و چین و سیلانیش گەڕاوە و دوایی چۆتەوە بۆ وولاتەکەی خۆی، هەروەها گەشتی کردووە بۆ ئەندەلوس و بە شارەکانیدا گەڕاوە و پاشان گەڕاوەتەوە بۆ وولاتەکەی خۆی، هەروەها گەشتی کردووە بۆ ئەفریقا و گەیشتۆتە شاری تیمبۆکتۆ (لە وولاتی مالی) و زۆرێك لە ناوچەکانی تری ناوەڕاستی ئەفریقا.

هەموو بینینەکان وبەسەرهاتەکانی خۆی لەم گەشتانەیدا لە کتێبێکی ناوازەدا تۆمار کردووە بەناوی (تحفة النظار في غرائب الأمصار وعجائب الأسفار) کە بە گەشتی (ئیبن بەتوتە – رحلة إبن بطوطة) ناسراوە وبە شێوازێکی ئەدەبی دایڕشتووە.




د. حسين مؤنس، ابن بطوطة ورحلاته تحقيق ودراسة وتحليل، دار المعارف، مصر، ١٩٨٠.

**نەخشەیەك كە ڕێڕەوی گەشتەكانی (ئیبن بەتوتە) ڕوون دەكاتەوە لە ئاسیا و ئەفریقا و ئەوروپادا**




## رازی:

ناوی (أبوبكر الرازي)یە[١٢٠]، پزیشك و كیمیازانێكی بەناوبانگ بووە، ساڵی (٢٥١ك-٨٦٥ز) لە شاری (ڕەی) لە ئێران لەدایكبووە و ساڵی (٣١٣ك-٩٢٥ز) مردووە، زانستەكانی بیركاری و گەردوونزانی و فەلسەفە و ئەدەب و مۆسیقا و كیمیای خوێندووە.

---

[١٢٠] نابێت ناوی تێكەڵاو بكرێت لەگەڵ فەقیە و موفەسیری گەورە (الفخر الرازي) كە ساڵی (٦٠٦ك-١٢٠٩ز) كۆچی دوایی كردووە، چونكە ٢ كەسی جیاواز بوون.

ئەم زانایە دواتر ژیانی خۆی بۆ زانستی پزیشکی تەرخان کردووە، و لە مێژوودا وەك پزیشکێکی کلینیکی ناوبانگێکی گەورەی دەرکردووە، دانراوەکانی بە دائیرەتولمەعاریفێکی زانستی دادەنرێن بەهۆی هەمەلایەنی و فراوانیی زانیارییەکانیان، زۆر پێش (جالینۆس)ی داوەتەوە لە زۆریی نووسینەکانیدا، کە دەڵێن تەنها لە زانستی پزیشکیدا ٢٢٠ بەرگی نووسیوە.

لە بەناوبانگترین کتێبەکانی لە زانستی پزیشکیدا بریتین لە: (الحاوي في الطب) و هەروەها (كتاب الراوي أو المنصوري) کە کتێبێکی گەورەیە لە ١٠ بەرگدا کە لە شاری (میلان) لە کۆتایی سەدەی پانزەیەمدا وەرگێڕدرا بۆ لاتینی، چەند بەشێکی دواتر بۆ فەرەنسی و ئەڵمانی وەرگێڕدران.

هەروەها کتێبێکی کیمیایی نووسیوە کە وەرگێڕانەکەی بۆ لاتینی بەناوی کتێبی (سر الأسرار Secretum Secretorum) کراوە، لەم کتێبەدا چەندین ئامێری لێکۆڵینەوە و ئامادەکردنی کانزا و ئاوێتەکانی باس کردووە، ئەو کردارە کیمیاییانەی کە دەربارەی دواوە: دڵۆپاندن و کلساندن و شیکردنەوە و تواندنەوە و هەڵماندن و بلووراندن و زیادکردن و پالاوتن و مۆماندن و چەندین کارلێکی تر بوون.

هەروەها کتێبێکی تری بەناوی (كتاب في الجدري والحصبة) نووسیوە کە یەکێکە لە بەناوبانگترین دانراوەکانی و بەشێوەیەکی کلینیکی داهێنەر جیاوازی لەنێوان ئەم ٢ نەخۆشییەدا کردووە.

بەسە بۆ پایەبەرزیی ئەم پیاوە ودانانان بە لەپێشدەستیی لە زانستی پزیشکیدا کە یەکێك لە پێشکەوتووترین کۆلیجەکانی پزیشکی لە

ئەمریکادا کە سەر بە زانکۆی (پرنستۆن)ە بەناوی ئەم زانایەوە ناونراوە، ئەم زانایە کاتێك کۆچی دوایی کرد بە هەزاریی سەرینایەوە و هیچ پارە وپوولێکی دوای خۆی جێنەهێشت چونکە بە خۆڕایی و خۆبەخشانە چارەسەر و تیماری هەزارانی دەکرد و زۆر جاریش لە پارەی خۆی دەرمانی بۆ دەکڕین وهاوکاریی دەکردن.

## ئیبن سینا:

ناوی (الشیخ الرئیس أبو علي الحسین بن عبدالله ابن سینا)یە، لە نزیك شاری (بوخارا) لە ناوەڕاستی ئاسیا لەدایکبووە لە ساڵی (٣٧٠ك–٩٨٠ن) و لە شاری هەمەدان لە ساڵی (٤٢٨ك–١٠٣٧ن)دا کۆچی دوایی کردووە، هەر لە منداڵییەوە باوکی ناویەتە بەرخوێندن، زانستەکانی قورئان و ئوصولی دین و ئەدەب فێربووە لەگەڵ مەنتیق و گەردوونزانی و بیرکاری و جەبر، پاشان ئارەزووی خوێندنی زانستی پزیشکی کەوتە دڵەوە و دەستیکرد بە خوێندنی کتێبەکانی پزیشکی و بە ماوەیەکی کەم هەڵکەوتوو بوو تێیدا.

خۆی دەربارەی خوێندنی دەڵێت: حەزم لە خوێندنی پزیشکی کرد و بەماوەیەکی کەم توانیم تێیدا هەڵکەوتوو ببم بەشێوەیەك کە ناسراوانی پزیشکی دەهاتن لای من دەیانخوێند، پاشان بە چارەسەری نەخۆشەوە خەریك بووم و توانیم بە کردار چەندین جۆر چارەسەری نوێ لەسەر نەخۆشەکان فێرببم، تەمەنم لەم کاتەدا ١٦ ساڵ بوو!

پاشان فەلسەفە و مەنتیقم خوێند بەشەو و بەرۆژ کە یەك شەو بەتەواوی نەخەوتووم، کاتێکیش خەو زۆری بۆ دەهێنام کەمێك دەخەوتم

کە لە خەوەکەشمدا زۆر مەسەلەم بۆ روون دەبووەوە، بەم شێوەیە هەتاوەکو تەواو بەتوانا بووم لە هەموو زانستەکاندا و بەپێی توانای مرۆیی تێیاندا شارەزا بووم، هەر لە زانستەکانی مەنتیق و پزیشکی و سروشتی و بیرکاریش.

لەوکاتەدا فەرمانڕەوای بوخارا (نوح بن منصور الساماني) نەخۆشییەکی قورسی گرت و پزیشکەکان بێتوانابوون لە چارەسەری، باسی ئیبن سینایان لەلا کرد ئەویش بانگی کرد و دەستیکرد بە چارەسەری تاوەکو چاك بوویەوە.

ئیبن سینا داوای لێکرد کە کتێبخانەکەی سوڵتانی بۆ واڵا بکات، ئەوەبوو دەڵێت: (چوومە ماڵێکی چەندین ژوورەوە کە لە هەر ژوورێکدا چەندین دۆلاب کتێب هەبوو، کتێبی وام بینی کە هەرگیز ناویشیم نەبیستبوو، ئەو کتێبانەم خوێندەوە و سوودەکانیانم وەرگرت، تا تەمەنم گەیشتە ١٨ ساڵ ئیتر تەواو بووم لە فێربوونی هەموو ئەو زانستانە).




لە تەمەنی ٢٢ ساڵیدا باوکی مرد، پاشان لە ناوچەکانی خوارزم و خوراسان و تەبەرستان و ڕەی و قەزوین و هەمەدان و ئەصفەهان چەندین

کاری دەوڵەتی گرتەدەست، لە کۆتایی تەمەنیدا بەدەست چەندین نەخۆشییەوە دەینالآند کە خۆی چارەسەری خۆی دەکرد، کاتێکیش لە چارەسەر بێئومێد بوو تەوبەیەکی راستەقینەی کرد و هەموو حەقی خەڵکی بەسەریەوە دایەوە و بەندەکانی ئازاد کرد و بە قورئان خوێندنەوە خەریکبوو، بەشێوەیەك کە لە ٣ رۆژ جارێکدا خەتمێکی دەکرد تا لە رۆژی جومعەی مانگی رەمەزانی (٤٢٨ك)دا کۆچی دوایی کرد لە تەمەنی ٥٨ ساڵیدا.

ئیبن سینا یەکێکە لە رابەرانی بیری ئینسانیی لە سەردەمێکدا کە بە گەشدارترین چاخی شارستانییەتی زانستی دادەنرێت لە مێژوودا، زانایەکی هەڵکەوتوو بووە لە سەردەمی خۆیدا لە بوارەکانی پزیشکی و فەلسەفەدا[١٢١]، زیاد لە ١٠٠ کتێبی نووسیوە لەبوارەکانی پزیشکی و سروشتزانی و مەنتیق و ئیلاهیات، کە زۆریان کتێبی بەناوبانگن لە رۆژهەلات و رۆژئاواشدا، گرنگترینیان ئەمانەن:

(أقسام العلوم)، (الدستور الطبي)، (دفع المضار الكلية عن الأبدان الإنسانية)، (النبات والحيوان)، (القوى الطبيعية)، (حقائق الأشهاد في علم الكيمياء)، (تقسيم النفوس الأربعة: الفلكي، الحيواني، النباتي، والطبيعي)، و (الإنصاف) لە حیکمەدا، هەروەها (كتاب الشفاء) و

---

[١٢١] هەندێك لەو زانایانەی کە ناومان هێناون وەك (ئیبن سینا) لەبەرئەوەی لە زانستە ئاینییەکانی (حەدیس و تەفسیر و فیقە)دا شارەزا نەبوون، ئەمە وای کردووە کە بکەونە هەڵەوە لە هەندێ بیروڕای ئایینی و پرسە عەقیدەییەکاندا، بۆ نموونە (ئیبن سینا) لە بیروباوەڕدا لەسەر بۆچوونی قەرامیتە باتنیەکان بووە یان دەڵێن لەسەر بیروباوەڕی شیعە ئیسماعیلییەکان بووە لە شوێنکەوتووانی بیروباوەڕی (الحاكم بأمر الله ی فاتیمی)، بەلام لەبواری زانستە تاقیکاری و عەقڵییەکاندا بەڕاستی بلیمەت بوون و پێشڕەوی گەورەیان کردووە و توانیویانە ئەو هەموو داهێنان و پێشدەستییانە بکەن، ئەمەش بابەتی ئەم کتێبەیە.

کورتەکەی (النجاة) و (حي بن يقظان) لە فەلسەفەدا، و کتێبی (الإشارات والتنبیهات) کە تێیدا چەند باسێکی کردووە دەربارەی بابەتە سروشتییەکان و ئیلاهییات و تەصەوف و رەووشت.

لە کتێبی (الشفاء)دا فراوانی فەلسەفەی ئیسلامی دەرخستووە کە هەموو بابەتە مەعریفییەکان لەخۆدەگرێت، و لە ٤ بەش پێکهاتووە: مەنتیق کە شیعر و ووتاربێژیشی لەخۆگرتووە، بابەتە سروشتییەکان وەك: دەروونزانی و ئاژەڵناسی و رووەکزانی و چینەکانی زەوی (واتە جیۆلۆجیا)، بیرکاری کە بابەتەکانی: هەندەسە و حیساب و فەلەك و مۆسیقای لەخۆگرتووە، و ئیلاهییات کە فەلسەفە و سیاسەت و رەووشتی لەخۆگرتووە.

هەروەها کتێبی (القانون في الطب) کە مەوسوعەیەکی پزیشکییە و ژمارەی ووشەکانی نزیکەی ١ ملیۆن ووشەیە، لە رۆما لە ساڵی (١٥٩٣ن)دا بڵاوکرایەوە کە لە پێنج بەرگدا بوو و بەدوای یەکدا ئەم بەشانە بوون:

١- پزیشکی بەگشتی و کارئەندامزانی.

٢- زانستی تەندروستی و دەرمانەکان.

٣- زانستی نەخۆشییەکان (نەخۆشیزانی) هەموو ئەندامەکان.

٤- ئەو نەخۆشییانەی کە تایبەت نین بە ئەندامێکەوە و هەموو لەش دەگرێتەوە.

٥- زانستی ماددە پزیشکییەکان و دەرمانەکان و ئامادەکردنیان (کە پێشی دەووترێت: الأقراباذين).

ئەم کتێبە بۆ ماوەی ٦ سەدە بناغەی خوێندنی پزیشکی بوو لە زانکۆکانی فەرەنسا و ئیتاڵیادا (لە سەدەی دوانزەوە بۆ سەدەی

حەفدە)، کە لەگەڵ راڤەکەیدا ١٥ جار وەرگێڕدراوە بۆ زمانی لاتینی بەتەنها لە سەدەی پانزەهەمدا، بەگشتیش دەیان جار چاپکراونەتەوە، تەنانەت تا سەدەی نۆزدەیەمی زایینیش موحازە وبابەتی لەسەر دەووترایەوە، لە کتێبی (القانون)دا بۆ یەکەم جار باسی ئەمانە کراوە:

١- دۆزینەوەی زانستی کارئەندامزانی (فیسیۆلۆجی)، و وەسفێکی هەمەلایەنەی هەموو ئەندامەکانی لەش بەشێوەیەکی راست، بۆ نموونە بەشەکانی ماسولکەکان و ئێسکەکان بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر یەك یەك باس دەکات وەکو ئەوەی ئەمڕۆ زانراوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە هیچ هۆکارێکی زانستی نوێی ئەمڕۆی لەبەردەستدا نەبووە بۆ زانینی ئەو شتانە و لێکۆڵینەوەیان.

٢- دۆزینەوەی زانستی مادده پزیشکییەکان، و ئامادەکردنی زیاد لە ٧٦٠ چارەسەری نوێ بۆ نەخۆشییە جۆراوجۆرەکان.

٣- هەروەها لە کتێبەکەیدا شەرحی نەخۆشییەکانی سەر و ئێسکی سەر و مۆخی ئێسقان و چاو و گوێ و ددانەکان و قەفەزی سنگ و دڵ و سییەکان و ناوسك و ئەندامەکانی زاووزێ و باسی کۆرپەلەشی کردووە، هەروەها نەخۆشییەکانی پێست و دەست و قاچ، تەنانەت ئەوەندە بە ووردی باسی سیلی سییەکانی کردووە کە دەگاتە پلەی موعجیزەی زانستی چونکە ئەم هیچ ئامێرێکی پشکنین و وێنەگرتن و ئەشیعەی لەبەردەستدا نەبووە، بەڵام ئەمانەی ئەم باسی کردوون زانایانی زانستی پزیشکی نوێ هاوڕان لەگەڵیدا بە دانپێدانانی گەورە پزیشکان.

٤- باسی چۆنێتی ئامادەکردنی دەرمان بەشێوەی حەپلە ومەعجون وحەپ وشلەمەنییەکان کردووە وەك چۆن لەمڕۆماندا ئامادە دەکرێن.

٥- ئـیبن سـینا چارەسـەری شـێرپەنجەی مەمکیشـی کـردووە بـە دەرهێنان و داخکردن، هەروەها وەسفی چۆنێتی دروستبوون و داخکردنی شێرپەنجەی کردووە.

(Sir Thomas Clifford) دەڵێت: ئەوروپییـەکان باوەڕیـان وایـە کـە دانراوەکـانی ئـیبن سـینا لـە پزیشـکیدا کتێبـەکانی تریـان داپۆشـی و خستەلاوە، تەنانەت ئەوانەش کە (ئـەبوقرات) و (جـالینۆس) نووسـیویانە، هـەر لەبـەر ئەمـە دانراوەکـانی ئـیبن سـینا بـوون بـە سەرچـاوەیەکی باوەڕپێکراو بۆ خوێندنی پزیشـکی لـە کۆلیجـەکانی پزیشـکی ئـەوروپا بـۆ سەردەمانێکی دوورودرێژ[122].

هەروەها (ویلیام ئۆسلەر) دەڵێـت: کتـێبی (القـانون في الطـب)ی ئـیبن سینا سەرچـاوەیەکی پـیرۆزی لێکۆڵینـەوە پزیشـکییەکان بـووە، کـە ئـەم پلەیـەی پاراسـت بـۆ ماوەیـەك کـە هـیچ دانراوێکـی تـر ئەوەنـدە نەماوەتەوە[123].

(Rom Landau) دەڵێـت: ئـیبن سـینا لـە بوارەکـانی بیرکـاری و مۆسـیقا و جیۆلـۆجی و رووناکیزانی و کێشـکردنی زەوی و گـەرمی و جووڵەدا دانراوی هەیە کـە بەهـەمان شـێوە و ئوسـلوبی سـادە و سـاکاری دانراوە پزیشکی و فەلسەفییەکانێتی، دەتوانین بڵـێین کـە ئـیبن سـینا بـە مێشك فراوانی و زیرەکی و زەوق سەلیمی و رەچاوکردنی شـتە باشـەکانی ژیان و هەروەها بە سروشتی ژیـانی کـە پڕبـووە لـە موغامـەرە، بـووە بـە پێشـەوا و رابـەرێکی کەسـایەتییەکانی سـەردەمی راپـەڕین لـە ئیتاڵیـادا،

---

[122] بڕوانە: (Encyclopedia Britannica)

[123] بڕوانە: (The Evolution of Medical Science).

بەڵکو پێش ئەوانیشی داوەتەوە بە تایبەتی لە ترسانی راستەقینەی لە خودا و خۆپارێزییەکەیدا، ئێمە دەزانین کە ئیبن سینا کاتێك مەسەلەیەکی لێ ئاڵۆز دەبوو دەچوو بۆ مزگەوت و لەوێ بۆ پەرستن دەمایەوە و زۆر جار چەندین سەعات لە نوێژدا دەبوو، نەك ئەمەش بەتەنها بەڵکو هەر کاتێکیش کە دەگەیشتە شیکاری مەسەلەیەکی قورس رووی دەکردە مزگەوت بۆ سوپاسگوزاریی خودا بۆ ئەو نیعمەتەی پێی بەخشیوە[124].


ئیبن سینا

ئیبن سینا کاریگەرییەکی گەورەی کردە سەر رۆژهەلات و رۆژئاوا، کتێبەکانی هەر زوو وەرگێردران بۆ لاتینی، بەڵکو بۆ هەموو زمانە ئەوروپییەکانیش، فەیلەسووفە موسوڵمانانەکانی دوای ئەو بە قووڵیی پێی کاریگەر بوون، فەیلەسوفەکانی تریش پێی کاریگەر بوون لەوانە (دانتێ)ی ئیتالی، کە ئەمیش بەرزی دەکاتەوە بۆ ئاستی (ئەبوقرات) و (جالینۆس) لە زانستی پزیشکیدا.

کتێبە پزیشکی و فەلسەفییەکانی وەرگێردرانە سەر زمانی لاتینی و سەرچاوەیەکی بەپێزی زانیارییەکانی ئەوروپا بوو بۆ چەندین سەدە، لە رۆژئاوادا بە (Avicenna) ناسراوە، بۆ ماوەی هەزار ساڵ پارێزگاریی لە نازناوی خۆی کرد وەك یەکێك لە گەورەترین فەیلەسووفان و زانایانی پزیشکی لە مێژوودا.

---

[124] بروانە (الإسلام والعرب) لا ٢٦٣- ٢٦٤.

**کیندی:**

ناوی (أبویوسف یعقوب بن اسحق الکندي)یە، لە (٨٠١ز) لە بەسرە لەدایکبووە و لە دەوروبەری ساڵی (٢٥٧ك)دا کۆچی دوایی کردووە، لە رۆژئاوا بە (Alkindus) ناسراوە، بە فەیلەسووفی موسوڵمانان و دانەری فەلسەفەی ئیسلامی دادەنرێت، لە شاری (کوفة) لەدایکبووە و لە شارەکانی (بەغدا و بەسرە) خوێندوویەتی، پەیوەندییەکی توند و تۆڵی هەبووە لەگەڵ خەلیفە عەبباسییەکان (المأمون، والمعتصم، والمتوکل)، لە زۆر بواری زانستیدا نووسینی هەیە وەك: فەلسەفە، و حیساب، و هەندەسە، و فەلەك، ئەستێرەگەری، و رۆژژمێری وولاتان و مۆسیقا، و پزیشکی و زانستە سروشتییەکان، ژمارەی کتێب و نووسینەکانی لە زانستەکاندا لە (٢٤٠) تێپەریوە، هەندێکیان بەم شێوەیە بوون:

٢٢ لە نووسینە فەلسەفییەکانی بەجیا لە ٢ بەرگدا لەژێر ناونیشانی (نامە فەلسەفییەکانی الکندي) چاپکراوە، ٩ کتێب لە مەنتیقدا، لەبواری بیرکاری و حیسابدا ١١ دانراوی هەبووە، ٢٣ کتێب لە هەندەسەدا، ٢٠ کتێب زیاتری لە فەلەکدا هەبووە، ٢٢ کتێب لە پزیشکیدا، و ٥ کتێبی دەروونزانی.

کیندی بۆچوونە فەلسەفییە یۆنانییەکانی وەرگرت و گۆڕانکاری تێداکردن و لە بیروباوەڕی ئیسلامی نزیکی کردنەوە (لێرەوە زانستێکی نوێ پەیدابوو کە پێی دەووترێت زانستی کەلام)، ئەم داندەنێت بەوەدا کە گەردوون لە نەبوونەوە پەروەردگار دروستی کردووە، و لە رۆژی دواییشدا زیندوو بوونەوە هەیە، و دەیووت کە پەروەردگار باڵادەست و بەتوانایە بەسەر هەموو شتێکدا، هەروەها کیندی رای وابووە کە

پێغەمبەرایەتی بەرزترین پلەیەکە کە مرۆڤەگان پێی بگەن، و پێغەمبەرانیش زانیارییەکی خوداییان هەیە کە لەرێی نیگاوە پێیان گەیشتووە، کە ئەمە بریتییە لە بەرزترین پلەکانی مەعریفەی مرۆڤایەتی، کەواتە بەپشت بەستن بەمە ووتوویەتی کە قورئان راستییە فەلسەفییەکانیشی بۆ مرۆڤەکان روون کردۆتەوە.




## فارابی:

ناوی (أبونصر محمد بن محمد بن أوزلغ بن طرخان) بووە و بە رەچەڵەك تورکە، ئەم زانایە لە شاری (فاراب) لە ناوەڕاستی ئاسیا لەدایکبووە (٢٥٩ك-٨٧٠ن)، لە (بەغدا) فەلسەفە و بیرکاری و پزیشکی خوێندووە، و دوایی چۆتە شاری (حەلەب) و لەوێ ژیاوە، کۆتایی ژیانی ساڵی (٣٣٩ك-٩٥٠ن) بووە لە شاری دیمەشق، ئەم زانایە بە (ئەرستۆ)ی یۆنانی ووتووە (مامۆستای یەکەم) چونکە یەکەم کەس بووە کە بابەتەکانی مەنتیقی کۆکردۆتەوە و شیکردوونەتەوە، دواتر خۆیشی بە (مامۆستای دووەم) ناوبراوە لەبەرئەوەی فەلسەفەی یۆنانی کۆکردۆتەوە و رێکی خستوون و شیکاری کردوون، زۆر کاریگەر بووە بە کتێبەکانی (ئەرستۆ)ی یۆنانی کە خۆی دەڵێت: کتێبی (سروشت)ی ئەرستۆم ٤٠جار خوێندۆتەوە، و کتێبی (النفس)م ٢٠٠جار خوێندۆتەوە!

بە هەژاری ژیاوە و مردووە، (ئیبن خەلەکان)ی مێژوونووس دەربارەی دەڵێت: (دنیا نەویستترین کەس بووە کە گرنگی نەداوە بە هیچ دەستکەوتێك یان دەستخستنی جێگە وماڵێك) رۆژانە تەنها بە ٤ درهەم

دەژیا، لەپاش خۆی ٣٩ کتێبی ماوەتەوە، یەکێك لە دانراوەکانی بریتییە لە (آراء أهل المدینة الفاضلة) کە تێیدا سیستەمی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی نموونەیی شیکار کردووە.

هەروەها ئەم کتێبانەش لە دانراوی ئەون: (إحصاء العلوم) کە هەموو زانستەکانی سەردەمی خۆی تێدا کۆکردۆتەوە لە فەلسەفە و مەنتیق و بیرکاریی و سروشتزانی و کیمیا و ئابووری و سیاسەتدا، هەروەها کتێبەکانی: (تحصیل السعادة)، و (رسالة في العقل)، و (رسالة في مایصح وما لایصح من أحکام النجوم)، و (کتاب شرح السماء والعالم)، و (کتاب السیاسة المدنیة)، و (کتاب الموسیقي)ش لە دانراوی ئەون، پزیشکێکی وردەکار و ناسراویش بووە، لە کۆتایی ژیانیدا وازی لە گومانەکانی هێناوە و گەڕاوەتەوە بۆ دەستگرتن بە دینەوە.

مێژوونووسانی مێژووی زانست لەمڕۆدا هاوڕان لەسەر ئەوەی کە مامۆستایانی مرۆڤایەتی سیانن: (ئەرستۆ)ی یۆنانی و (ئیبن سینا)ی بوخاری موسوڵمان و (فارابی) تورکی موسوڵمان، بە یەکێك لە هەرە ناسراوترین فەیلەسووفەکان دانراوە لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا، کۆڕ و کۆمەڵە زانستییەکان لە جیهاندا لە پەنجاکانی سەدەی ڕابوردوودا ئاهەنگیان گێڕا بەهۆی یادی هەزار ساڵەی کۆچی دوایی ئەم زانا موسوڵمانەوە.



## ئیبن روشد:

کتێبەکانی فەیلەسووفەکانی ڕۆژهەڵات گەیشتنە ڕۆژئاوای ئیسلامی و ئەندەلوس و بوونە هۆی دروستکردنی جووڵانەوەیەکی فەلسەفی

تێیدا، کە بەناوبانگترین کەسانی بریتی بوون لە: (ئیبن باجە) کە ساڵی (٤٢٣ك-١١٣٨ن) مردووە، و (ئیبن طوفەیل) کە ساڵی (٥٨١ك-١١٨٥ن) لە (مراکیش) کۆچی دوایی کردووە و گرنگترین کتێبی بریتییە لە چیرۆکی فەلسەفی (حيّ بن يقظان).

هەروەها ئیبن روشد (کە ناوی أبوالوليد ابن رشد)ە، ساڵی (٥٢٠ك-١١٢٦ن) لە قورتوبە لەدایکبووە و ساڵی (٥٩٥ك-١١٩٨ن) کۆچی دوایی کردووە، یەکێکە لە گەورەترین فەیلەسووفە موسوڵمانەکان، چەندین کاری حکومی کردووە و لە خزمەتی فەرمانڕەوای موەحیدین (أبو يعقوب يوسف بن المنصور)دا وەك پزیشك کاریکردووە، لە رۆژئاوا بە (Averroes) ناسراوە، (رۆم لانداو) لە کتێبی (مآثر العرب في النهضة الأوربية)دا دەربارەی دەڵێت: فەیلەسوفە رۆژئاواییەکانی ئەمڕۆ ناتوانن بگەنە ئاستی ئەمڕۆیان هەتاوەکو ئەنجامەکانی ئیبن روشدیان لە فەلسەفەدا دەست نەکەوێت.

چەند کتێبێکی داناوە کە زوربەیان بریتین لە کورتکردنەوە و شیکردنەوەی دانراوەکانی (ئەرستۆ) کە وەرگێڕدرابوونە سەر زمانی عەرەبی، و لێرەوە جارێکی تر وەرگێڕدرانەوە سەر زمانی لاتینی لەگەڵ شیکردنەوەکانی ئیبن روشد و کاریگەرییەکی قووڵیان کردە سەر بیری فەلسەفی و ئاینی یەهوودی و مەسیحی لە ئەوروپادا، لە گرنگترین دانراوەکانی ئیبن روشد بریتین لە: (كتاب السماء والعالم) و (كتاب ما بعد الطبيعة) و (الكليات في الطب) و (تهافت التهافت)، و (فصل المقال فيما بين الحكمة والشريعة من الإتّصال) کە تێیدا پەیوەندی نێوان فەلسەفە و ئاین ڕووندەکاتەوە و دەڵێت کە هەردووکیان یەك ڕاستییان هەیە، بەڵام

هەریەك لە ئاین و فەلسەفە بە ڕێگای تایبەتی خۆیان پێیدەگەن و بە شێوازی تایبەتی خۆیان تەعبیری لێدەکەن.

## میسکەوەیە:

یەکێکە لە گەورەترین ئەو زانایانەی کە لە بواری ڕەووشت و ئەخلاقدا لێکۆڵینەوەی هەیە، ناوی (أبوعلی أحمد بن محمد مسکویە)ە، نزیکەی ساڵی (٣٣٠ك) لەدایك بووە و ساڵی (٤٢١ك–١٠٣٠ز) کۆچی دوایی کردووە، فەیلەسووف و پزیشك و مێژوونووس بووە، لە گرنگترین کتێبەکانی لە بواری ڕەووشتدا (تهذیب الأخلاق وتطهیر الأعراق)ە، کە مەبەستی تێیدا بریتی بووە لە ڕوونکردنەوەی مانای بەختەوەری (السعادة) کە بریتییە لە ئامانجی مرۆڤ، و باسی هۆکارەکانی دەستکەوتنی دەکات.

کورتەی فەلسەفەی (میسکەوەیە) لە ڕەووشتدا ئەوەیە کە خێر و چاکە ئەو هۆکارەیە کە مرۆڤ بەهۆیەوە دەگاتە کامڵبوونی بوونەکەی، مرۆڤەکانیش جیاوازن لە ئامادەباشییان بۆ وەرگرتنی خێر، لە وەسێتنامەکەیدا بۆ قوتابیانی حیکمەت وفەلسەفە ئەخلاقییەکەی خۆی ڕوون دەکاتەوە، کە داوا دەکات قوتابی حیکمەت چوار سیفەتی بەرزی تێدابێت: حیکمەت، ئازایەتی، دەس ودەم وداوێنپاکی، ودادپەروەری، هەروەها ئەم وەسێتانەش: پێش خستنی هەق بەسەر ناهەقدا لە بیروباوەڕدا، و ڕاستگۆیی بەسەر درۆدا لە ووتەکاندا، و خێر بەسەر شەڕدا لە کردەوەکاندا، و جیهادی بەردەوامی دەروون، و پاراستنی بەڵێنەکان، و بیرکردنەوە لە بابەتەکان پێش دەربڕینی ڕای خۆت و سەرف کردنی

تەمەن لە شتی بەسوودا، وازهێنان لە ترسان لە مردن و هیممەت بەرزی، بەڵام لەیاد نەکردنی نەخۆشی لەکاتی لەشساغیدا، و غەم و پەژارەت لەکاتی خۆشیدا، و دڵئارامی لەکاتی تووڕەبووندا، و بەهێزیی هیوا و نیازی چاك و دڵنیابوون لە بەزەیی خودا.

## ئیبن خەلدون:

ناوی (أبو زيد عبدالرحمن بن محمد بن محمد بن محمد بن الحسن بن محمد بن جابر بن خلدون الحضرمي التونسي)یە (٧٣٢-٨٠٨ك) (١٣٣٢-١٤٠٦ن).

هەر لە منداڵییەوە خرایە بەرخوێندن کە حەوت خوێندنەوەکەی قورئان فێربوو لەگەڵ فێربوونی زانستە شەرعییەکان لە فەرموودە و تەفسیر و فیقهی مالیکی، پاشان زانستەکانی زمانەوانی و فەلسەفە و مەنتیقیشی خوێند، ئەم زانایە بە کتێبی پێشەکییەکەی (مقدمة إبن خلدون) ناوبانگی دەرکرد کە وەك سەرەتایەك داینا بۆ کتێبێکی مێژوویی کە نووسی و ناوینا (كتاب العبر وديوان المبتدأ والخبر في أيام العرب والعجم والبربر ومن عاصرهم من ذوي السلطان الأكبر)، کە لەم پێشەکییەیدا بۆچوونە پەروەردەییە ناوازەکانی لە بواری کۆمەڵناسیدا دەخاتەروو.

سەرەتای ژیانی وەك نووسەرێك بۆ وەزیری خەلیفەی حەفصی (أبي إسحاق) لە تونس کاریکردووە کە تەمەنی تەنها (١٧ ساڵ) بووە، پاشان لە دەوڵەتەکانی (بنو عبدالواد و بنو مرين)یشدا کاری کردووە، ساڵی (١٣٦٥ن) چووە وڵاتی ئەندەلوس بۆ لای سوڵتانی غەرناتە، پاشان

کۆچی کرد بۆ ئیسکەندەرییە و لەوێوە بۆ قاهیرە کە لە هۆڵەکانی (الجامع الأزهر)ی بەناوبانگدا وانەی بە قوتابیان دەووتەوە، پاشان هەر لەوێ کرا بە قازی و چەند جارێك ئەم پۆستەی وەرگرت، کۆتایین هەوڵی سیاسیشی بریتی بوو لە بینینی پاشای مەغۆل (تەیمورلەنگ) لەکاتی ئابلۆقەی سوپاکەیدا بۆ شاری (دیمەشق) لە ساڵی (٨٠٢ك-١٤٠٠ن)، لە رۆژی ٢٦ی رەمەزانی (٨٠٨ك) لە تەمەنی ٧٦ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

لەم ماوە دوورودرێژەی ژیانیدا ئیبن خەلدون لە خزمەتی زۆرێك لە کاربەدەستدانی ئەندەلوس و مەغریب و میسردا کاری کردووە، لە ژیانیدا زۆر گرنگی داوە بە دەستخستنی زانست و گەڕانی زۆری بۆ ئەو مەبەستە کردووە، گومان لەوەشدا نییە کە کۆبوونەوەی زیرەکی و شارەزایی و زانست لە کەسێتی (ئیبن خەلدون)دا بووەهۆی ئەوەی کە ئەو بەرچاو روونییە گەورەیەی پێبدەن لە بۆچوونە نایابەکانی لەبواری سیستەمە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکاندا کە لە رۆژگاری ئەمڕۆدا پێیدەووترێت زانستی کۆمەڵناسی مرۆیی (علم الإجتماع البشري)، هەروەها بارودۆخی تایبەتی خۆی و دەردەسەرییەکانی ژیانی وایان لێکرد کە چەند بۆچوونێکی مرۆیی راستگۆیانەی هەبێت بۆ جووڵانەوەی مێژووی مرۆڤایەتی و لێکدانەوەی گۆڕانکارییەکانی.

مێژوو لای (ئیبن خەلدون) تەنها چەند رووداوێکی بەدوای یەکدا هاتوو نین بەڵکو ئەم پەردەی لادا لەسەر ئەو یاسایانەی کە جووڵانەوەکەی کۆنترۆڵ دەکەن، دەڵێت: {مێژوو زانستێکی سەربەخۆیە چونکە خاوەنی بابەتێکی تایبەتییە کە بریتییە لە ئاوەدانی مرۆیی (العمران البشري) و کۆبوونەوەی ئینسانەکانە (الإجتماع الإنساني)، و خاوەنی چەندین

مەسەلەیە و روونکەرەوەی دیاردەکان و حاڵەتەکان بەدوای یەکدا، کە ئەمەش سیفەتی هەموو زانستێکە جا دانراو بێت یان عەقڵی}[١٢٥].


ئامێری ئەواوکاری یان ئەختەکەی (ئیبن ماجید) کەبریتییە لەتەختەیەکی چوارگۆشە کەلەناوەڕاستیدا پەتێك بەستراوە. کە بەماوەماوە گرێدراوە بە حیسابی سایەئەواری گۆشەی نێوان ئاسۆ وچاوی تێبینەر ونەستێرەکە

## ئیبن ماجید:

ناوی (شهاب الدین أحمد بن ماجد) بووە، لە سەدەی پانزەیەمی زایینیدا ژیاوە، لە کتێبی (زەریا-المحیط)دا کە دانراوی ئەدمیرالی تورکی (سیدی علي بن حسین)ە ناوی هاتووە و زۆر وەسفی کراوە، گەشتیاری پورتوگالی (ڤاسکۆ دی گاما) باسی هاوەڵێتی ئەمی کردووە لە یەکێك لە گەشتەکانیدا و ناوی ناوە (کانا کان)، پرۆفیسۆر (ڤیران) دەڵێت: {کتێبەکانی (إبن ماجد) زانیاری زۆر چڕی تیۆری و پراکتیکییان تێدایە دەربارەی زانستی کەشتیاری (علم الملاحة)}، لەسەر ئەم بنەمایە دەڵێت: (دەتوانین بڵێین ئەم کتێبانە بناغەی زانستی کەشتیاری نوێن)، هەروەها (جەیمس بێن نەسیب) دەڵێت: (یادەوەری ئیبن ماجید و کارەکانی تا سەرەتای سەدەی

---

[١٢٥] بڕوانە (مقدمة إبن خلدون)/ ل٤٠٠.

نۆزدەیەم لە هیندستان و دورگەکانی مالدیف زیندوو بووە، و پشتیان بەستووە بەو یاسایانەی کە ئەم دایناوە لە بواری زانستی کەشتیاریدا).




دابەشکردنەکانی (ئیبن ماجید) بۆ ناوموەی قیلەنوما کە لە رۆژگاری ئەمرۆشدا هەمان دابەشکردنە بەڵام بەناوی جیاوازەوە کە لە دەرەوەی بازنەکە نوسراوە

ئەو زانایانەی باسمان کردن دەتوانین بڵێین ناوە پرشنگدارەکانی مێژووی گەشەسەندنی زانستن لەلای موسوڵمانان، بەڵام لەگەڵ ئەو دواکەوتنە گەورەیەی کە موسوڵمانان تووشی هاتوون لەبواری زانست و تەکنەلۆجیادا لەمرۆماندا و بەدرێژایی سەدەکانی (١٩ و ٢٠)، بەڵام ئەم سەردەمە بە تەواوەتی خاڵی نەبووە لە دەرکەوتنی تاکوتەرای هەندێك زانای ناودار و پێشەنگ لەسەر ئاستی جیهان لە هەندێك بواری زانستیدا، کە شانازییان بە ئاینەکەی خۆیانەوە کردووە و هەرگیز نەیانوتووە کە ئیسلام مایەی دواکەوتنی موسوڵمانانە، یان رێگر بوبێت لەبەردەم ئەواندا بەتایبەتی بۆ دەسخستنی زانستی تاقیکاریی ئەمرۆ وداهێنان تێیدا، ئێستاش پێم خۆشە هەندێك نموونە لەو زانایانە بهێنمەوە:

## ئەلسەباح:

ناوی (حسن کامل بن علي الصباح) بووە، و لە نزیکەی (٧٠)ساڵێك پێش ئێستا کۆچی دوایی کردووە (لە سەدەی چواردەیەمی کۆچیدا)، خەڵکی خوارووی لوبنان بووە، گرنگی داوە بە زانستەکانی بیرکاری و هەندەسە، و لەسەر باڵۆنەکان کاری دەکرد، ماوەی چەند ساڵێك لە ئەمریکا ئەندازیاریی کارەبایی خوێندووە، هەر لەوێ (٦٧) داهێنراوی هەیە بەناوی خۆیەوە، کە (١١)یان بە هاوبەشی لەگەڵ خەڵکی تردا بووە.

بەهۆی رووداوی ئۆتۆمبێلەوە گیانی لەدەستداوە، چەندین نووسینی هەیە سەبارەت بە شیکارکردنی بیردۆزی رێژەیی لە گەردوون و فەزادا، لە گرنگترین داهێنراوەکانی ئامێرێکی پەخشکردنی تەلەفیزیۆنییە کە بەکاردەهێنرێت بۆ پەخش کردنەوەی ئەلیکترۆنی، پەخشکەرێکی وێنە و دیمەنەکان، و ئامێرێك کە تیشکی خۆر دەکاتە هێزێکی کارەبایی، و ئامێرێك بۆ بەتاڵ کردنەوەی هێزی کارەبایی لە فەزادا.

## د. ئەحمەد زوێل:

ناوی (ئەحمەد حوسنی زوێل)ە، لە (١٩٤٦/٢/٢٦) لە شاری (دەمەنهور)ی میسر لەدایکبووە، کۆلیجی زانستی زانکۆی (ئیسکەندەریە)ی ساڵی (١٩٦٧) تەواو کردووە بەپلەی باڵاو بەیەکەم، پاشان لە ٨ مانگدا خوێندنی (ماجستێر)ی تەواو کردووە، ساڵی (١٩٦٩) کۆچی کردووە بۆ ئەمریکا بەهۆی زەمالەیەکی زانکۆی (پەنسلڤانیا)وە و خوێندنی (دکتۆرا)ی لە (کیمیای لەیزەریی)دا تەواو کرد ساڵی (١٩٧٣)، ٨ زانکۆی ئەمریکا زەمالەی توێژینەوەیان پێبەخشی بەڵام لەناویاندا

زانکۆی (کالیتك)ی هەڵبژارد لەبەرئەوەی ٢٥ مامۆستای ئەم زانکۆیە خەڵاتی (نۆبڵ)یان وەرگرتووە، ئۆفیسێکی باشی پێدرا بە یەك مەرج کە لە ماوەی ٦ ساڵدا توێژینەوەیەك بکات کە گرنگیی زانستی هەبێت و پاش ئەمە دەکرێت بە مامۆستای زانکۆکە، بەڵام (د. زوێل) تەنها لە ماوەی ٤ مانگدا توێژینەوەیەکی گرنگی ئەنجامدا کە لە گۆڤارە زانستییەکانیشدا بڵاوکرایەوە.

پلەی (پرۆفیسۆر)ی پێبەخشراوە و تا ئێستا خاوەنی (٢٧٠) توێژینەوەی گرنگە لەبواری لەیزەردا، ٢٣ خەڵاتی ئەمریکی پێبەخشراوە بێجگە لە خەڵاتی وولاتانی تر، ئەندامێتی کۆمەڵەی ئەمریکی بۆ زانستەکان و هونەرە مرۆییەکانی پێبەخشراوە، کورسی (لینەس پاولینگ Linus Carl Pauling)ی پێبەخشرا، کە زانایەکی فیزیای بەناوبانگە و (٢) جار خەڵاتی (نۆبڵ)ی پێبەخشراوە و ساڵی (١٩٨٨) نازناوی (ئاینشتاین)ی سەدەی (٢١)ی پێبەخشرا بۆ دۆزینەوەی فیمتۆ چرکە (Fimto second)، کە بووە هۆی دیاریکردنی تەمەنی گەردوون زۆر بە ووردیی و دەرگایەکی نوێی کردەوە لەبەردەم چارەسەری نەخۆشییەکانی سەرەتاندا، (فیمتۆ چرکە) بریتییە لە یەك بەش لە ملیۆن بلیۆن بەشی چرکەیەك!

(د. ئەحمەد زوێل) ساڵی (١٩٩٩) خەڵاتی (نۆبڵ)ی پێبەخشرا لە (کیمیا)دا بەهۆی پێوانی خێرایی گەردیلەکان لەکاتی جووڵانیاندا بە بەکارهێنانی لەیزی هەرە خێرا، ئەمە بووە هۆی دروستکردنی زانستی نوێی وەك (فیمتۆ کیمیا) و (فیمتۆ بایۆلۆجی).

(د. زوێل) رای وایە کە خەڵکی رۆژهەڵات پێشدەستی گەورەیان هەبووە لە بواری زانستدا، بۆ نموونە میسرییە کۆنەکان پێش (٦٠٠٠) ساڵ

یەکەم کەس بوون کە ووتوویانە ساڵ لە (٣٦٥.٢٥) ڕۆژ پێکدێت، هیوای وایە لە میسر بە تایبەتی بتوانێت زانکۆیەکی جیهانی زانستی دروست بکات کە نموونەی ئەمانەتی زانستی بێت و بلیمەتان و هەڵبژێردراوان لێیی وەربگیرێن، کە ژمارەیان لە (٢٠٠٠ کەس زیاتر نەبێت) ئەمەش بە مەبەستی زیندووکردنەوەی ئوممەتەکەمان و ڕاپەڕینی لەخەوی دوور ودرێژی، (د.ئەحمەد زوێل) خاوەنی ئەم خەڵاتانایە:

- بەرزترین نیشانێك لە ئەمریکادا کە بۆ زانست دەبەخشرێت لەلایەن دەزگای (بنجامین فرانکلین)ەوە، کە هەمان ئەم خەڵاتە پێشتر بەخشراوە بە (مادام کۆری، و ئەلبێرت ئاینشتاین، وهەردوو برا رایت، وئەدیسۆن)، هەروەها ناوی لە کتێبی مێژوویی زانایانی ئەمریکادا تۆمارکراوە.
- نیشانی (لیۆناردۆ داڤینشی) پێبەخشرا لە (فەرەنسا).
- خەڵاتی (مەلیك فەیصەل)ی پێبەخشرا بۆ ساڵی (١٩٨٩).
- خەڵاتی وەکالەتی فەزای ئەمریکا (ناسا) بۆ ساڵی (١٩٩١).
- نیشانی (میسر) بۆ زانستەکان لە ساڵی (١٩٩٥).
- وولاتی (سویسرا)ش خەڵاتی ئاڵتوونیی دەوڵەتی پێبەخشی.
- خەڵاتی (نۆبڵ) لە کیمیادا ساڵی (١٩٩٩).

## د. فاروق الباز:

خەڵکی وولاتی میسرە و لەوێ لەدایکبووە، ساڵی (١٩٥٨) بڕوانامەی بەکالۆریۆسی وەرگرت لە کیمیا و جیۆلۆجیدا لە زانکۆی (عین شمس) لە قاهیرە، ساڵی ١٩٦٠ د.فاروق کۆچی کرد بۆ ئەمریکا و تەنها لە ماوەی ١ ساڵدا بڕوانامەی ماستەری لە زانکۆی (میزۆری) وەرگرت، پاشان ساڵی ١٩٦٤ بڕوانامەی (دکتۆرا)ی وەرگرت پاش تەواوکردنی خوێندنی لە

زانكۆی (میزۆری) و پەیمانگای (ماساچوستس) بۆ تەكنەلۆجیا لە شاری (كەمبریدج).

بێگومان كەسێكی ئاوا بەتوانا ناشارێتەوە لەبەرچاوی لوتكە و قەڵاكانی زانستدا، هەربۆیە دەستی كرد بە ووتنەوەی زانستی جیۆلۆجیای نوێ لە زانكۆی (میزۆری) بۆ ماوەی ساڵێك، پاشان زانكۆی (هایدلبێرگ) لە ئەڵمانیای رۆژئاوا رایكێشا و بۆ ساڵێكی تر تا ساڵی ١٩٦٥ وانەی دەووتەوە كە لەم كاتەدا چەندین توێژینەوەی ئەنجامدا لەسەر پێكهاتەی كیمیایی شوهوب و نەیزەكەكان.

پاشان گەڕایەوە بۆ میسر و لەگەڵ كۆمپانیای (پان ئەمەریكان) بۆ گەڕان بەدوای نەوتدا كاریدەكرد لە ساڵی ١٩٦٦زدا لە كەنداوی سوێس، پاشان كۆمپانیای كارگەكانی (بێڵ) رایكێشا بۆ كاركردن لەوێ لە ساڵی ١٩٦٧دا كاتێك كە بە جیددی بەشداریكرد لە لێكۆڵینەوەكانی فەزادا، كاری (د. فاروق الباز) تەنها شتێكی رۆتینی نەبووە لە كۆمپانیای كارگەكانی (بێڵ)دا بەڵكو بەرپرسیارێتییەكی خەتەرناك بووە بۆ ئەم كەسە هەڵكەوتووە، لەماوەی ٦ ساڵی زێڕینی زانستەكانی فەزا و دەستكەوتەكانیدا (لە ساڵی ١٩٦٧ بۆ ١٩٧٢) د. فاروق كاریكرد وەك سەرپەرشتیاری نەخشەكێشانی لێكۆڵینەوەكانی مانگ و دۆزینەوەكان لەسەر رووی مانگ، هەربۆیە بەشداریكرد لە پلاندانان و هەڵسەنگاندنی بەرنامەی وەكالەتی نیشتمانی فرۆكەوانی و فەزای ئەمریكا (ناسا) بۆ گەشتە خولگەییەكانی مانگ، هەرئەمەندە بەس نەبوو بۆ بلێسەی تێكۆشان و زیرەكی و بیرتیژی د. فاروق الباز، بەڵكو كاریشی كرد لەو گروپە زانستییانەی پاڵپشت بوون بۆ ئامادەكردنی گەشتەكانی ئەپۆڵۆ بۆ

سەر مانگ، هەروەها پلەوپایەیەکی تریشی بەدەست هێنـا وەك سـکرتێری (لیژنـەی هەڵبـژاردنی شـوێنەکانی نیشـتنەوەی کەشـتییەکانی بەرنامـەی ئـەپۆلۆ لەسـەر رووی مـانگ)، کـە ٦ جێگـەیان هەڵبـژارد بـۆ نیشـتنەوەی کەشـتییە ئاسمانییـەکان بـە پشـت بەسـتن بـەو وێنانـەی کـە کەشـتییە بێمرۆییەکانی تر گرتبوویـان بـۆ مـانگ، و بـە دانپێـدانانی وەکالـەتی ئاسا باشترین شوێنبوون بۆ نیشتنەوەی کەشتییەکانی مانگ.

دەربارەی جیۆلۆجیای مانگ ئەوەندە شـارەزابووە کـە وای لـە یـەکێك لە کەشتییەوانەکان کرد بڵێ: ئایا تۆ پێش ئێمە لەسەر رووی مانگ بوویـت ئـەی فـاروق؟! ئـەویش لەبەرئـەوەی کـە د. فـاروق رێنیشـانی ئـەو کەشتییەوانەی کرد بۆ ئەوەی بچێت بۆ شوێنێکی دیـاریکراو کـە بـەردێکی خاوەن پێکهاتەیەکی تایبەتی لێبوو بۆ وەرگرتنی نموونە لێی!!

لەگەڵ ئەم هەموو ئەرکانەیدا د. فاروق متمانەی بەخۆی بوو بۆ ئەوەی وەك سەرۆکی تیمی راهێنانی زانستیش کاربکات بۆ هەڵبـژاردنی نموونـەی بەردەکان و هەروەها وێنەگرتنی مانگ لەلایەن کەشتییەوانەکانەوە.

دوای تەواوبوونی بەرنامەی ئـەپۆلۆ لـە سـاڵی (١٩٧٣)دا پەیوەنـدیکرد بـە قەڵایـەکی زانسـتی تـرەوە کـە پـەیمانگای (سمیسـتونیان) بـوو لـە (واشـنتۆن) و لـە مۆزەخانـەی نیشـتمانی ئاسمـان و فـەزا ی سـەر بـەم پەمانگەیـە سـەنتەری لێکۆڵینـەوەکانی زەوی و هەسارەکانی دروسـتکرد، کۆمەڵـە زانسـتییە پسـپۆڕەکان پێشـبڕکێیان دەکـرد لـە بـانگکردنی بـۆ ئەنـدامێتییان کـە لێـرەدا بـواری ناوهێنـانی هـەموویان نییـە، لەوانـە: کۆمەڵـەی جیۆلـۆجی ئـەمریکی، و یـەکێتی ئـەمریکی بـۆ پێشـکەوتنە زانستییەکان، و یەکێتی شاهانەی بـەریتانی بـۆ زانسـتەکانی فەلـەك پلـەی ئەندامێتییان پێبەخشی.

(د. الباز) چەندین بڕوانامەی ڕێزلێنـان و پلـەی فـەخری پێبەخشـراوە لەوانە: بڕوانامەیەکی ڕێزلێنان لـە لێکۆڵینـەوەی خامـەکان و کانزاکانـدا لـە هەیئـەی ویلایەتـە یـەکگرتووەکان بـۆ کانـەکان، هـەروەها مـەدالیای دەسـتکەوتە زانسـتییە بـەرزەکان لـە وەکالـەتی (ناسـا)وە، و خـەڵاتی سەرکەوتووەکان لە کۆمەڵەی جیۆلۆجی ئەمریکی، و نیشـانی ئیسـتیحقاق لە پلەی یەکەم لە کۆماری میسریش.

هەستاوە بە بڵاوکردنـەوەی زیـاد لـە (٢٠٠) توێژینـەوەی زانسـتی لـە گۆڤـارە زانسـتییە جیهانییەکانـدا، لەگـەڵ سەرپەرشـتی کردنـی چـەندین لێکۆڵەرەوە و توێژەرەوە لە زانستەکانی فەزا و جیۆلۆجیـای هەسارەکان و مانگەکانیاندا، کاتێکیش کە لایەنە زانسـتییە جیهانییـەکان دەسـتیانکرد بـە خۆئامـادە کـردن بـۆ گەشـتی فـەزایی دوولایەنـەی ئـەمریکی ڕوسـی (گەشـتی ئـەپۆلۆ-سـۆیۆز) لـە سـاڵی (١٩٧٥)دا، لـە (د. فـاروق البـاز) باشتریان نەدۆزییەوە بۆ پلەی (سەرۆکی لێکۆڵینەوە تایبەتـەکانی تایبـەت بـە تاقیکردنـەوەکانی سەرپەرشـتی و چـاودێری زەوی و وێنـەگرتن لـە ئاسمانەوە).

هـەروەها (د. فـاروق البـاز) پلـەی جێگـری سـەرۆکی زانسـت و تەکنـەلۆجیای هـەبوو لـە دەزگـای تەکنـەلۆجیای زانیـاریی (ئایتـك) لـە ویلایەتی (ماساچوسـتس)، هـەروەها مامۆسـتای ئـەم زانکۆیانـەش بـووە: بەشی جیۆلۆجیای زانکۆی (یوتا) لە (سۆڵت لـەیك سـیتی) لـە ئـەمریکا، و زانکۆی (عەین شەمس) لـە (قـاهیرە)، و زانکـۆی (تەکسـاس)ی فـەننی، و زانکـۆی قەتـەر لـە شـاری (دەوحـە)، ئێسـتاش بەڕێوەبـەری بەشـی هەستکردن لە دوورەوەی زانکۆی (بۆستن)ی ئەمریکییە.

خـاوەنی چـەندین لێکۆڵینەوەیـە دەربـارەی ئیعجـازی قورئـان لـە سەردەمی زانستدا، و باوەڕی تەواوی بە بـەرەوپێش چوون لـە دۆزینـەوە زانسـتییەکان و فێرکـردن لـەم بـوارەدا هەیـە، چـونکە بـە هۆکـارێکی تێگەیشتنی دروستکراوەکانی پەروەردگاری دەزانێـت لـە دەوروبـەرمان، و بۆ باشترکردنی پاشەڕۆژی مرۆڤە لەسەر زەویدا.

لە ووتەیەکیدا دەڵێت: من باوەڕم وایە کە قورئان کتێبێکی هەمەلایەنـە و جێگیرە، و لە قورئانـدا چـەندین ئیعجـازی زانسـتی مـەزن هەیـە کەواتـە قورئان خاوەنی پلەوپایەیەکی بەرزە، زانستیش لە گاوڵکێدایـە و زۆر کـەم دەزانین و زۆر کەم فێردەبین، هەرکاتێکیش زانستێکی نوێ بـزانین بۆمـان دەردەکەوێت کە کەم دەزانین، هەرکاتێکیش بڕێك زانیاریمان دەستکەوێت دەگەینە ئەوەی کە بڕێکی تری مەزن لە زانست هەیە کە هـیچ ئاگایـەکمان لێی نییە[126].



---

[126] بڕوانە چاوپێکەوتنی پرۆفیسۆر (عبدالمجیـد الزنـداني) لەگـەڵ (د. فـاروق البـان) کـە لـە کتێبی (الإعجاز العلمي)دا بڵاوکراوەتەوە.

# هەندێك لە زانا موسوڵمانە کوردەکان و ڕۆڵیان لە پێشکەوتنی زانستیدا

## شێخی ئیسلام (ئیبن تەیمیە):

ناوی (تقي الدين أبوالعباس أحمد بن عبدالحليم الحراني الدمشقي الحنبلي)یە، زانا و فەقیە و ڕەخنەگر و موفەسیر بووە و لە خێزانێکی زانست پەروەر هاتۆتە دونیا، لە شاری (حەڕڕان)ی کوردستانی تورکیا لەدایکبووە لە (٦٦١ك-١٢٦٣ن)، پاشان لەگەڵ کەس وکاری چوون بۆ دیمەشق بەهۆی هێرشی مەغۆلەکانەوە، لەوێ گەورە بووە و لە منداڵییەوە لەسەر دەستی باوکی و زانایانی ئەوێ فێری قورئانی پیرۆز و تەفسیر و زانستی فەرموودە و زمانی عەرەبی و ئەدەبەکەی بووە، هەر لە گەنجییەوە دەرکەوتووە و وانەی ووتووەتەوە و گفتوگۆ و موناقەشەی زانایانی کردووە و ناونرا بە (زیندووکەرەوەی سوننەت) و (ئیمامی موجتەهیدەکان)، ئەوەندە کەسێکی پارێزکار و زاهید بووە کە دونیای هیچ بەلاوە مەبەست نەبووە، و ئەوەندە کەسێکی ئازا و چاونەترسیش بووە کە بەهیچ شێوەیەك ماستاو و رووپامایی بۆ کەسنەکردووە، نوێکەرەوە (مجدد)ی سەردەمی خۆی بووە.

دانراوەکانی خۆیان دەدەن لە ٥٠٠ کتێب، چوو بۆ میسر بۆ فەتوادان و ماوەیەك لەوێ بووە و لەسەر بیروراکانی زیندان کراوە، پاشان گەڕاوەتەوە بۆ شام و لەوێش زیندانی کراوە، ژیانی بەم شێوەیە بەسەر بردووە تا لە زینداندا لە ساڵی (٧٢٨ك-١٣٢٧ن)دا کۆچی دوایی کردووە، لەدوای جەنازەکەی هەموو خەڵکی دیمەشق بەپێ ڕۆیشتوون و ژمارەیان

گەیشتە ٢٠٠ هەزار کەس، کە هەموویان هەستیان دەکرد بە مردنی ئەو یەکێك لە کەڵە زانایانی ئیسلامیان لەدەستچوو، جەنازەکەی ئەم گەورەترین جەنازە بووە لە ئیسلامدا دوای ئیمام (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل).

لە هەموو زانستەکانی حیکمەتدا دانراوی هەیە، بانگکەری چاکخوازی ئایینی بووە، پێشەوا بووە لە تەفسیر و ئوصولدا، دەستیکرد بە وانە ووتنەوە لە تەمەنی ٢٠ساڵییەوە، لە دژی هەموو کۆمەڵە لادەرەکان بووە لەدین و بیروبڕوا ئەفسانەییەکانیانی دژایەتی دەکرد، لە کاتی هەردوو هێرشی نامرۆڤانەی خاچپەرستان و مەغۆلەکانەوە بۆ جیهانی ئیسلامی ئیبن تەیمیە چەندین هەڵوێستی ڕێزدار و بەجەرگی هەبووە کە گیانی فیداکاری و بەرەنگاری لەنێو موسوڵمانانیدا زیندوو کردەوە، نموونەی زانای کارکەر و موجاهید بووە، لەکاتی هاتنی سەرکردەی مەغۆلەکان (قازان) بۆ داگیرکردنی دیمەشق ئیبن تەیمیە چوو بۆ بەرەنگاری کردنی و بینینی و بە شێوەیەك ترساندی کە بەخۆیدا چووەوە و پاشان چوو بۆ لای سوڵتانی میسر و هانیدا بۆ چوون بۆ پشتگیری خەڵکی شام لە دژی مەغۆلەکان.

(د. محمد أبو زهرة) دەڵێت: مێژوونووسان بە ئیبن تەیمیەیان ووتووە (حەڕانی) و نەیانداوەتە پاڵ تیرە عەرەبەکان، کە ئەمە دەیسەلمێنێت کورد بووە، کە میللەتێکی خاوەن هیممەت و ئازایەتی زۆرن، و ئەم سیفەتانە بە ئاشکرا لە ئیبن تەیمیەدا دیار بوون لەگەڵ ئەوەشدا کە لەناو هێمنی زانایاندا گەورە بوو، کوردەکان لە سەدەکانی شەشەم و حەوتەمی کۆچیدا خاوەنی هەڵوێستی بەرز و ناوازە بوون لە بەرگری کردن لە

وولاتـی موسـولمانان، ئـەوەبوو بەرامبـەر بـە خاچپەرسـتەکان وەسـتان و یەکـەم لێـدانیان بەرکـەوت، و پاشـان بـەرەنگاریان بوونـەوە و گـورزی جەرگبڕیان لێوەشاندن تاوەکو بێئومێدیان کردن لە وولاتی موسولمانان.

دانراوەکـانی ئـیبن تەیمیـە خۆیانـداوە لـە ٤٠٠٠ کورڕاسـە، لـە (فـوات الوفیات)دا دەڵێـت: ٣٠٠ بـەرگ بـوون، کـە لەمڕۆمانـدا تـەنها ٦٠ بـەرگمان بەدەسـت گەیشـتووە، بـەناوبانگترینی دانراوەکـانی (مجموعـة الفتاوی)کەیەتی کە لە ٣٧ بەرگدا چاپکراون، بێجگە لە دەیان دانـراوی تـر کە بەجیا لەچاپ دراون.

## ئیبن خەلەکان:

ناوی قازی قوزات (شەمسەددین ئەحمەدی کوڕی موحەممـەدی کـوڕی ئیبراهیمـی ئـەربیلی شـافیعی)یە، لـە دێی (خەلـەکان)ی سـەر بـە شـاری هەولێر لە ساڵی (٦٠٨ک-١٢١١ز) لەدایکبووە، زۆربەی ژیانی لە وەرگرتنی زانسـت و وانـە ووتنـەوە و هاتووچـۆ لـەنێوان شـام و میسـردا بەسـەربرد، دوای خەریکبوون بە زانستەوە لە منداڵیدا پاشـان لـە ١٨ سـاڵیدا دەسـتی کرد بە گەشتی زانستی، شـەش حـەوت سـاڵ لـە حەلـەب دانیشـت، سـاڵی ٦٣٣ک چـۆتە دیمەشـق و دوای چـوار سـاڵ چـۆتە میسـر، لـە (٦٥٨ک)دا سوڵتان (زاهیر بیبـەرس) کـردی بـە قـازی قـوزات و لـە (٦٥٩ک) لەگەڵیـدا چوو بۆ شام، پاشان لە (٦٦٩ک) وازی لـەم وەزیفەیـەی هێنـا و گەڕایـەوە (قـاهیرە) و لـە قوتابخانـەی (فەخرییـە) بـە وانـە ووتنـەوەوە خـەریکبوو، دواجار گەڕایەوە شـام و سـەرقاڵی زانسـت بـوو تـا لـە سـاڵی (٦٨١ک) لـە تەمەنی ٧٣ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

خاوەنی چەندین کتێبی مێژوویی و زانستییە کە گرنگترینیان شاکارە مێژووییە نەمرەکەیەتی، کە بریتییە لە کتێبی (وفيات الأعيان وأنباء أبناء الزمان) کە کتێبێکی مێژوویی هەمەلایەنە، لە ماوەی حەوت ساڵدا لە نووسینی بووەوە، لە ساڵی (١٢٥٦ز) دەستی پێکردووە و لە (١٢٧٤ز)دا تەواوی کردووە، نوسخەی دەستنووسی ئەم کتێبە بە خەتی دانەرەکەی لە مۆزەخانەی بەریتانی پارێزراوە، لە ئەڵمانیا بۆ یەکەم جار بە عەرەبی لەچاپدراوە و پاشان وەرگێڕدراوە بۆ ئینگلیزی و لە فەرەنسا لەچاپدراوە، (ظهيرالدين الأربيلي) وەریگێڕاوە بۆ فارسی، لەلایەن پێنج زانای ترەوە پاشکۆی بۆ دروستکراوە، ئیبن خەلەکان خاوەنی کتێبی تری زانستی و زمانەوانی و فیقهی بووە و چەندین شیعری ناسك و ماناداریشی داناوە بە عەرەبی و فارسی.

## ئیبنولموستەوفی ئەربیلی:

ناوی (ئەبولبەرەکات شەرەفوددینی هەولێرییە) لە (٥٦٤ك)دا لە هەولێر هاتۆتە دونیاوە، لە خێزانێکی ناسراو و پڕ لە ئەهلی عیلم و فەزڵ هاتۆتە دونیاوە، ماوەیەك وەزیری (مزەفەرووددین کۆکبوری) بووە، پاش هاتنی تەتەر بۆ ئەو ناوچەیە چۆتە موسڵ و لە (٦٣٧ك-١٢٣٩ز)دا وەفاتی کردووە، مێژوونووس و زانایەکی خاوەن دانراو بووە و لە شیعرو ئەدەبیاتیشدا بەقووەت بووە، خاوەنی ئەم کتێبانەیە:

- (تأريخ إربل) کە ٤٠ بەرگە.
- (النظام في شرح شعر المتنبي وأبي تمام) کە ١٠ بەرگە.
- (إثبات المحصل من نسبة أبيات المفضل) کە ٢ بەرگە.

## ئیبنوصەلاحی شارەزووری:

ناوی (تقي الدين عثمان بن عبدالرحمن الكردي الشهرزوري)یە، ساڵی (٥٥٧ك) لە (شرخان)ی (شارەزوور) لەدایکبووە، پێشەوا بووە لە فیقە و فەرموودەدا و زانا بووە لە تەفسیر و ئوصول و نەحودا و پیاوێکی پارێزکار و زاهید بووە، باوکی شێخی زانایانی دیمەشق بووە بۆیە سەرەتا لای ئەو وانەی زانستی خوێندووە، پاشان چۆتە موصڵ و لەلای (عمادالدين يونس) وانەی خوێندووە و دوایی چووە بۆ بەغدا و شوێنەکانی تری عێراق و ئێران (لەلای رافیعی وانەی خوێندووە) و خوراسان گەڕاوە، پاشا چووە بۆ (قودس) و لە قوتابخانەی (الصلاحية) وانەی ووتووەتەوە، لە کۆتاییدا گەڕاوەتەوە دیمەشق و لەوێ جێگیر بووە و بووە بە مامۆستای (دار الحديث) و هەر لەوێ کتێبەکانی داناوە، لە رۆژی چوارشەممە (٢٥)ی رەبیعی دووەمی ساڵی (٦٤٣ك)دا وەفاتی کردووە.

خاوەنی ئەم کتێبانەیە: (طبقات فقهاء الشافعية)، (معرفة أنواع الحديث) کە کتێبێکی بەناوبانگە وناسراوە بە (مقدمة إبن الصلاح)، (الأمالي) و(الفتاوى)، و(شرح الوسيط)، و(أدب المفتي والمستفتي)، و(فوائد الرحلة) و چەندینی تریش.

## شێخ حەسەنی گڵەزەردە و روانگەی ئەستێرەناسی گڵەزەردە:

(شێخ حەسەن کوڕی سەید محەممەدی نۆدێ)یە، لە ساڵی (١١٧٥ك-١٧٦١ز)دا کۆچی دوایی کردووە، مامۆستایەکی ئاینی و شێخێکی تەسەوف و زانایەکی فەلەکیش بووە، لە سەردەمی خۆیدا جگە لە بورجەکەی شاخی گڵەزەردە، حیسابێکی دروستکردووە لەسەر دیواری

باکووری مزگەوتەکەی لە (دێی گڵەزەردە) کە دەکەوێتە سەرشاخی بەرانان لە باشووری شاری سلێمانی و سەرەتای سنووری ناوچەی قەرەداغە، شێخ حەسەن حیسابەکەی بەشێوەی تاق تاق دروست کردبوو لەناو مزگەوتەکەیدا، لەسەر تیرۆژی رۆژ و بۆ گەیشتنی تیرۆژەکە بۆ رۆژژمێرەکە پەنجەرەیەکی بە قەبارەی (٣٧سم-٣٣سم) دروستکردبوو لە دیواری رۆژهەڵاتدا لەنزیك سووچی باکووری رۆژهەڵات لە مزگەوتەکەیدا، کە رۆژ هەڵدەهات یەکەم تیرۆژەکەی بە ئەندازەی نینۆکێك واتە لەکاتی هەڵهاتنیدا هەر رۆژێك لەسەر خەتێکی دیاریکراو ئەدات لە تەقویمەکە، لە سێ جێگە نووسین لەسەر رۆژژمێرەکە هەبووە.

بەڵام لە نیسانی (١٩٨٢)دا بەڕێوەبەرایەتی ئەوقافی سلێمانی بێگوێدانە گرنگی مزگەوتەکە و رۆژژمێرەکەی (شێخ حەسەن) کە کەلەپوورێکی فەلەکی کوردییە مزگەوتەکەی رووخاند، بۆ ئەوەی مزگەوتێکی نوێ لەشوێنی دروستبکات، پاش روخاندنی (عبدالرقیب یوسف) گڵی مزگەوتە رووخێندراوەکەی بەدەست پشکنیوە و هەندێك لە لەتەکانی رۆژژمێرە گەچەکەی لەناو داروپەردووی مزگەوتە رووخاوەکەدا دۆزیوەتەوە، لە (٢٧-٢٩)ی ئابی (١٩٨٣) بە هاوکاری (کامیل ئەحمەد) رۆژژمێرەکەیان دروست کردۆتەوە لەدیواری مزگەوتە نوێکەدا کە قەبارەی (٢٥٠سم-١٣٥سم)ە، حیسابی گڵەزەردە لە گەرمیان تا شارەزوور و شاربازێڕ بەڵکو زوربەی ناوچەکانی پارێزگای سلێمانی لە ناوەڕاستەکانی سەدەی هەژدەهەمەوە لەسەر حیسابی گڵەزەردە رۆیشتوون، سەرەتای ساڵ لە ١٤ی کانوونی یەکەمەوە دەستپێدەکات، بەڵام سەد مەخابن لە ساڵی (١٩٨٨)دا رۆژژمێرەکە لەگەڵ مزگەوت و خەڵکی گڵەزەردە بەر شاڵاوەکانی ئەنفال کەوتن.

## شوێنی بینینی مانگی یەك شەوە:

هەر شێخ حەسەنی گڵەزەردە خۆی لەسەر شاخی گڵەزەردە لەڕاستی (کانی بارێ) کەمێك بەدیوای باشوورەوە جێگایەکی ئامادە کردبوو بۆ دۆزینەوەی مانگی یەك شەوە، کە مانگ دەبینرا ئاگرێکی گەورەیان دەکردەوە کە لە سلێمانی و شاربازێر و سورداش و شارەزوور و بازیان و قەرەداغەوە دیاربووە، خەڵکەکە لەسەر ئەم بەردە کە وەك رووانگەیەك بووە بۆ مانگی یەك شەوە دەیانکردە رەمەزان یان جەژن، تا ساڵانی چلەکانی سەدەی بیستەمیش خەڵکی ناوچەکە و مەحکەمەی شەرعی سلێمانیش بە رەسمی ئیعتیمادیان لەسەر ئەم جێگایە بووە بۆ دیاری کردنی یەکەم رۆژی رەمەزان یان جەژن، (مامۆستا عەلائەدین سوجادی) ووتوویەتی: شێخ حەسەنی گڵەزەردە بۆ هەریەکێك لە دوازدە مانگەکانی ساڵ جێگایەکی تایبەتی دروستکردووە بۆ دۆزینەوەی سەرەتای هەر مانگێك، رۆژی (٢٩)ی ئابی (١٩٨٣) (عبدالرقیب یوسف) ئەم بەردەی بە چیمەنتۆ دەستنیشان کردووە لەسەر شاخی گڵەزەردە.



٢٤٠ سم × ١٤٠ سم
کێشراوەی رۆژ ژمێری سەر دیواری مزگەوتی گڵەزەردە

شاخی گڵەزەردە
بورجەکەی شێخ حەسەنی گڵەزەردە

## مەلا عومەر و روانگەی ئەستێرەناسی گڕاو:

چەند سەد ساڵێك لەمەوبەر زانایەكی فەلەكی كورد بەناوی (مەلا عومەر) روانگەیەكی ئەستێرەناسی (مرصد فلكي) كوردی دروستكردووە لە گوندی (گڕاو) لەژێر شاخی سەری رەش لە پارێزگای هەولێر، كۆمەڵە نیشانگرێكی فەلەكی بە كۆمەڵە بەرد دروستكردووە لەسەر شاخی (داری لولكان) لەبەردەمی گوندەكە بەلای رۆژئاواوە، ئەو نیشانگرە بەردانە بریتین لە ئیشارەتەكانی هەر ١٢ بورجی فەلەكی (گیسك، دۆلكە، نەهەنگ، كاور، گا، و جیوك) لە ٦ مانگی زستان و بەهاردا رۆژ قووچەكەكانی ئەم ٦ بورجە دەبڕێ لە باشوورەوە تا باكوور و ئەوجا رۆژ لە قوچی گەڕانەوەی سەری هاوین یان (نقطة الإنقلاب الصيفي) كە لە ٢١ی حوزەیرانەوە رۆژ دەگەڕێتەوە بەسەر هەمان قوچەكانی رووانگەكەدا (بەمانا ئیشارەتە فەلەكییەكاندا) و ٦ بورجی هاوین و پاییزیش دەبڕێ كە بورجەكانی (قرژاڵ، شێر، فەریك، تەرازوو، دووپشك، و كەوان)، تا لە ٢٠ی كانوونی یەكەمدا رۆژ دەگاتە قووچی سەری زستان كە نیشانەی بورجی (گیسك)ە و رۆژی ٢١ی كانوونی یەكەم سەرەتای زستانە، و لە رۆژی ٢٠ی حوزەیراندا رۆژ دەگاتە سەر (قوچی گەڕانەوەی سەری هاوین) كە نیشانەی بورجی (قرژاڵ)ە و رۆژی ٢١ی حوزەیران سەرەتای هاوینە.

هەروەها لە روانگەی گڕاودا ئیشارەتەكانی تری فەلەكی دانراوە وەك نیشانەی ئەستێرەی (گەلاوێژ) و سێ ئەستێرەكانی (تەرازوو) و بۆ (بازبەران) و بۆ كاتی رەزبڕین و هەروەها نیوەی وەرزەكانی ساڵ و بۆ هەر حەوت حەوتەكانی زستان و هاوین كە ئەمانەن: (بێند، بێندرخێ، مێرەم، ئۆغەن، پیت، پاروس، و خضر والياس)، ئینجا ئەوەڵی هەر بورج

و کاتێك دەزانرێ بە ئاوابوونی رۆژ لەسەر قوچی تایبەتی ئەو بورج و کاتەوە کە لەسەر شاخ دانراون، جێگای تەماشاکردنی روانگەکانی قوچە فەلەکییەکان دەرگای مزگەوتی (گڕاو)ە.

بە سەدان ساڵ کوردەکان لە رووباری دیجلەوە تا سنووری ئێران حیسابی ساڵیان بەم روانگە کوردییانە کردووە و پێیان ووتووە (حیسابی گڕاو)، (عبدالرقیب یوسف) لە ساڵی (١٩٨٣)دا ئەم روانگەیەی دۆزیوەتەوە و هەندێك لە قووچە رووخاوەکانی دروست کردۆتەوە و باسێکی دووورودرێژی لەمبارەیەوە بڵاوکردۆتەوە لە گۆڤاری (رۆشنبیری) ژمارە (١٠٨)ی ساڵی (١٩٨٥)دا.

## ئیسماعیل پاشای بەغدادی:

ئەم بەڕێزە لە شاری سلێمانی لەدایکبووە و لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا چەندین پلەوپایەی وەرگرتووە و کاری میری کردووە، لە ساڵی (١٣٣٩ك-١٩٢٠ز)دا کۆچی دوایی کردووە، زۆر حەزی لە گەڕان و لێکۆڵینەوە بووە و نزیکەی ٣٥ ساڵی تەمەنی لە هەوڵێکی زانستیدا بووە بۆ کۆکردنەوەی کتێب و نووسەرەکانیان، ٢ کاری گەورەی بیبلیۆگرافیایی بۆ بەجێهێشتووین، کە ناوی کتێب و نووسەرەکانی سەردەمی ئیسلامی تا سەرەتای سەدەی بیستەم کۆکردۆتەوە، یەکەمیان بەناوی (إيضاح المكنون في الذيل على كشف الضنون في أسامي الكتب والفنون) کە تەواکەری کتێبی (كشف الضنون في أسامي الكتب والفنون)ە دانراوی (حاجي خليفة)، کە دوای بەرواری داخستنی ئەو کتێبە لە ناوەڕاستی سەدەی شانزەیەمەوە هاتووە ناوی کتێب و نووسەرەکانی

دوای ئـەو بـەروارەی کۆکردۆتـەوە تـا سـەرەتای سـەدەی بیسـتەم کـە نزیکەی (١٩٠٠٠) کتێبە.

کتـێبی دووەمـی بـەناوی (هدیـة العـارفین: أسمـاء المـؤلفین وآثـار المصنفین)، کـە تێیـدا نـاوی دانـەرەکان (تەنانـەت بـە شاعیرەکانیشـەوە) کۆکردۆتـەوە هـەر لـە سـەرەتای ئیسـلامەوە تـا سـەدەی بیسـتەم، نـاوی نزیکەی ٣٠٠٠٠ کتێب و ٦٠٠٠ دانەری تێدا کۆکردۆتەوە.

## مەحمود بەگی جەڕڕاح (١٨٨٢-١٩٥٨ز):

(مـەحمود بـەگ کـوڕی حـاجی ئـەمین بـەگی نەسـروڵڵا بـەگ)ە سـاڵی (١٨٨٢)ن لە شاری سلێمانی هاتۆتە ژیانەوە، سوارچاك بووە و زۆری حـەز لەڕاو بووە، ئەم پیاوە دەستێکی باڵای هەبووە لە چارەسەرکردنی هـەموو جۆرە لەجێچوون و شکاندنی ئێسقانی دەست و قاچدا کـە بـە ڕێگەیـەکی تایبەت گرتوویەتەوە و زۆر بە باشی چاك بۆتەوە، بۆیە بە مەحمود بـەگی جەڕڕاح ناوبانگی دەرکردووە.

فەقیر و هەژاری لا پەسەند بووە و هەرگیز ئەم کارەی بە پارە بۆ هـیچ کـەس نـەکردووە بـەڵکو هـەر بـە خێرخـوازی ئـەنجامی داوە، داوایـان لێکردووە کە بچێتە نەخۆشخانە و بە مووچە کاربکات بەڵام رازی نـەبووە، زۆر لە پیاوە ناودارەکانی سلێمانی کە دەستیان شکاوە یان لـەجێ چـووە بۆی گرتوونەتەوە و چاکبوون، وەك: شێخ مـەحموودی حەفیـد، مامۆسـتا رەفیق حلمی، حیکمەت ئەفەندی، و زۆر کەسـانی تـر، رۆژی ١٩٥٨/٦/٢٦ کۆچی دوایی کردووە و لە گردی سەیوان بەخاك سپێردراوە.

ئەم زانایانەی باسکران مشتێکی خەرواری زانایانی کوردی موسولمانن کە بەدرێژایی مێژووی ئیسلامی رۆڵی سەرەکییان هەبووە لە پێشخستنی شارستانێتی ئیسلامی و جێدەستیان دیاربووە لە هەموو لایەنێکی شارستانێتی ئیسلامیدا، دیارە دەیان زانای تر ئەم رۆڵە بەرێزەیان بینیوە، بۆ زانینی ژیاننامەیان ئامۆژگاری خوێنەرانی بەرێز دەکەم بۆ گەڕانەوە بۆ ئەم سەرچاوانە:

- مشاهير الكرد وكردستان (كوردی بەناوبانگ)/ نووسینی: محمد أمين زكی بەگ.
- أعلام كرد العراق/ جمال بابان.
- معجم أعلام الكرد (في التأريخ الإسلامي والعصر الحديث في كردستان وخارجها)/ د. محمد علي الصويركي.
- ئینسایکلۆپیدیای گشتی/ یاسین صابر صالح.

لـەناو موسـولمانانـدا چـەندین کەسـی بلیمـەت هەڵکـەوتن لـە هـەموو بوارەکانی زانست و مەعریفـەدا، ئـەو کەسـانەش زۆر بەهەڵـەدا چـوون کـە وادەزانن موسوڵمانان تـەنها گوێزەرەوەیـەکی شارسـتانێتی میللـەتانی تـر بوون بۆ رۆژئاوا، بەڵکو موسـوڵمانان خۆیـان ئـەم زانسـتانەیان وەرگـرت و لێی تێگەیشتن و نهێنییـەکانیان هەرسـکرد و لەلایـەن خۆیانـەوە بەشـێکی تـری هــەرە زۆریــان خستەســەر و تێکــەڵاوی زانســتەکانی قورئــان و سوننەتیشیان کرد، لەبواری زانستی پزیشکیشدا چـەندین کەسـی بلیمـەت و ناوازە هەڵکەوتن لەناو موسوڵماناندا کە سەرچـاوە و دانـراوی بـەنرخیان لـەم بـوارەدا دانـا و ئـامێرە بەسوودەکانیشـیان داهێنـا، کـارکردنیش لـە نەخۆشـخانە ئیسـلامییەکاندا سـیفەتی ئینسـانییەت و رەووشـت بـەرزیی بەئاشـکرا پێـوە دیـاربووە، کـە شـاندەدات لـە شـانی سیسـتەمی پێشکەوتووترین نەخۆشخانەکانی ئەمڕۆمان.

قورئـانی پـیرۆز گرنگـی داوە بـە حیکمـەت و دانـایی و کردوێتـی بـە گـەورەترین خێـر و بەرەکـەتێك کـە مـرۆڤ دەسـتی بکـەوێت، ئـەوەتا دەفەرموێت: ﴿وَمَن يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا﴾ (البقرة:٢٦٩)، واتـە: ئـەو کەسـەی کـە حیکمـەت و دانـایی پێبـدرێت ئـەوا خێرێکـی زۆر گەورەی پێدراوە، هەروەها: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا لُقْمَانَ الْحِكْمَةَ أَنِ اشْكُرْ لِلَّهِ وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ﴾ (لقمان:١٢)، واتە: ئێمـە حیکمـەت و داناییمـان بە (لوقمان) بەخشیبوو و داوامـان لێکـرد کـە سوپاسـگوزاری خـودا بێـت، هەر کەسێکیش سوپاسی خودا بکات ئـەوا پاداشـتەکەی بـۆ خۆیـەتی، لـە گـرنگترین جۆرەکـانی حیکمـەت و پـێش هـەموویان بریتییـە لـە زانسـتی پزیشـکی و چارەسـەری نـەخۆش، هەربۆیـە موسـوڵمانان بـە پزیشـکیان دەووت (حەکیم)، کە ئەم ناوە تا ئەمڕۆش لەناو خەڵکیدا بەکاردێت.

ئیسلام ئەم زانستەی وەك نیعمەتێك و بەخششێكی خودایی سەیركردووە، و كردوێتی بە كارێك و بەهرەیەكی دانپێدانراو تەنانەت ئەگەر غەیری موسوڵمانانیش پێوەی خەریك بوبن، هەربۆیە دەبینین لە سایەی دەوڵەتی ئیسلامیدا خەڵكانێكی زۆر بە زانستی پزیشكییەوە خەریك بوون (لە موسوڵمانان و ناموسوڵمانەكانیش)، لە كاتێكدا كە كڵێسای رۆژئاوا خەریك بوون بە پزیشكییەوە بە حەرام و قەدەغەی دادەنا چونكە باوەڕیان وابوو كە نەخۆشی بریتییە لە سزا و تووڕەیی خودایی و نابێت لابرێت لەسەر ئەو كەسانەی كە شایەنین، هەر بەهۆی ئەم بیانووەوە زانستی پزیشكی قەدەغە بوو لە رۆژئاوادا تا دوای ئەو سەردەمەی كە پێی دەووترێت سەردەمی باوەڕ لە ئەوروپادا (عصر الإیمان) لە دوای سەدەی دوانزەیەمی زایینییەوە.

ئەوانەی كە خەریك بوون بە زانستی پزیشكییەوە لە جیهانی ئیسلامیدا ژمارەیان ئەوەندە زۆر بوو كە پێشتر شتی وا نەبووە، تەنانەت لە سەردەمی خەلیفەی عەبباسی (المقتدر بالله)دا (٢٩٥-٣٢٠ك) زیاتر لە ٨٦٠ پزیشكی پیاو و ٢ پزیشكی نەخۆشییەكانی ژنان و منداڵبوون بانگكران بۆ بەغدا بە مەبەستی تاقیكردنەوەیان، ئەمانە بێجگە لە مامۆستا باوەڕپێكراوەكان كە قۆناغی تاقیكردنەوەیان بڕیبوو، ئەمە گرنگیدانێك بوو بە زانستی پزیشكی كە هیچ پایتەختێكی شارستانییەتە كۆنەكان بەخۆیانەوە نەدیبوو.

هەروەها لەم ژمارە زۆرەی پزیشكانەوە دەگەینە ئەو راستییەی كە ئاوەدانی و شارستانییەت گەیشتبووە لوتكە بۆ ئەوەی پێویستی بە ئەوەندە ژمارەیەكی زۆر لە پزیشكان هەبێت.

له سه‌رده‌مه كۆنه‌كاندا بوونی زانیارییه‌كی كه‌م به‌س بوو بۆ ئه‌وه‌ی یه‌كێك به‌ پزیشكییه‌وه‌ خه‌ریك بێت، به‌ڵام موسوڵمانان به‌مه‌نده‌وه‌ نه‌وه‌ستان به‌ڵكو به‌رده‌وام له‌ زیادكردنی زانیارییه‌كانیاندا بوون، و به‌و زانیارییانه‌وه‌ نه‌وه‌ستان كه‌ له‌ كتێبه‌كانی كه‌سانی پێش خۆیان ده‌ستیانكه‌وت به‌ڵكو په‌نایان برده‌به‌ر هه‌موو داهێنانێك و زیره‌كیی خۆیان بۆ زیادكردنی لێكۆڵینه‌وه‌كانیان، هه‌روه‌ها ده‌ستیان كرد به‌ نووسین و ده‌یان كتێبیان دانا له‌ بواری پزیشكیدا، كه‌ هه‌ندێكیان ئه‌وه‌نده‌ گه‌وره‌ و فراوان بوون كه‌ ئینسایكلۆپیدیایه‌ك بوون بۆ خۆیان، كه‌ ئه‌مانه‌ هه‌مووی وه‌رگێڕدران بۆ زمانی لاتینی و پزیشكانی ئه‌ورووپا به‌كاریان هێنا، كه‌ بوونه‌ هۆی گۆڕینی حاڵیان به‌ ته‌واوه‌تی.

تا سه‌ره‌تای سه‌رده‌می نوێ هیچ زانایه‌كی ئه‌ورووپی نه‌یتوانی شان بدات له‌ شانی زانا موسوڵمانه‌كان له‌ نووسینه‌كانیاندا، ئه‌وه‌بوو كتێبی (القانون في الطب)ی ئیبن سینای ره‌ییس له‌ سه‌ده‌ی دوانزه‌یه‌می زایینیدا وه‌رگێڕدرا بۆ لاتینی و به‌ به‌رده‌وامی چاپ ده‌كرایه‌وه‌، كه‌ مه‌وسوعه‌یه‌كه‌ پوخته‌ی هه‌موو پێشكه‌وتنه‌كانی پزیشكی موسوڵمانان و كه‌سانی پێش خۆیانی له‌خۆگرتووه‌ (هه‌ر له‌ ئیغریق و یۆنانییه‌كان و هیندییه‌كان تا سریانییه‌كان و قیبتییه‌كانیش)، هه‌روه‌ها كتێبی (الحاوي) دانراوی (الرازي)یش وه‌رگێڕدرا له‌ ساڵی (١٢٧٩ز)دا كه‌ ئه‌میان له‌ (القانون) گه‌وره‌تره‌ و ماده‌ی زیاتری تێدایه‌، قوتابییه‌كانی (الرازي) دوای مردنی هه‌ستان به‌ته‌واوكردنی چونكه‌ كارێكه‌ هه‌رگیز به‌ ١ كه‌س ته‌واو ناكرێت.

ئه‌م كتێبانه‌ی (ئیبن سینا) و (الرازي) بریتی بوون له‌ سه‌رچاوه‌ی سه‌ره‌كی باوه‌ڕپێكراوی زانستی پزیشكی له‌ كۆلیجه‌كانی پزیشكی له‌

ئەورووپادا تا کۆتایی سەدەی شانزەیەم، هەروەها یارمەتی پزیشکیی تریش هات بۆ ئەورووپا بە تایبەتی لە ئەندەلوسی موسوڵمانانەوە، و ئەوەبوو گەورەترین سەرچاوە لە نەشتەرگەری و نەخۆشییەکانی ئێسك و شکاویدا گەیشتە دەستیان بەناوی (التصریف لمن عجز عن التألیف) دانراوی (أبو القاسم خلف بن العباس الزهراوي)، کە لە سەرەتای سەدەی پانزەیەمدا وەرگێڕدرا بۆ لاتینی و لە ئەورووپا بەچاپ گەیشت، کە پێش چاپکردنی چەند وانەیەك بوو دەستاودەستی دەکرد لەنێو مامۆستایاندا و پشتیان پێدەبەست لە کارە نەشتەرگەرییەکانیاندا، بەتایبەتی لە نەشتەرگەرییە ئاڵۆزەکاندا وەك کردنەوەی میزەڵدان (المثانة Urinary Bladder) و دەرهێنانی بەردەکانی ناوی.

زانایانی پزیشکیی موسوڵمان پێش ئەورووپییەکان کەوتن لە وەسف کردنی نەخۆشییەکانی (گولیی) و (ئاوڵە) و (سووریژە) و هەروەها لە چارەسەری چاو دا.

هەروەها چارەسەری (شێتی) و نەخۆشییە دەروونییەکانی تریان وەك نەخۆشییە جەستەییەکانی تر دەکرد لە کاتێکدا لە ئەورووپادا بەم نەخۆشییە دەووترا نەخۆشی خودایی یان نەخۆشی شەیتانی، چونکە وایاندەزانی کە لە کاریگەریی رۆحەکان یان شەیتانەکانەوەیە.

هەر لەسەر دواکەوتوویی زانستی پزیشکی رۆژئاوا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا مێژوونووسی موسوڵمان (أسامة بن منقذ) لە کتێبەکەیدا (کتاب الإعتبار) چەند نموونەیەکمان بۆ دێنێتەوە دەربارەی پزیشکی ئەورووپییەکان و دواکەوتوویی و ژێربارکەوتنی ئەم زانستە بە عادات و تەقالیدە کۆنەکان و چارەسەرە خەیاڵی و لێکدانەوە ئەفسانەییەکانەوە.

هەروەها دەربارەی پێشکەوتنی زانستی پزیشکی لای موسوڵمانان لە کاتی جەنگی خاچپەرستەکان و هێرش هێنانی ئەورووپییەکان بۆ سەر وڵاتانی موسوڵمان لە سەدەکانی دوانزە و سیانزەی زایینیدا، لە کتێبەکەیدا دەڵێت:

لە نموونە سەرسوڕهێنەرەکانی پزیشکی خاچپەرستەکان ئەوەیە کە فەرمانڕەوای (المنیطرة)ی گاور داوای کرد لە مامم کە فەرمانڕەوایەکی موسوڵمان بوو کە پزیشکێك بنێرێت بۆ چارەسەری نەخۆشەکانیان، ئەمیش پزیشکێکی نارد بەناوی (ثابت) کە دوای ١٠ ڕۆژ گەڕایەوە بۆ لامان، ئێمەش لێمان پرسی بۆ وا زوو گەڕایتەوە، ئەویش وەڵامی دایەوە:

ئەوان سوارێکیان بۆ هێنام کە دوومەڵێك لە قاچیدا پەیدابوو بوو و لەگەڵ ئافرەتێکدا کە نەخۆشییەکی سەری هەبوو، بۆ سوارەکە گیراوەیەکم دروستکرد بۆ دوومەڵەکەی کە بووە هۆی تەقینی و چاکبوونەوەی و بۆ ئافرەتەکەش گیراوەیەکم دروستکرد کە هێواشی کردەوە و میزاجی باشبوو، ئەوەبوو قەشەیەك هات بەسەرماندا کە پزیشکیان بوو و پێی ووتن ئەم کابرا عەرەبە هیچ شتێك نازانێت، بە سوارەکەی ووت: تۆ حەزت لەکامیانە بە ١ قاچەوە بژیت یان بە ٢ قاچەوە بمریت؟ ئەویش ووتی: بە یەك قاچەوە بژیم، ووتی: دەی تەورێکی تیژی گەورەی بڕەڕ و سوارێکم بۆ بێنن، ئەوەبوو تەورەکە و سوارێکی تریان بۆ هێنا و منیش چاوم لێبوو قاچی نەخۆشەکەی خستە سەر تەختەیەك و بە سوارە تەور بەدەستەکەی ووت بیبڕە، ئەویش یەك تەوری ماڵی بەقاچیدا و نەیتوانی بیبڕێتەوە، ووتی: ئەمجارەش لێیدە، بۆ جاری دووەم کە لێیدا مۆخی قاچی هاتەدەرەوە و نەخۆشەکە مرد،

کـاتێکیش ژنەکـەی بینـی سـەری دەخورێنێـت ووتـی ئـەم ژنـە شـەیتان لەسەریدایە و حەزی لێکردووە، قژی سەری بتاشن، ئەوەبوو سەریانتاشـی بـەڵام دوای ئـەوە نەخۆشـییەکەی هـەرما، ووتـی: شـەیتانەکە لەسـەریدا هـەرماوە و هەسـتا بـە هەڵکەنـدنی نیشـانەی خاچـێك لـە پێسـتی سـەریدا بەمووس تا ئەوکاتەی کە ئێسکی سەری دەرکەوت و پاشان بە خوێ بۆی خوراند، ئیتر ژنەکـە تەحـەمولی نـەکرد و یەکسـەر مـرد، منـیش کـە ئـەم دواکەوتووییەم بینـی پـێم ووتـن: کارتـان بـەمن نـەماوە و ئێـوە پزیشـکی خۆتان هەیە و ئیتر گەڕامەوە!؟

هـەر ئـەم نووسـەرە نموونەیـەکی تـر دێنێتـەوە لەسـەر زمـانی (کلیـام دیور) فەرمانڕەوای (طبرية)ی خاچپەرست کە بۆی گێڕابـووەوە و دەڵێـت: ئـەم فەرمانڕەوایـە بـۆی گێڕامـەوە کـە لـە وڵاتـی خۆیانـدا سوارچـاکێکی کەتەیان هەبووە کە نەخۆش کەوتووە و خەریکبووە بمرێت.

ئـەوەبوو چـووین بـۆلای قەشـەیەکی گـەورەمان و پێمـانووت وەرە لەگەڵمان بۆ چارەسەری ئەو کەسە، ئەویش هات و کـە بینـی ووتـی مـۆمم بۆ بێنن، ئێمەش کەمێك مۆممان بۆ هێنا و ئەویش دوو تۆپـەڵی لێدروسـت کـرد و هـەردوو کونـەلوتی پێگـرت، پـاش ماوەیـەك سوارچـاکەکە مـرد، ئێمەش بە قەشەکەمان ووت: خۆ ئەوە مرد، ئەویش ووتـی: بـەڵێ باشـترە چونکە من کە بینیم دەتلێتەوە هـەردوو کونـە لـووتم بـۆ گـرت بـۆ ئـەوەی بمرێت و بحەوێتەوە!![127].

---

[127] بڕوانە کتێبی (الإعتبار) دانراوی (أسامة بن منقذ).

## نەخۆشخانەکان وپەیمانگا پزیشکییەکان لای موسوڵمانان

عەرەبەکان پێش هاتنی ئیسلام کەمێك پزیشکییان دەزانی و چارەسەری نەخۆشییەکانیان بە نوشتە و سیحر و خوێندنەوەی هۆنراوە بۆ بتەکانیان و پێشکەش کردنی قوربانی بۆیان دەکرد، هەروەها بە هەندێك دەرمانی گیراوە لە رووەکەکانی بیابان یان لە هەنگوین دروستیان دەکرد، و هەندێك جاریش بە نەشتەرگەری ساکار و خوێن دەرهێنان و داخکردن بە ئاگر چارەسەریان دەکرد، و باوەڕیان وابووە کە هەموو ئەو نەخۆشییانەی تووشی مرۆڤ دەبێت هۆکارەکەی بریتییە لە زیادڕەوی کردن لە خواردندا؟!.

کاتێکیش خۆری ئیسلام هەڵهات ئەو بۆچوونەی هێنا کە دەبێت گرنگی بە لەش و تەندروستی بدرێت چونکە زەرورەتێکە بۆ خۆشگوزەرانی مرۆڤەکان و پرشنگدانەوەی رۆحیشی، پێغەمبەری بەڕێز (ﷺ) دەفەرموێت: ﴿وإنَّ لِجَسَدِكَ عَلَيْكَ حَقّاً﴾ (رواه النسائي وصححه الألباني)، واتە: جەستەی خۆت هەق ومافی بەسەرتەوە هەیە.

ئەوەی کە تێبینی دەکرێت لە عیبادات و پەرستشە ئیسلامییەکاندا ئەوەیە کە مەبەستێکی سەرەکییان بریتییە لە جێبەجێکردنی مەبەستی گەورەی زانستی پزیشکی کە بریتییە لە پاراستنی تەندروستی مرۆڤ، ئەوەتا نوێژ و رۆژوو و حەج کردن و ئەوەی کە پێویستیانە لە روکنەکان و شەرتەکانیان هەموویان تەندروستی و چالاکی و هێزی لەشی مرۆڤ دەپارێزن، هەروەها ئاینی پیرۆزی ئیسلام هانی بەرگری کردنی دژی نەخۆشی داوە و داوای وەستاندنی بڵاوبوونەوەیانی کردووە، و هانی گەڕان بەدوای دەرمان و بەدەست هێنانیشی کردووە، کە ئەمانە بێگومان بە لێکۆڵینەوە و دیراسە کردنی زانستی پزیشکی دێنەدی، هەربۆیە موسوڵمانان چەندین قوتابخانەی فێرکردنی پزیشکییان دامەزراند و

برەویشـیاندا بـەو قوتابخانانـەی کـە پێشـتر هـەبوون وەك قوتابخانـەی (جندیسابور)ی پزیشـکی کـە (کیسـرا)ی پاشـای ساسـانی لـە ناوەڕاسـتی سەدەی شەشەمی زایینیـدا دایمەزراند، و چـەندین پزیشـکی عـەرەب لـەم قوتابخانەیـە دەرچـوون وەك (الحـارث بـن أبـي كلـدة) کـە لـە سـەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) ژیاوە و پێغەمبەریش هانی هاوەڵەکانی دەدا کـە بچنـە لای ئەم بۆ چارەسەری نەخۆشییەکانیان، کە ئەمە خۆی لەخۆیدا هانـدانی موسوڵمانانە بۆ چارەسەری زانستییانە و فێربوون و بەکارهێنانی.

عەرەب پـێش ئیسـلام هـیچ جـۆرە نەخۆشـخانەیەکیان نـەبووە لەگـەڵ ئەوەشـدا کـە کەسـانێك هـەبوون بـە پزیشـکییەوە خـەریك بـوون، یەکـەم بیرۆکەی نەخۆشخانە لە ئیسلامدا ئەو خەیمەیـە بـوو کـە پێغەمبـەر (ﷺ) هەڵیدا لە (مدینة) لە شـەڕی (خنـدق)دا، و ئـافرەتێکی تیـا دانـا کـە نـاوی (ڕەفیـدەی ئەسـلەمی) بـوو کـە برینـەکانی تیمـار دەکـرد و گرنگـی بەنەخۆشەکان دەدا.

هەر موسوڵمانان یەکەم کەس بوون لـە دروسـتکردنی بیمارسـتانەکاندا بە شـێوەیەکی فـراوان و تـەواو و پێگەیانـدنی چـەندین پزیشـکی پسـپۆڕ، ئەویش لە سەردەمی خەلیفەی ئومەوی (وەلیـدی کـوڕی عبـدالملك)دا، کـە لـە سـاڵی (٨٨ك-٧٠٦ز)دا فـەرمانی کـرد بـە دروسـتکردنی یەکـەم نەخۆشخانە، ئەم خەلیفەیە زۆر گرنگیـداوە بـە بـواری پزیشـکی و پـارە و خۆراکی زیاتری بۆ پزیشکەکان دابین کردووە، و فەرمانی کرد کە ئەوانەی نەخۆشی (گولی)یان هەیە با سواڵ نەکەن، بەڵکو جیای کردنـەوە و بـژێوی ژیانی بۆ دابین کـردن بـە دروسـت کردنـی شـوێنێکی جیـا بۆیـان، کـە بـە زاراوەی پزیشکی ئەمڕۆ ئەم کردارە پێی دەووترێت (الحجر الصـحي)[١٢٨]، هەروەها نەخۆشخانە و مووچەی بۆ کوێرەکانیش بڕییەوە.

---

[١٢٨] بڕوانە (تأريخ الأمم والملوك للإمام الطبري)، هەروەها (تأريخ اليعقوبي).

پاشان دروست کردنی نەخۆشخانەکان بەردەوام بوو، بە تایبەتی دوای جووڵانەوەی فتوحاتی ئیسلامی و جێگیربوونی فەرمانڕەوایی ئیسلامی لە ناوچە ئازادکراوەکاندا، ئیتر لێرەوە خەلیفە و فەرمانڕەوایان هەستان بە بەکارهێنانی پزیشکە موسوڵمانەکان و ناموسوڵمانەکانیش و هانیاندان و زیادڕەوییان کرد لە ڕێزگرتنیاندا، ئەوەبوو (موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان) پزیشکێکی دیمەشقی بەکاردەهێنا کە ناوی (إبن أثال) بوو، هەروەها (الحجاج بن یوسف الثقفي) فەرمانڕەوای (عێراق) پزیشکی ڕۆمانی (تیاذروق)ی بەکاردەهێنا، هەروەها (عبدالملك بن أبجر الكناني) پزیشکی خەلیفە (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) بوو، لە سەردەمی ئومەوییەکاندا چەندین پزیشکی ناوبانگیان پێگەیاند لەوانە (ماسرجویە البصري) کە هەستا بە وەرگێڕانی ژمارەیەك کتێبی پزیشکیی سریانی بۆ زمانی عەرەبی.

لە سەردەمی عەبباسییەکانیشدا گرنگی دانی خەلیفەکان بە نەخۆشخانەکان زۆر زیادی کرد، ئەوەبوو خەلیفە (هارون الرشید) نەخۆشخانەیەکی لە بەغدا دامەزراند بەناوی خۆیەوە، و فەرمانی کرد بە (ماسویە) کە لە پزیشکەکانی نەخۆشخانەی (جندیسابور) بوو بەوەی کە لێپرسراوێتی بگرێتە دەست، و دوای ئەمیش پزیشك (جبریل بن بختیشوع) بوو بە لێپرسراوی، هەروەها (بەرمەکییەکان)یش لە بەغدا نەخۆشخانەیەکی تریان دروست کرد کە (إبن دهني) پزیشکی بوو، نەخۆشخانەی سێیەم لە بەغدا بریتی بوو لە نەخۆشخانەی (علي بن عیسی)ی وەزیر کە ساڵی (٩١٤ز) بنیاتنرا، چوارەمیش نەخۆشخانەی (موقتەدیری) بوو کە خەلیفە (موقتەدیر)ی عەبباسی ساڵی (٩١٨ز) بنیاتینا، هەروەها نەخۆشخانەی (العضدي) بەناوبانگیشمان بیرنەچێت کە فەرمانڕەوای بوەیهی (عضد الدولة) ساڵی (٩٨١ز) دروستیکرد، هەروەها هەر لە بەغدا چەندین نەخۆشخانەی تر هەبوون وەك (نەخۆشخانەی إبن

الفرات) كە (إبن الفرات)ی وەزیری موقتەدیر دروستی کرد، هەروەها ٢ نەخۆشخانەی تر کە (سنان بن ثابت) دایمەزراندن بە ناوەکانی نەخۆشخانەی (بدر غلمان) و نەخۆشخانەی (السیدة).

هەروەها گرنگیدانی خەلیفەکان بە پزیشکان بەردەوام ... ئەمە وای کرد کە چەندین پزیشکی بەناوبانگ لەناو موسوڵمانان و ... ئەمانیشدا بەردەوام دەرکەون، وەك (جرجیس بن بختیشوع) و کوڕەکەی، (أبوالعباس أحمد بن محمد)، و (علي بن ربن الطبري) کە (٢٤٠ك-٨٥٤ز) کۆچی دوایی کردووە، هەروەها (یوحنا بن ماسویە)، و (أبوعلي بن زرعة)، و زۆری تریش.

هەروەها کاربەدەستانی تری دەوڵەتی ئیسلامی گرنگی زۆریان بە پزیشکان و زانستی پزیشکی دەدا بەتایبەتی لەکاتی جەنگدا، بۆ نموونە: سوڵتان (صلاح الدینی ئەیوبی) بە بەردەوامی (١٨) پزیشك لە خزمەتیدا بوون (٨ پزیشکی موسوڵمان و ٥ جوولەکە و ٤ گاور و یەك سامیری).

## جۆرەکانی نەخۆشخانەکان لە سەردەمە ئیسلامییەکاندا

نەخۆشخانەکان لە سەردەمە ئیسلامییەکاندا دەکران بە ٢ جۆری سەرەکییەوە:

### ١- نەخۆشخانە گەڕۆکەکان:

بریتی بوون لە نەخۆشخانەیەکی ئامادەکراو بە هەموو ئەو پێویستییانەی کە نەخۆشەکان دەیانویست، لە پزیشك و دەرمان و گیراوەکان و جل وبەرگ، وەهەڵدەستان بە گەڕان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر لەو شوێنانەی کە دوور بوون لە شارەکان و خاڵیبوون لە نەخۆشخانە بە مەبەستی چارەسەر کردنی نەخۆشەکان، یەکەم کەس کە

ئەم بیرۆکەیەی دانا پێغەمبەر بوو (ﷺ) کاتێك لە جەنگی (خەندەق)دا فەرمانی کرد بە هەڵدانی خەیمەیەك بۆ چارەسەری برینـدارەکان و (رەفیدەی ئەسلەمی) کە پزیشکێکی ئافرەت بوو لەبواری نەشتەرگەریدا چارەسەری دەکردن، کاتێکیش (سعد بن معاذ) لە قۆڵ و مەچەکیدا پێکرا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کرد کە ببرێت بۆ خەیمەکە بۆ چارەسەر.

ئەمە یەکەم نەخۆشخانەی سەربازی گەڕۆك بوو لە ئیسلامدا دانرا، پاشان خەلیفە و فەرمانڕەواکان ئەم جۆرە نەخۆشخانانەیان فراوان کرد بە جۆرێك هەموو پێویستییەکانی نەخۆشی لەخۆ دەگرت لە خواردن و خواردنەوە و جل وبەرگ و پزیشك و دەرمانساز و جۆرەکانی چارەسەر.

ئەم نەخۆشخانانە لە شوێنێکەوە دەگوێزرانەوە بۆ شوێنێکی تر بەپێی پێویستی بارودۆخی تەندروستی ئەو کاتانە و بەتایبەتی دەبران بۆ ئەو شوێنانەی کە لە نەخۆشخانەی شارەکانەوە دووربوون.

یەکەم کەس کە ئەم کارەی کرد (علي بن عیسی الجراح) وەزیری خەلیفەی عەبباسی (موقتەدیر) بوو، کە نووسراوێکی نووسی بۆ (سنان بن ثابت)[129] کە لێپرسراوی نەخۆشخانەکانی شاری بەغدا و دەوروبەری بوو، و پێیووت: بیرم لە خەڵکانی دانیشتووی ناوچەی سەرووی عێراق کردۆتەوە (أرض السواد)، کە دڵنیام نەخۆشیان زۆرە و پزیشکێکی ئەوتۆیان نییە کە سەرپەرشتی چارەسەریان بکات، لەبەرئەوە هەستە بە

---

[129] خۆی و باوکی (أبوالحسن ثابت بن قرة الحراني) ٢ پزیشکی ناسراوی سەردەمی عەبباسییەکان بوون و سەر بە بیروباوەڕی (صابئة) بوون، بەڵام لە سایەی خیلافەتی ئیسلامی و دەوڵەتەکەیدا بەناوبانگ بوون لە زانستەکاندا بە تایبەتی لە زانستی پزیشکی و بیرکاری و فەلەکدا، لە خزمەتی خەلیفە عەبباسییەکان (المعتضد بالله، المقتدر بالله، القاهر بالله)دا کاریان کردووە لە بەغدا.

ناردنی چەند پزیشکێك و پێویستییەکانیان لە دەرمان و گیراوەکان بۆ ئامادە بکە بۆ ئەوەی بەو ناوچانەدا بگەڕێن، و لەهەموو ناوچەیەك چەند پێویست بکات بمێننەوە وچارەسەری نەخۆشەکانیان بکەن وپاشان بچنە شوێنێکی تر.

ئەمە یەکەم پەیدابوونی ئەو نەخۆشخانانە بوون کە ئەمڕۆ پێی دەڵێن (نەخۆشخانە گەڕۆکەکان)، کە لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا پێشکەوتن و فراوان بوون و زۆر جار لەگەڵ خەلیفەکان و وەزیرەکان و کاربەدەستاندا دەگەڕان بۆ چارەسەری نەخۆشەکان، هەروەها چەندین یەکەی پزیشکی گەڕۆکی تریش هەبوون کە لەگەڵ سوپاکاندا لەکاتی جەنگدا دەگەڕان، هەروەها چەندین نەخۆشخانەی گەڕۆکی تر هەبوون کە ناویان لێنرابوو (نەخۆشخانەی ڕێبواران) (بیمارستان السبیل) کە پزیشکی تێدابوو لەگەڵ چەندین پەرستار و ئامادەکرابوون بە ماددەکانی فریاکەوتنی کتوپڕ و دەرمانی جۆراوجۆر کە لە سندوقی تایبەتیدا هەڵدەگیران، ئەم نەخۆشخانانە بە زۆری لەگەڵ کاروانەکانی حەج و بازرگانیدا دەگەڕان و هەڵدەستان بە چارەسەر کردنی هەر کەسێك کە پێویستی بە چارەسەر بووایە لە ئەندامانی کاروانەکە یان ئەوانەی کە کاروانەکە بەلایاندا دەڕۆیشت لە ڕێگەکەیدا، یەکەم کەسێکیش کە هەستا بە دروستکردنی نەخۆشخانەی لەمجۆرە (موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان) بوو.

## ٢- نەخۆشخانە جێگیرەکان:

ئەم نەخۆشخانانە ژمارەیان ئێجگار زۆر بوو و لە پایتەختەکان و شارەکانی ناوچە ئیسلامییەکاندا بڵاوبوو بوونەوە، بەجۆرێك کە تەنانەت

شاره بچووکەکانی جیهانی ئیسلامیش لەو کاتەدا بێبەش نەبوون لە بوونی ئەم نەخۆشخانە فراوانانە کە هەموو جۆرە پێویستییە پزیشکییەکانی ئەو سەردەمەی تێدابووە، بۆ زۆری ژمارەیان نموونەی شاری (قرطبة)ی پایتەختی ئەندەلوسی ئیسلامی دێنینەوە کە بە تەنیا (٥٠) نەخۆشخانەی تێدابووە!

چەندین نەخۆشخانە هەبوون کە ناوبانگی جیهانییان هەبووە، لەوانە: نەخۆشخانەی (موقتەدیری) لە بەغدا و نەخۆشخانەی (قلاوون) لە قاهیرە و بیمارستانی (النوري) گەورە لە شاری دیمەشق و بیمارستانی (ئەرگۆن) لە شاری (حەلەب)، هەروەها (بیمارستانی ناصری) کە لەلایەن سوڵتان (صلاح الدینی ئەیوبی) لە ساڵی (٥٦٧ك-١١٧١ز) لە شاری قاهیرەدا دروستکرا.



## نەخۆشخانەکان بۆ مەبەستە تایبەتییەکان:

### ١- نەخۆشخانەی گیراو و بەندکراوەکان:

موسولمانان بەوە رازی نەبوون کە گیراو و بەندکراوەکان لە گرتووخانەکاندا بێبەش بن لە خزمەتگوزاری تەندروستی، هەربۆیە بۆ یەکەم جار لە مێژوودا نەخۆشخانەی تایبەت بەخۆیانیان بۆ دروستکردن کە ئامادەکرابوو بە پزیشکان و دەرمانی پێویست و جل وبەرگ و خواردن و خواردنەوە، یەکەم کەسێك کە هەستی بە گرنگی ئەم کارە کرد (علي بن عيسى الجراح) وەزیری خەلیفەی عەبباسی (موقتەدیر) بوو لە سەدەی سێیەمی کۆچیدا، کە نوسراوێکی نارد بۆ (سنان بن ثابت) کە لێپرسراوی نەخۆشخانەکانی شاری بەغدا و دەوروبەری بوو و پێیووت: هەروەها بیرم کردۆتەوە لەوانەی کە لە بەندیخانەکاندان، کە لەگەڵ زۆری ژمارەیان و ناخۆشی رێوشوێنیاندا پارێزراو نین لە تووشبوون بەنەخۆشییەکان، و لەبەرئەوەی کە ناتوانن هەلس وکەوت بکەن و پرس و راوێژ بە پزیشکەکانیان بکەن و چارەسەری دەردەکانیان بۆ بکەن، بۆیە من وام بە باشزانی کە پزیشکی تایبەتییان بۆ دابنرێت کە هەموو رۆژێك بەسەریاندا بگەرێت و لەگەڵیاندا دەرمان و گیراوەکانیان پێبێت و بەسەر بەندکراوەکانی گرتووخانەکاندا بگەرێن و چارەسەری نەخۆشەکانیان بۆبکەن.

### ٢- بنکەکانی فریاکوزاری خێرا:

ئەم بنکانە لە سەردەمە ئیسلامییەکاندا لەنزیك مزگەوتەکان دادەنران و هەروەها لە بنکەکانی پۆستە و شوێنە گشتییەکانیشدا هەبوون، کە لەم

شوێنانەدا خەڵکێکی زۆر کۆدەبنەوە، ئەوەبوو ئەم بنکانە پزیشك و دەرمانساز و دەرمانیان بۆ ئامادە دەکرا بۆ چارەسەری نەخۆش و ئەوانەی کە تووشی رووداوە کتوپڕەکان دەبوون، (المقريزي) مێژوونووس دەڵێت: (أحمد بن طولون) (٢٢٠-٢٧٠ك) کە فەرمانڕەوای میسر بوو یەکەم کەس بوو کە ئەم بنکانەی دامەزراند، کاتێك کە مزگەوتە بەناوبانگەکەی خۆی لە میسر دامەزراند لە پشتییەوە شوێنێکی تەرخان کردبوو بۆ پزیشك و دەرمانخانەیەکی گیراوەکان و دەرمانەکانی تێدا دانا و خزمەتکاریشی بۆ گرتبوو، هەموو رۆژانێکی هەینی پزیشکێك لێی دادەنیشت و چارەسەری نەخۆشەکانی دەکرد لەنێوان نوێژخوێناندا، هەروەها لەناو مزگەوتەکە خۆیشیدا قوتابخانەیەکی فێرکردنی زانستی پزیشکی هەبوو کە زانایانی وەك (عمر بن منصور البهابري، ومحمد بن عبد الله المصري) وانەیان تێدا دەووتەوە.

### ٢- نەخۆشخانەی گولەکان:

ئەو کەسانەی کە تووشی نەخۆشی گولیی بووبوون نەخۆشخانەی تایبەت بەخۆیان هەبوو کە پزیشکی شارەزا و چارەسەری پێویستیان بۆ ئامادەکرابوو بۆ ئەم حاڵەتانە.

مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە کە خەلیفەی ئومەوی (وەلیدی کوڕی عبدالملك) یەکەم کەس بووە لە مێژوودا کە نەخۆشخانەیەکی تایبەتی دامەزراند بۆ چارەسەری نەخۆشی گولیی لە ساڵی (٨٨ك-٧٠٦ن)، ئیتر دوای ئەم خەلیفەکانی تر و کاربەدەستانی شوێنەکان چاویان لێکرد و نەخۆشخانەی تری لەو جۆرەیان دامەزراند.

### ٤- نەخۆشخانە سەربازییەکان:

بۆ ئەندامانی سوپای ئیسلامی نەخۆشخانەیەکی تایبەت بەخۆیان هەبووە کە چەندین پزیشکی پسپۆڕ و دەرمانساز تێیدا کاریان دەکرد، ئەم نەخۆشخانانە لەگەڵ سوپاکاندا دەگەڕان لەکاتی ئاشتی و شەڕدا و هەڵدەگیران لەسەر پشتی ووشتر و ئەسپ و ئێستر کە کەژاوەی فراوان و ئیسراحەتیان لەسەریان دادەنا بۆ گواستنەوەی نەخۆشەکان، ئەمە لەکاتێکدا بوو کە خزمەتی بریندارەکان لە سوپاکانی ئەوروپادا دەکەوتە سەرشانی هاورێکانیان چونکە پزیشك و نەخۆشخانەی تایبەتیان نەبوو بۆ چارەسەری بریندارەکانی جەنگ.

### ٥- نەخۆشخانەکانی شێت و گێلەکان:

خەلیفە عەبباسییەکان نەخۆشخانەی تایبەتیان بۆ شێت و گێلەکان دامەزراند، و چەندین پزیشکی تایبەت ومرۆڤدۆستیان تێدا دانا، کە بە شێوازێکی تایبەتی لەگەڵ ئەم جۆرە نەخۆشانەدا هەڵس وکەوتیان دەکرد چونکە ناتوانن پێویستییەکانی خۆیان دابین بکەن، هەروەها هەموو هۆکارێکی ئیسراحەت و ئاگادارییان بۆ دابین کردن، لەسەر ئەو بناغەیەی کە ئەمان تووشی نەخۆشییەك بوون پاش ئەوەی کە جۆرەکەی دەستنیشانکرا ئەوا دەتوانرێت چارەسەر بکرێت یان بە بەکارهێنانی گیراوە دەرمانییەکان یان بە رێگەچارە دەروونییەکان، لە بەڵگەنامەی ئەوقافەکانی نەخۆشخانەی (نوری) لە (حەلەب)دا هاتووە کە دەبێت هەموو شێتێك دوو خزمەتکاری بۆ دابین بکرێت کە هەستن بە دانانی جلەکانی هەموو بەیانییەك و لەئاوی ساردا بیشۆن، دوایی جلی پاك

وخاوێنی لەبەر دەکرێت و یارمەتی دەدەن بۆ ئەنجامدانی نوێژەکانی و قورئانی بۆ دەخوێنن کە یەکێکی دەنگخۆش بۆی تیلاوە دەکات و پاشان لە هەوای دەرەوەدا پیاسەشی پێدەکەن.

لە هەندێك شوێنیشدا بەشێکی تایبەتییان لە نەخۆشخانە گشتییەکاندا بۆ تەرخان دەکرا بۆ ئەوەی کە پزیشکەکانی نەخۆشخانەکە بتوانن سەریان لێبدەن و چارەسەریان بکەن، هەروەك لە نەخۆشخانەکەی شاری (قاهیرە)دا هەبوو لە سەدەی شەشەمی کۆچیدا.

ئەمە لە کاتێکدا دەکرا لەلای موسوڵمانان کە ئەورووپا بە هیچ شێوەیەك مانای راستەقینەی نەخۆشی و پزیشکی نەدەزانی، و تا رادەیەکی زۆر لەژێر کاریگەریی نوشتە و فاڵ و جادووگەرییدا بوون، و تەسلیم بووبوون بۆ رەقترین جۆری جادووگەریی و هەڵخەڵەتاندن لەگەڵ بوونی دەمارگیرییەکی ئاینی سەختدا، هەر لەم بارەیەوە پرۆفیسۆر (درابد)ی مێژوونووسی رۆژئاوایی لە کتێبەکەیدا (گەشەکردنی رۆشنبیریی لە ئەورووپادا The Intellectual Development in Europe) دەڵێت: جوتیارە ئەورووپییەکان ئەگەر تووشی رووداوێکی کوتوپڕ یان تایەك بهاتنایە رایاندەکرد بۆلای گۆڕی پیاوچاکێك و چاوەڕێی روودانی موعجیزەیەکیان دەکرد بۆ ئەوەی چارەسەری کێشەکەیان بکات، ئەوانەش کە تووشی شێتی یان نەخۆشی دەروونیی دەبوون لە خانووەکانی شێتەکاندا کە لە بەندیخانە خراپتر بوون بە زنجیر دەبەسترانەوە تا ئەو کاتەی دەمردن!!.

## ٦- تەندروستی قوتابخانەکان:

کاتێك کە رووبەری دەوڵەتی ئیسلامی تەواو فراوان بوو و خەڵکی بەرەوپیری خوێندن چوون، ئەمە وای کرد کە کاربکرێت بۆ پارێزگاری

کردنـی تەندروسـتی قوتابیـان و بـە بـەردەوامی پشـکنینیان بـۆ بکرێـت، هەربۆیە زۆر پێویست بوو کە پزیشکێك تـەرخان بکرێـت کـە سەرپەرشـتی تەندروستی قوتابیان و مامۆستایان و خزمەتگوزارەکان بکات، بـۆ نموونـە لـە قوتابخانـەی (المستنصـرية) لـە بەغـدا پزیشـکێك هـەبووە کـە هـەموو بەیانییـەك زوو دەچـوو بـۆ بینینـی ئەوانـەی نەخۆشـن و بەسـەری دەکردنـەوە، هـەردوو مێـژوونوس (إبـن العـبري) و (إبـن واصـل) بۆمـان دەگێڕنـەوە کـە لـە قوتابخانـەی (المستنصـرية) سـازنگەیەکی دەرمـان هەبووە کە هەموو جۆرە دەرمان و گیراوەیەکی ئەو کاتەی تێدابووە.

لێرەشدا پێم جوانە ئەوە بێنمەوە کە قوتابخانـەی فێربـوونی پزیشـکی لە (المستنصرية) لە پاڵ قوتابخانەکانی (فیقه و دار السنة و دار القـرآن) و ئەوانی تردا بـووە و تەواوکـەری یـەکتری بـوون، و بۆمـان دەردەخـات کـە چارەسـەر کردنـی نەخۆشـەکانی ئـەو قوتابخانـە گەورەیـە (کـە بەهـەمان پێکهاتـەی زانکۆکـانی ئـەمڕۆ بـووە) چـەند بەلایانـەوە گـرنگ بـووە، و پاراسـتنی تەندروسـتی لەشـی مـرۆڤ لـە گـرنگترین ئـەو کارانـە بـوون کـە لەلایەن مامۆستایان و پزیشکانی ئەم قوتابخانەیەوە گرنگی پێدەدرا.

## قوتابخانە و پەناگە خێرییەکان:

موسـوڵمانان وەك عادەتیـان لـە هـەموو شـتێکدا کـە خێـر و چـاکەی کۆمـەڵگای مرۆڤایـەتی تێـدابوو بێـت پێشدەسـت بـوون لـە دامەزرانـدنی پەناگـەکان (ملاجـيء) و قوتابخانـە خێـری و خۆڕاییـەکان، بـە تایبـەتی دایـەنگاکانی منـدالان و بەخێوکـەری منالـە هـەتیوەکان و منـالانی خەڵکـە کەمدەستەکان، کە پـەروەردەیان دەکـردن و فێریـان دەکـردن و چـەندین جۆریان هەبوو، وەك ئەمانە:

١- خانووەکانی شیرپێدان و لانەی هەتیوان (دایەنگاکان):

ئـەم شـوێنانە تـەرخان کرابـوون بـۆ ئـەو منداڵانـەی کـە دایکانیـان لەدەستدابوو و هەروەها بۆ منداڵانی هەژاران کە کەسیان نەبووە شیریان پێبـدات و ئاگـای لێیـان بێـت و شـەونخونی بکـات لـە گۆشـگرتنیان و پـەروەردە کردنیـان، یەکـەم کەسـێك کـە هەسـتا بـە تـەرخانکردنی خانوویـەکی تایبـەتی ئامـادەکراو بـە هـەموو پێویسـتییەکانییەوە بـۆ ئـەم جۆرە منداڵانە (مظفرالدین کوکبوري) فـەرمانڕەوای (هـەولێر) بـوو (٥٤٩-٦٣٠ك)، کە شیردەر و دایەنی جێگیری بـۆ دیـاری کـردن لـەو خـانووەدا و هەروەها چەندین خزمەتگوزاریشی بۆ دیاری کـردن بـە مەبەسـتی خزمـەت کردنیان و پزیشکێکیشی دیاری کرد کە سەرپەرشتی چارەسـەریان بکـات و ئاگای لێیان بێت.

٢- قوتابخانەی ڕێبواران (کتاتیب السبیل):

ئەمانە بریتی بوون لە چەند قوتابخانەیەکی کراوە بـۆ هـەموو ئەوانـەی پێویسـتیانە لـە هـەتیوان و منـداڵانی هـەژاران بـۆ خوێنـدن و هـەروەها مانەوەشـیان، کەواتـە ئەمانـە چـەند قوتابخانەیـەك بـوون لەگـەڵ بەشـی ناوخۆیی بۆ قوتابیان کە لەلایەن خەلیفـەکان و دەسـەڵاتدارانی دەوڵـەت و چاکەکارانەوە تەرخان دەکران.

کۆنترین لەم قوتابخانانە کە مێژوونووسان باسیان کردووە ئـەو دانەیـە بووە کە (یحیی البرمکي) وەزیری خەلیفە (هـارون الرشـید) دایمەزرانـد لـە بەغدا لە سەدەی دووەمی کۆچیدا.

قوتابییە کوڕەکانی ئەم قوتابخانانە کاتێك دەگەیشتنە تەمەنی عـاقڵی داوایان لێدەکرا کە هەڵبژێرن لەنێوان بەردەوام بوون لە خوێندندا یان بچـن

کارێك هەڵبژێرن کە خۆیان حەزیان لێیەتی و بەهۆیەوە ژیانێك بۆ خۆیان دابین بکەن، کچەکانیشیان دەیانخوێند و فێردەکران لەسەر کاروباری ماڵەوە و پاشان دەدران بەشوو بەو کەسانەی کە بتوانن ژیانێکی گونجاویان بۆ دابین بکەن.

٣- ماڵەکانی نابینایان و پەککەوتەکان:

ئەم شوێنانە بە تایبەتی بنیات دەنران بۆ ئەوانەی کە پەککەوتە و لەقاچ کەوتوو و کوێربوون بۆ ئەوەی کە لێی بژین و خواردن و جل وبەرگیان پێبدرێت، خەرجی ئەم خانووانە لەو وەقفانە دەبوو کە بۆیان تەرخان دەکران، یەکەم کەسێك کە کۆی کردنەوە و لەم شوێنانەدا داینان بۆ سەرپەرشتییان خەلیفەی ئومەوی (وەلیدی کوڕی عبدالملك) بوو (٨٦-٩٦ك)، کە بۆ هەموو کوێرێك ڕێنیشاندەرێکی دیاری کرد کە یارمەتی بدات لە هاتوچۆیدا و ئاگاداری بێت و هەروەها بۆ پەککەوتەکانیش هەریەکەو خزمەتگوزارێکی بۆ دیاری کردن کە خزمەتیان بکات و ئاگای لێیان بێت.



**ئەم وێنەیە پزیشکێکی موسوڵمان دەردەخات**

**لەکاتی پشکنینی نەخۆشێکدا**

**چارەسەر و سیستمی چارەسەر لە نەخۆشخانە ئیسلامییەکاندا:**

لە نەخۆشخانەکاندا هەموو کەسێك کە پێویستی بە چارەسەر بوایە وەردەگیرا بەبێ گوێدانە رەنگی یان دیانەتی یان پلەوپایەی ئەگەر نێر بوایە یان مێ، نەخۆشەکە بەخۆڕایی چارەسەر دەکرا لەماوەی مانەوەی لە نەخۆشخانەکەدا، کاتێکیش لە نەخۆشخانە دەردەچوو قاتێك جل و بڕێك پارەی دەدرایە بۆ ئەوەی پێی بژی تا ئەو کاتەی دەیتوانی دەست بکاتەوە بە کارکردن، هەر کەسێکیش لە نەخۆشخانە بمردایە ئەوا لەسەر ئەرکی نەخۆشخانەکە ئامادە دەکرا بۆ ناشتن و دەنێژرا، هەموو مەسروفات و خەرجیاتە زۆرەکانی نەخۆشخانەکانیش لە داهاتی ئەو ئەوقافە تایبەتییە زۆرانە دەدران کە بۆیان تەرخان دەکران، کە زۆر کافی بوو بۆ دەرهێنانی پارەی هەموو پێویستییەکانی نەخۆشخانەکان، بۆ نموونە نەخۆشخانەی (مەنسوری) بە تەنیا هەموو ساڵێك یەك ملیۆن درهەمی سەرف دەکرد بۆ نەخۆشەکانی.

سیستمی بەکارهاتوو لە نەخۆشخانە ئیسلامییەکاندا جیاواز نەبوو لەو سیستمەی ئەمڕۆ ئێمە لە نەخۆشخانەکانماندا رەچاوی دەکەین، کە بە شێوەیەکی سەرەکی دوو جۆر چارەسەر هەبووە:

جۆری یەکەم: هەروەك کلینیکە دەرەکییەکانی ئەمڕۆ وابووە (العیادات الخارجیة)، کە پزیشکێك لە شوێنێکی تایبەتیدا دادەنیشت و نەخۆشەکان دەهاتن بۆلای و دەیبینین و دەیپشکنین و ئەوەی پێویستی بە چارەسەر بووایە ئەوا لەسەر کاغەزێك جۆری چارەسەرەکەی بۆ دەنووسین و دەینارد بۆ دەرمانخانەکە، ئەمیش بەپێی نوسراوەکە چارەسەر و گیراوەکانی بۆ ئامادە دەکرد و چۆنێتی بەکارهێنانی

تێدەگەیاند، کەواتە موسوڵمانان یەکەم کەس بوون لە مێژوودا کە سیستمی کلینیکە دەرەکییەکانیان داهێنا و یەکەم کەسیش بوون کە دەرمانخانە یاساییەکانیان بۆ نەخۆشخانەکان زیاد کرد.

لە نموونەی ئەم نەخۆشخانانە بیمارستانی (قلاوون) بوو لە شاری (قاهیرە) کە بەشێکی دەرەکی هەبووە و لە رۆژێکدا زیاد لە ٤٠٠٠ نەخۆش تێیدا دەبینران و چارەسەریان وەردەگرت، ئەم نەخۆشخانەیە گەورەترین بیمارستان بووە لە سەردەمی خۆیدا و لە ٢ بەشی سەرەکی پێکهاتووە (بەشی پیاوان و بەشی ئافرەتان) کە ئەمانیش لە چەندین بەشی کلینیکی پێکهاتوون، وەك: هەناوی و نەخۆشییەکانی چاو و سکچوون و نەخۆشییە درمییەکان و نەشتەرگەری و بەشێکی نەخۆشییە دەروونییەکانیش، لە هەمان کاتدا قوتابخانەیەکی فێربوونی زانستی پزیشکیش بووە و (گەورەی پزیشکەکان) کە بە زاراوەی ئەمڕۆ (راگری کۆلێجی پزیشکییە) سەرپەرشتی دەکرد، ژمارەی پزیشکان لە سایەی دەوڵەتی ئیسلامیدا ئێجگار زۆر بوون بەشێوەیەك کە دەڵێن تەنها لە (بەغداد)دا رێژەی پزیشکان بە ١ دانە بۆ هەموو ٣٠٠ کەسێك دیاریکراوە لە ساڵی (٣١٩ك-٩٣١ز)دا!




نەخۆشخانەی (بیمارستانی) قەلاوون لەناوجەرگەی شاری (قاهیرە)دا

جۆری دووەم: چارەسەری نەخۆشەکان بوو لەناو نەخۆشخانەکاندا، کە دەهاتن نەخۆشەکانیان دابەش دەکرد بەپێی هۆڵەکان و بەپێی جۆری نەخۆشییەکانیان، کە بۆ هەموو بەشێك لە نەخۆشخانەکە پزیشکی پسپۆڕی تایبەتی خۆیان هەبوو کە ژمارەیان بەپێی فراوانی بەشەکە و ژمارەی نەخۆشەکان دیاری دەکران، لەناو ئەم هۆڵانەدا نەخۆشەکان بە باشترین ڕێگە چارەیەك کە ناسیبێتیان چارەسەر دەکران، هەروەها بەرپرسیارێتی پزیشکەکان و جۆری کارەکانیشیان جیاواز بوو، هەیانبوو کە لە نەخۆشخانەکەدا بەشەو و بەڕۆژ دەمایەوە (کە ئەمە بەتەواوەتی لەکاری پزیشکی ئیشکگر یان پزیشکی موقیمی ئەمڕۆ دەچێت)، و هەشیانبوو کە لە نەخۆشخانەکەدا هەفتەی یەك ڕۆژ یان دوو ڕۆژ یان زیاتر دەمایەوە بەپێی ژمارەی پزیشکەکانی نەخۆشخانەکە، ئەوەتا دەبینین پزیشك (جبريل بن بختيشوع) سەرەی کاری لە نەخۆشخانەدا هەفتەی دوو شەو و دوو ڕۆژ بووە.

ڕێگاکانی چارەسەر لە نەخۆشخانە ئیسلامییەکاندا لەسەر بناغەیەکی زانستی بوو، کە هەموو نەخۆشێك کارتێکی تایبەت بەخۆی هەبووە کە پزیشکەکەی تێبینییەکانی خۆی لەسەر دەنووسی لەکاتی چارەسەردا، هەموو پزیشکێکیش تۆمارێکی تایبەت بەخۆی هەبووە کە تێبینییەکانی خۆی تێدا نووسیوە سەبارەت بەو نەخۆشییانەی چارەسەری دەکردن و تاقیردنەوە و شارەزایی خۆی تێدا روون دەکردەوە، و لە کۆتاییشدا ئەم تێبینییانە لەوانەیە ببونایە بە سەرچاوەیەك بۆ پزیشکەکانی دوای خۆی، هەروەك چۆن لە مەوسوعەکەی پزیشك (أبوبكر محمد بن زكريا الرازي)دا دەبینین کە پوختەی شارەزایی و تاقیکردنەوەکان و تێبینیەکانی خۆی تێدا کۆکردەوە و ناوی نا (الحاوي في الطب).

پزیشکەکانی نەخۆشخانە ئیسلامییەکان خاوەنی رۆحێکی پڕۆزەتیڤانە و زانستییانەی گەورە بوون، هەرکاتێك یەکێکیان شکستی بهێنایە لە دۆزینەوەی نەخۆشییەك یان چارەسەری نەخۆشێکدا ئەوا پزیشکێکی تری بەشێکی تری غەیری بەشەکەی خۆی بانگدەکرد بۆ ئەوەی کە راوێژی پێبکات، و پێکەوە چارەسەری گونجاویان دیاری دەکرد، ئەمەش یەکەمجارە لە مێژوودا کە بۆچوونی کاری بەکۆمەڵ (گروپانە) لە چارەسەری نەخۆشەکاندا هێنرایە کایەوە کە بە زاراوەی پزیشکی ئەمڕۆ پێیدەووترێت (Team Work) کە زیاتر لە یەك پزیشك کۆدەبوونەوە بۆ دیاری کردن و چارەسەری حاڵەتەکان، ئەم کارە بۆچوونێکی گرنگتری لێکەوتەوە کە لە رۆژگاری ئەمڕۆدا پێی دەووترێت کۆنفرانسی حاڵەتەکان (Case Conference) کە کۆمەڵێك پزیشك لەسەر حاڵەتێك کۆدەبنەوە و گفتوگۆی لەسەر دەکەن و گونجاوترین رێگەچارەی بۆ دیاری دەکەن، مەبەست و ئامانجی سەرەکی پزیشکانی موسوڵمان لە هەموو ئەم کارانەیاندا بریتی بوو لە چاکبوونەوەی نەخۆشەکان.


رسم يبين طريقة الفحص الطبي في البيمارستان العضدي

**ئەم وێنەیەی ناو کتێبێکی پزیشکی موسوڵمانان شێوازی پشکنینی کلینیکی گوێ روون دەکاتەوە لە نەخۆشخانەی (العضدي) لە شاری بەغداد**

(خليل بن شاهين الظاهري) لە کتێبی (النجوم الزاهرة)دا پاش ئەوەی کە سەردانی شاری (دیمەشق)ی کردووە باسی نەخۆشخانە گەورەکەی

دەكات و دەڵێت: تێیدا بیمارستانێك هەیە كە دونیا شتی وای بەخۆیەوە نەدیوە، كاتێكیش كە چوومە دیمەشق لە ساڵی (٨٣١ك)دا لەگەڵ هاوڕێیەكمدا كە خاوەنی رەووشتبوو بەڵام سوعبەتچی بوو ئەوەبوو چووە نەخۆشخانەی شارەكە و لەوێ خۆی نەخۆش خست و ٣ رۆژ مایەوە كە گەورەی پزیشكەكان سەری لێدەدا، كاتێكیش كە پشكنینی بۆ كرد و بە حاڵەتەكەی زانی ئەوەی پێویستی كرد لە خواردنی چاك و میوە و شیرینی بۆی نووسی بەبێ دەرمان، دوای ٣ رۆژ پزیشكەكە ووتەیەكی بۆ نووسی و پێی ووت: میوان لە ٣ رۆژ زیاتر نابێت بمێنێتەوە، كە ئەمە ئەوە دەگەیەنێت كە زانیوێتی نەخۆش نییە و وەك میوانێك مامەڵەی لەگەڵ كردووە ! !

(گۆستاڤ لۆبۆن)ی مێژوونووسی فەرەنسی دەڵێت: نەخۆشخانەكانی موسوڵمانان بەشێوەیەكی تەندروستییانە هەواگۆڕكێیان هەبووە بەرادەیەكی راقیتر لە نەخۆشخانەكانی ئەمڕۆ، زۆر گەورە بوون و ئاو و هەوا بە بەشەكانی نەخۆشخانەكاندا بە ئاسانی گوزەری دەكرد، حیكمەت و ئامۆژگارییە كۆنەكانی زانكۆی (سالێرنۆ) نموونەی گرنگیدانە بە بواری تەندروستی، كە زانراوە ئەم قوتابخانە پزیشكییە كە بە باشترین پەیمانگای پزیشكی ئەورووپا دادەنرا منەتباری موسوڵمانانە بۆ ناوبانگە باشەكەی.

(Rom Landau) دەڵێت: زۆر هۆكار هەیە ئەو باوەڕەمان بۆ دروست دەكات كە كاتێك ئەورووپا دەستی كرد بە دروستكردنی نەخۆشخانەكان لەكۆتاییدا لە سەردەمی جەنگی خاچپەرستاندا، ئەمە بەهۆی ئەو نموونە زیندووە بوو كە موسوڵمانانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست نیشانیاندان، چونكە كاربەدەستانی سەلاجیقە و مەمالیك لەو كاتەدا

چەندین نەخۆشخانەی نوێی پلە یەکیان لە شارەکانی دیمەشق و قاهیرە دروستکرد.

یەکەم نەخۆشخانەیەکی فەرمی کە لە شاری (پاریس) لە فەرەنسا دروستکرا بەناوی (Les Quinze-Vingt) بوو کە پاشا (لویسی نۆیەم) دوای گەڕانەوەی لە هەڵمەتی خاچپەرستی (١٢٥٤-١٢٦٠ز) دروستیکرد.

پزیشکانی گاوری ئەو سەردەمە نەیانتوانی ڕێزی خۆیان دروستبکەن لەدڵی هاوتا عەرەبەکانیاندا، و زۆر دەقمان لەبەردەستدایە کە سەرچاوە عەرەبییەکان بە گاڵتەوە باسی نەزانیی پزیشکانی گاور و ڕێگەچارە بەربەرییەکانیان دەکەن بۆ نەخۆشەکانیان، بەهەرحاڵ یەکەمین تیشکی بیر و زانست کە تاریکایی ئەورووپای شکاند تەنها ئەو کاتە پرشنگیدایەوە کاتێك کە زانا ڕۆژئاواییەکان بە تامەزرۆییەوە ئاوڕیاندایەوە بۆ جیهانی ئیسلامی، و هەستان بە وەرگێڕانی شوێنەوارەکانی پزیشکە موسوڵمانەکان بۆ زمانی لاتینی، ئەمەش بۆ ئەوەی کە قوتابیانی زانکۆ ئەورووپییەکان سەری تێکەن و سوودی تەواوی خۆیانی لێوەرگرن، موسوڵمانان ٣ هەنگاوی مەزنیان بە زانستی پزیشکی نا:

١- بیردۆزە یۆنانییەکانیان کۆکردەوە و ڕێکیان خستن و ڕاقەیان کردن.

٢- زانستی پزیشکیی کلینیکییان هێنایە کایەوە.

٣-چەندین نەخۆشی وسیستمی چارەسەری نوێیان دۆزییەوە وهێنایە کایەوە.

ئەمە بریتی بوو لە سیستمی بەرزی چارەسەر لە نەخۆشخانە ئیسلامییەکاندا، با ئێستا بڕوانینە ئەوبەری دەریا و ڕووبکەینە ئەورووپای ئەو کاتە بۆ ئەوەی بزانین لەوێ چۆن نەخۆش چارەسەر دەکرا:

مێژوونووس (ماکس نوردو) دەربارەی نەخۆشخانەی شاری (پاریس) کە ناوی (ئوتێل دیو) بووە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بەم جۆرە دەدوێت: لەسەر یەك جێگە ٥ یان ٦ نەخۆش رادەکشان کە قاچی هەندێکیان لای سەری ئەوانی ترەوە بووە، زۆر جار منداڵان لەپاڵ پیر و پەککەوتەکانەوە دادەنران یان ئافرەتێك لەژانی منداڵبووندا لەگەڵ شیرەخۆرەیەك دادەنرا کە ئازاری ناوسکی هەبووە، یان ئەوەی تای نەخۆشی دەیسوتاند لەگەڵ کەسێکی نەخۆشی سنگدا کە بەکۆکە هەراسانی دەکرد یان لەگەڵ کەسێکی گەڕدا دادەنرا کە بە خوراندن پێستی خۆی دادەماڵی، بەڵێ ئەمە حاڵی قەرەباڵغی ناو نەخۆشخانەکان بووە ئەگەر باوەڕ دەکەیت!!

بۆنی هەوای ناو نەخۆشخانەکان ئەوەندە پیس و بۆگەن بووە کە سەردانیکەرەکان نەیاندەتوانی بچنە ژوورەوە تاوەکو ئیسفنجێکی تەڕکراو بە خەل نەدەن بەسەر دەم ولوتیاندا، زۆر جار لاشەی مردووەکان زیاد لە ٢٤ کاتژمێر بەسەر جێگەکانەوە دەمانەوە.

(باللی و وینتون و لافوازییە) لە راپۆرتەکەیاندا وەسفێکی وایانکردووە کە لەش مووچڕکەی پێدادێت کە دەیخوێنێتەوە، کە بەچاوی خۆیان مردوویان بینیوە لەپاڵ زیندووەکاندا، و ئەوانەی کە خەریك بوو چاك ببنەوە لەپاڵ ئەوانەدا بوون کە لە سەرەمەرگدا بوون.

ژووری نەشتەرگەری کە کرداری هەڵدڕین و بڕین و دوورینەوەی تێدا ئەنجامدەدرا ئەوانەی تێدا دادەنران کە بۆ رۆژی دوایی نەشتەرگەرییان بۆ ئەنجامدەدرا، بە بەرچاوی ئەمانەوە و لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا ئامادەکارییەکانی ئەم سزادانەیان دەبینی و گوێیان لە هاواری ئەوانە دەبوو کە نەشتەرگەرییان بۆ دەکرا.

حاڵی ئەم نەخۆشخانەیە هەر لەکاتی دامەزراندنییەوە لەساڵی (٦٦٠ن)دا تا کاتی شۆڕشی فەرەنسی لە (١٧٨٩ن)دا بەشێوەیەکی گشتی گۆڕانکارییەکی ئەوتۆی بەخۆیەوە نەدینی.

## هەوڵە زانستییەکان و دەستکەوتەکانی زانایانی موسوڵمان لەبواری زانستی پزیشکیدا

موسـوڵمانان بەشـێوەیەك زانسـتی پزیشـکییان پێشخسـت کـە هـیچ میللەتێکی تر وەك ئەمانی نەکردووە، لە سەدە یەکەمـەکانی دوای کۆچـی پێغەمبـەر (ﷺ) زانسـتی پزیشـکی بـوو بـە بەشـێکی جیانـەکراوە لـە رۆشـنبیری گشـتی موسـوڵمانان، و رۆژئـاواش بەشـێوەیەکی قـووڵ کاریگەربوون بەو زانیارییانەی کە لە موسوڵمانانەوە وەریانگرت.

زۆرێك لە شارەزایانی زمانـەوانی باوەڕیـان وایـە کـە ووشـەی (Drug) کە لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا بـە مانـای دەرمـان بـەکاردێت لـە بنەڕەتـدا لـە ووشەی (عقار)ی عەرەبییەوە وەرگیراوە کە ئەمیش هەر بە مانای دەرمـان دێت.

زانا (إبن سینا) یەکەم زانای موسڵمانە کە ڕوونی کـردەوە دیـاریکردنی (نێرینەی کۆرپەلە) پەیوەندی بە پیاوەوەیـە نـەك ژن، هـەروەها ئـەم بـوو کە دەرگـای والا کـرد بـۆ لێکۆڵینـەوەکان لـەبواری پزیشـکی خۆپـارێزی و بڵاوبوونـەوەی نەخۆشـی ( Community medicine & Epidemiology) بـەوەی کـە هەسـتی بـەوە کـرد و باسـی ئـەوەی کردووە کە نەخۆشی لەوانەیە لەرێی ئاو و خۆڵەوە بڵاوببێتـەوە، هـەروەها باسـی ئـەوەی کـردووە کـە نەخۆشـی سـیلی سـییەکان لەوانەیـە لـە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر بڵاوببێتەوە، کە ئەمانە بۆچوونێکی تەواو تازە بوون بۆ ئەو سەردەمەی زانیارییەکانی مرۆڤایەتیی.

زانا (إبن رشد الأندلسي) یەکەم کەس بوو کـە سـەلماندی مـرۆڤ ٢ جـار توشی ئاوڵە نابێت، کە ئەم راستییەی لە کتێبی (الکلیـات)دا بڵاوکـردەوە

که بۆ یەکەم جار ساڵی (١٤٩٠ن) چاپکرا لە (ڤینیسیا) و پاشان چەندین چاپی بەدوای یەکدای لێدەرچوو، هەر لەم کتێبەدا روونکردنەوەیەکی تەواوی کاری تۆری چاوی تێدایە، هەروەها هەستاوە بە راڤەکردنی چەندین کتێبی پزیشکی وەك (القانون)ی ئیبن سینا، ئێمە قەرزاری ئەوین بۆ نووسینەکانی دەربارەی دەرمانسازی و ژەهرەکان و درم و پەتاکان، (روم لاندو) دەڵێت: یەکێك لە ناسراوترین ناوی دنیای پزیشکی موسوڵمانان (ئیبن روشد) بووە کە لە ئەورووپا بە (Averroes) ناسراوە، چەندین پلەوپایەی بەرزی دەوڵەتی وەرگرت، لەنێوان کتێبە پزیشکییە بەناوبانگەکانی (الکلیات في الطب)ە[١٣٠].

هەر زانایانی ئێمە بوون کە دەرمانخانەکانیان دروستکرد، و زۆرێك لە ماددە کیمیاییەکانیان لە دەرماندا بەکارهێنا، بەتایبەت (إبن البیطار، و داود الأنطاکي) کە باسی ڕووەکەکانیان کردووە بۆ دەرمان و ئەندازەی بەکارهێنانەکانیان دیاری کردووە، (ڕازی) یەکەم کەس بووە کە (جیوە)ی بەکارهێناوە لە پێکهاتەی مەرهەمی ساڕێژ کردنەوەی برینندا، و یەکەم کەس بووە کە جیوەی بەکارهێناوە وەك چارەسەرێك بۆ نەخۆشی لەسەر (مەیموون) و سەرکەوتوو بووە تیایدا.

زانا (موفق الدین عبدالطیف البغدادي) کە مامۆستایەکی فێرکردنی پزیشکی بووە لە قوتابخانەی (الأزهر) یەکەم کەس بووە کە هەڵەکانی پزیشکی ڕۆمانی (جالینۆس)ی بەوردیی دیاریکردووە لە زانستی (توێکاری)دا، لەوانە (جالینۆس) ووتویەتی: کاکیلەی خوارەوەی مرۆڤ لە ٢ ئێسك پێکدێت (کە خۆی یەك ئێسکە).

---

[١٣٠] بڕوانە کتێبی (الإسلام والعرب)/ (روم لاندو) لا ٢٦٥.

(سێر تۆماس کلیفۆرد) دەڵێت: زۆرێك لەو دەرمان و وەسفە پزیشکییانەی لەمڕۆدا بەکاردێن بناغەی گرتنەوە و دەرهێنانی دەگەڕێتەوە بۆ موسوڵمانان [131].

زانا (إبن النفیس) (٦٠٧-٦٨٧ك) یەکەم کەس بووە کە سووڕی خوێنی بچکۆلە (سووڕی سییەکان)ی لە لەشی مرۆڤدا دۆزییەوە پێش ئەوەی کە پزیشکە پورتوگالییەکان ئاماژەی پێبدەن (کە لەمڕۆدا ئەم دۆزینەوەیە دراوەتە پاڵ ئەوان)، هەروەها ئاماژەی بەوە داوە کە کون و ڕێڕەو نییە لەنێوان دوو لاکەی دڵدا و باسی خوێنبەرە تاجییەکانی دڵیشی کردووە، سێرڤیتۆس (Servetus) (١٥٠٩-١٥٥٣ز) و زانایان و پزیشکانی تری سەردەمی راپەڕین و رابوونەوە لە (Vesaleus) و (Renaldo Colombo) و غەیری ئەمانیش ئەگەر ووتەکانی (ئیبن نەفیس)یان نەقڵ نەکردبێت ئەوا هیچیان لەو زیاتر نەوتووە، هەربۆیە ئەوە راستە کە (ئیبن نەفیس) خاوەنی فەزڵ بێت لەنێو زانایاندا کە رێخۆشکەر بووە بۆ دۆزینەوەی سووڕانی خوێن لەلایەن (هارڤی)یەوە.



لێکۆڵینەوەی توێکاری و کارەکانی مێشك لە کتێبێکی پزیشکی موسوڵمانانا

(Rom Landau) دەڵێت: (ئیبن نەفیس) رەخنەی گرتووە لە هەردوو بیردۆزی (جالینۆس) و (ئیبن سینا) دەربارەی هاتووچۆی خوێنی خوێنهێنەرەکان لەنێوان سکوڵەی راست و چەپی دڵدا، بەمەش سەلماندنی کە رابەر بووە و پێش (ولیام هارڤی)

[131] بڕوانە: Encyclopedia Britannica.

کەوتووە لەدۆزینەوەی سووڕی خوێنی بچووکدا، کە ڕوونی کردۆتەوە کە خوێن لەدڵەوە کاتێك دێت بۆ سییەکان و لەوێ دەردەکەوێت بە پرۆسەیەکی پاککردنەوەدا دەڕوات کاتێك کە ئیحتیکاك دەکات لەگەڵ ئەو هەوایەدا کە لەش لە دەرەوە وەریدەگرێت، بەم دۆزینەوەیەی پێش زانا ئەورووپییەکان کەوتووە بە ٣ سەدە، کە لەگەڵ ئەمەشدا بۆ سەدان ساڵ ناوی ونکرابوو، تەنها لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا زانایان پلەی مەزنی ئەمیان بۆ دەرکەوتووە[١٣٢].

گەورەترین پێشکەوتنی پزیشکە موسوڵمانەکان لەبواری (نەشتەرگەریدا) بووە، چونکە لە سەرەتای سەدەی یانزەیەمی زایینیدا دەیانزانی کە چۆن ئاوی سپی چاو چارەسەر بکەن بە دەرهێنان و لابردنی هاوێنەی چاو، هەروەها چۆنێتی ووردکردنی بەردی میزەڵدان و وەستاندنی خوێنبەربوون بە ئاوی سارد، و بەکارهێنانی ماددە داخکەرەکان، و دانانی فتیلە بۆ دەرهێنانی کێم و دەردراوەکان، هەروەها توانیویانە کە چەند بەشێکی ئێسکی کەللەی سەر لێبکەنەوە و لەبری ئێسکی سەگ دابنێن، هەروەها بێهۆشکاریی پزیشکیشیان زانیوە پێش ئەنجامدانی کرداری نەشتەرگەری (بەنج کردن) کە دۆزینەوەیەکی زۆر گرنگە و زۆر کەس وادەزانن کە ئەمە دۆزینەوەیەکی نوێیە، ئەم کردارەیان بە پێدانی دەرمانێکی وەرگیراو لە ڕووەکی (الزوان) ئەنجامدەدا پێش ئەنجامدانی نەشتەرگەرییە بەئازارەکان، ئەم ماددەیە دەبووە هۆی لەدەستدانی هۆشی نەخۆشەکە.

یەکێك لە نەشتەرکارە بەناوبانگەکان زانای ئەندەلوسی (أبو القاسم علي بن سليمان الزهراوي) بووە کە ساڵی (٤٠٤ك) مردووە، لەلاتینیدا بە

---

[١٣٢] بڕوانە کتێبی (الإسلام والعرب)/ (روم لاندو) لا ٢٦٤.

(Abul casis) یان (Alsaharavius) ناسراوە، یەکەم کەس بووە کە باسی کردنەوەی بۆری هەوایی (القصبة الهوائیة)ی کردووە (Tracheostomy) لە نێو پزیشکاندا، یەکەم کەس بووە کە لە زانستی (نەشتەرگەری)دا کتێب بنوسێت، کە کتێبێکی وێنەدارە و وێنەی نەشتەرگەرییەکان و ئەو ئامێرانەی تێیدا بەکاردێن تێیدا کێشراون.

کتێبەکە بەناوی (التصریف لمن عجز عن التألیف)ە و لە ٣٠ مەقالە و نوسراو پێکدێت، کە دابەشکراوە بۆ ٣ بەشی سەرەکیی: ١- پزیشکی، ٢- نەشتەرگەری، ٣-زانستی دەرمانە تاك و گیراوەکان.

بەشی دووەمی ئەم کتێبە وەرگێڕدرا بۆ زمانی لاتینی لە سەدەی شانزەدا لەژێر ناونیشانەکانی: (Chirurgia Parva) و ( Liber Servitoris) بلاوکرایەوە، ئەوەی کە وەریگێڕا (جیرالدی کریمۆنی) بوو، هەروەها لە (ڤینیسیا)ش سالّی (١٤٩٧ن) چاپکرا، و جارێکی تر لە (بال)ی (سویسرا) لە سالّی (١٥٤١ن)دا بلاوکرایەوە، دەقە عەرەبییەکە و وەرگێڕانە لاتینییەکەی پێکەوە لە (ئۆکسفۆرد) سالّی (١٧٧٨ن) لەلایەن (J. Channing) چاپکرا، لە (پاریس) یش سالّی (١٧٦١ن) لەلایەن (L. Leclerc) وەرگێڕدرا و بلاوکرایەوە، هەروەها لە (لەکەنۆ)ی هیندستان سالّی (١٣٢٦ك) چاپکرا.

ئەم مەوسوعەیە تا ماوەی چەند سەدەیەك تەنها کتێبی نەشتەرگەری باوەڕپێکراو بوو لە هونەری نەشتەرگەری لە ئەورووپادا، ئامێرەکانی نەشتەرگەری لەم کتێبەدا زۆر بە ووردی باسکراون بە وێنەوە کە زۆر یارمەتی لێکۆلەرەوە رۆژئاواییەکانیدا بۆ دانانی بناغەکانی هونەری نەشتەرگەری.

هەروەها (الزهراوي) ئامێرێكی تازەی داهێنا بۆ چارەسەری ناسۆر، و زۆر نەخۆشیشی بە داخكردن چارەسەركرد وەك: خوێنبەربوون و بالووكە كە هەمان رێگە چارەكانی سەدەی بیستەمە! هەندێك لە بۆچوونە داهێنراوەكانی (الزهراوي) لە كتێبی (التصريف)دا ئەمانەن:

١- وەسف كردنی ئەو ئاوەی لە مێشكی منداڵاندا كۆدەبێتەوە لەگەڵ چارەسەرەكەی (Hydrocephaly)، كە ئەم نەخۆشییە زۆر نوێ زانستی پزیشكی چارەسەری بۆ دیاری كردووە.

٢- بەكارهێنانی قولاپ بۆ دەرهێنانی زیادە گۆشتەكانی ناو لووت.

٣- هەروەها باسی بڕینی گۆشتی زیادەی لێوی كردووە، و وەسفی پاكردنەوەی دانەكانی بە ئاسن كردووە.

٤- دانەكانی بە هێواشی و بەهێمنی دەرهێناوە، وەسفی ئەمە و وێنەی ئامێرەكان و دەرمانەكانی راگرتنی خوێنبەربوونی ئەوەندە بە ووردی كردووە كە مێژوونووسی ئەمریكی پزیشكی ددان (Absell) دەربارەی دەڵێت: یەكێك بووە لە پزیشكانی سەدەی بیست!!

٥- دەربارەی دەرهێنانی خرێكان و دەرهێنانی ئێسكە شكاوەكانی چەناگە لێكۆڵینەوەی كردووە، هەروەها دەرهێنانی ئەو ددانانەی كە لەسەر دانی تر یان لە غەیری شوێنی ئاسایی خۆیان دەرچوون.

٦- هەروەها دەربارەی دانانی شەبەكەی ئاڵتوون و زیو بۆ رێككردنەوەی دانەكان كاری كردووە، (Spencer) دەڵێت: زەهراوی یەكەم كەس بووە دەربارەی شێوازییەكانی شەویلگەكان و قەوسی ددانەكان قسەی كردووە.

٧- هەروەها چارەسەری ئەو لكێنەرەی كردووە كە لەژێر زمان دروستدەبێت و رێگری قسەكردن دەكات.

٨- وەسفی چۆنێتی دەرهێنانی ئاڵووەکان (لەوزەتەینی) کردووە.

٩- دەرهێنانی هەندێك وەرەم و شێوازی تری ناودەم.

١٠- هـــەروەك ووتمـــان وەســـفی کردنـــەوەی بـــۆری هـــەوا (Tracheostomy) کـردووە لەگـەڵ دوورینـەوەی برینـەکانی بـۆری هەوا.

١١- چارەسەرکردنی مەمك لەپیاواندا ئەگەر وەك ئافرەتانی لێبێت.

١٢- دەرهێنان و لابردنی شـێرپەنجەی مـەمك بەتـەواوی وەك لـەمڕۆدا دەکرێت، لەگەڵ ئەوەشدا کە داخکردنی بە باشتر زانیوە لە دەرهێنان. (زۆرێـك لـە بۆچـوونە پزیشـکییەکان لـەمڕۆدا و پـاش ١٠ سـەدە ئـەم ڕێگەیەیان پێباشە و بۆی گەڕاونەتەوە).

١٣- بـەکارهێنانی کـرداری نەشـتەرگەری بـۆ دەرهێنـانی بـەردەکانی میزەڵدان و ڕێڕەوەکانی میز.

١٤- لە بەشێکی تایبەتیدا باسی مامـانی و منـاڵبوون دەکـات، کـە لـە ڕاستیدا ئەم بەشەی کتێبەکـەی گەنجینەیـەکی بەنرخـە، تێیـدا وەسـفێکی تـــەواوی بارەکـــانی (Trendelenburg) و (Walcher) کـــراوە هـەروەها حـەملی دەرەوەی منداڵدان و چـۆنێتی دەرهێنـانی، و نووسـانی وویڵاش و چۆنێتی دەرهێنانی، هەروەها بەکارهێنانی قولاپ و ئـامێری تـر بۆ دەرهێنانی کۆرپەلەی مردوو.

١٥- بەشـێك دەربـارەی بەسـتنەوەی ریخۆڵـەکان بـە دوورینـەوە بـە تەلێکی باریکی وەرگیراو لە ریخۆڵەی ئاژەڵ، و چارەسەری ناسۆر.

١٦- بەشێك دەربـارەی بڕینـی پەنجـەی زیـادە و کردنـەوەی پێکـەوە بەسترانی پەنجەکان.

١٧- هەروەها وەسفی کرداری نەشتەرگەری لەسەر ئەژنۆ کردووە بەشێوەیەك کە پزیشکان پاش ٩٠٠ ساڵ (لە ١٩٣٧ەوە) هەمان کردار ئەنجام دەدەن.

١٨- هەروەها یەکەم کەس بووە کە نەخۆشی خوێن هیمۆفیلیا (Hemophilia)ی دۆزیوەتەوە و وەسفی کردووە و تێبینی ئەوەی کردووە کە بە بۆماوەیی لە مێینەوە بۆ نێرینە دەگوێزرێتەوە.

١٩- هەروەها یەکەم کەس بووە کە لوولەکانی خوێنی پێکەوە دووریوەتەوە وەك هالەر (Haller) دەڵێت.

کاریگەریی (زەهراوی) لەسەر رۆژئاوا زۆر گەورە بووە، نووسینەکان و کتێبەکانی وەرگێڕدران بۆ زۆرێك لە زمانەکان و لە کۆلیجەکانی پزیشکی ئەورووپادا دەخوێندران، نەشتەرکارە ئەورووپییەکان شوێنپێی ئەمیان هەڵگرت و ووتەکانی ئەمیان بەنموونە دەهێنایەوە.

تەنانەت هەندێك کات زۆر بێویژدانانە دۆزینەوەکانی ئەمیان دەدایە پاڵ خۆیان؟! نوسراوەکەی (التصریف) سەرچاوەیەکی بەرەپێنکراوی پزیشکانی ئەورووپا بوو لە سەرەتای سەدەی پانزەوە بۆ کۆتایی سەدەی هەژدە، (Haller) دەڵێت: کتێبەکانی (أبوالقاسم الزهراوي) سەرچاوەی هەموو نەشتەرکارەکان بوو کە لەدوای سەدەی چواردەوە دەرکەوتن.



**هەندێك لەو ئامێرە پزیشکییانەی نەشتەرگەری کە لە یەکێك لە کتێبەکانی زانا (الزهراوي)دا وەسفکراون**

(مـروان بـن عبـدالملك بـن زهـر)[133] یەکـەم کـەس بـووە کـە بـەردی گورچـیلەی دەرهێنـاوە، ئـەم زانایـە یەکێکـە لـە پزیشـکە موسـوڵمانە بەناوبانگەکان بـە تایبـەتی لـە نەشـتەرگەریدا، و بـەناوبانگترین کەسـە لـە بنەماڵەکەیدا کە زوربەیان پزیشك بوون، لە رۆژئـاوا بـە ( Abdomeron Avenzoar) ناسـراوە، یـەکێك بـووە لــە مــەزنترین پزیشـکەکانی سـەدەکانی ناوەڕاسـت و لـە مێـژووی پزیشـکیدا چـەندین تاقیکردنـەوە و تێبینی وورد دراوەتە پاڵی، لەوانـە وەسـفکردنی چـەندین جـۆری وەرەم و هـەر[illegible]ی پـەردەی دڵ کـە پێشـتر کـەس باسـی نـەکردبوون، ئەمانـە و چـەندین [illegible]تـری نـوێی لـە کتێبێکیـدا بـەناوی (التیسـیر فـی المـداواة والتدبیر) باس[illegible]ووە.

---

چەندین [illegible] مەبوون بەناوی (إبن زهر)ەوە: (إبن زهر)ی باووك (٥٢٥ك-١١٣١ز مـردووە)، پزیشکێکی بەناوبانگ بووە کە رەخنەی لە هەندێك بەشی کتێبی (القانون) گرتـووە، هـەروەها کوڕەکەی (مروان بن عبدالملك بن محمد بن زهر الإشبیلي) کە زۆر شارەزا بووە لە پزیشکیدا و لە شارەکانی (دانیە) و (ئیشبیلیە)ی ئەندەلوس ژیاوە (٤٨٤- ٥٥٧ك)، جێی متمانەی خەڵکی و حوکمڕانان بووە، هەروەها (أبوالعلاء زهر بن عبدالملك بن محمد بن مـروان بـن زهـر) کـە لـە سایەی دەوڵەتی (المـرابطین) لـە مـەراکیش ژیـاوە، زۆر بلیمـەت بـووە لـە چارەسـەرکردندا و چیرۆکی سەرسوڕهێنەر لەسەری دەگێڕنەوە لەو بوارەدا، خاوەنی کتێبەکانی (الأدویة المفردة) و (الإیضاح بشواهد الإفتضاح)ە کە تێیدا وەڵامی کارەکانی پزیشکێکی نەشارەزای داوەتەوە، هەروەها نووسینە پزیشکییە ئاڵۆزەکانی (رازي) و (إبن سینا)ی روونکردۆتەوە.
(أبو مروان عبد الملك بن أبي العلاء بن زهر)ی کوڕیشـی (١٠٩١- ١١٦٢ز) وەك بـاوکی شـارەزا بووە لـە پزیشـکیدا و ناوبـانگی دەرکـردووە لـە ئەندەلوسـدا، چـەندین کـاری ئەنجامـداوە لـە دەستنیشـان و چارەسـەری نەخۆشـییە جیاوازەکانـدا کـە نـاوازە بـووە و کـەس پـێش ئـەم ئەنجامی نەداوە، لە خزمەتی فەرمانڕەوایانی (الموحدین)دا بووە، هەروەها کوڕەکەی (أبـوبکر بن أبي مروان بن أبي العلاء بـن زهـر) (١١٩٨ز مـردووە) لـە (ئیشـبیلیە) ژیـاوە و پزیشـکێکی ناسراو بووە کە زانستی پزیشکی لە باوکی و باپیریەوە وەرگرتووە.

ئـەم كتێبـەی بـە هانـدانی (إبـن رشـد) نووسـیوە، لـە سـەدەكانی ناوەڕاستدا تەواو بڵاوبوویەوە، لە وەرگێڕانیدا بە كۆنترین كتـێبی پزیشـكی چاپكراو دادەنرێت كە یەكەمجار لە (ڤینیسیا) سـاڵی (١٤٩٠ز) و دواتـر لـە (لیـۆن) سـاڵی (١٥٣١ز) چـاپكراوە و چـاپەكانی بـەدوای یەكـدا دووبـارە دەكرانەوە.

دەتوانین بڵـێین كـە (ئـیبن زوهـر) مـەزنترین پزیشـكی كلینیكـی بـووە دوای (رازی)، گرنگترین كارەكانی بریتییـە لـە بـەكارهێنانی لێكۆڵینـەوە و تێبینـی زانسـتییانە لـە پزیشـكیدا، گـرنگترین خـاڵێكیش كـە كـرداری چاكبوونەوەی پێ راڤـە كـردووە بریتییـە لـە باسـكردنی توانـای لەش بـۆ چاكردنەوەی خۆی لە زۆرێك لە نەخۆشییەكان، (ئیبن زوهر) یەكـەم كـەس بـووە كـە پزیشـكی و نەشـتەرگەری و دەرمانسـازی پێكـەوە خوێنـدووە و كاری تێداكردووە.

پـێش ئـەم زانـا (الـرازي) یەكـەم كـەس بـووە كـە باسـی كاریگـەریی فاكتەری بۆماوەیی (وراثة)ی كردووە لە نەخۆشییەكاندا، و (رازی) یەكـەم كەس بووە دەستنیشانی نەخۆشی سوورێژە و ئاوڵـەی كـردووە و جیـای كردوونەتـەوە لـە بـارە سـەرەتاییەكانیاندا، لـە نووسـراوێكیدا كـە یەكـەم دانراوە زانیـاریی ووردی دەربـارەی ئـەم ٢ نەخۆشـییە و جیاكردنـەوەیانی لەخۆ گرتبێت، ساڵی (١٥٦٥ز) وەرگێـڕدرا بـۆ لاتینـی كـە پاشـان لەمـەوە وەرگێـڕدرا بـۆ چـەندین زمـانی دیكـە، وەرگێڕانـە ئینگلیزییەكـەی سـاڵی (١٨٤٧ز) بڵاوكرایەوە.

(رازی) یەكـەم كـەس بـووە باسـی تـاقی كردنـەوەی كـۆنترۆڵ كـراوی كردووە، كە ووتویەتی تاقیكردنەوە لەسەر نیـوەی نەخۆشـەكان بكرێـت و

نیوەکەی تر وازیان لێبێنین وەك گرووپێکی کۆنترۆڵ، و یەکەم کەس بووە تەلی نەشتەرگەری دۆزییەوە کە لە ڕیخۆڵەی ئاژەڵ دروستیکردووە.



**وێنەی لاپەڕەیەکی کتێبێکی موسوڵمانان لەبواری دەرمانزانیدا، کە زۆر دەرمانی گژوگیا و سروشتی هەبوون موسوڵمانان سوودە پزیشکییەکانیان دۆزییەوە، لەم کتێبەدا باسی سوودی هەندێك دەرمان و چۆنێتی دروستکردنیان دەکات کە لە دۆزینەوەی زانا موسوڵمانەکان بووە**

هەروەها (رازی) خاوەنی کتێبە پزیشکییەکانی: (الحاوي في الطب) و (الطب المنصوري) و (من لايحضره الطبيب) و (الفاخر في الطب) و (دفع مضار الأغذية) و (الطب الروحاني)یشە، ساڵی (١٣٩٥ز) کتێبی (الحاوي) یەکێك بوو لەو ٩ بەرگەی کە کتێبخانەی مامۆستایانی پزیشکی لە زانکۆی پاریس پێکهێنابوو، ئەم کتێبە دائیرەتولمەعاریفێکە بۆ خۆی کە لە ٢٠ بەرگ پێکهاتووە و بۆ یەکەمجار ساڵی (١٢٧٩ز) وەرگێڕدرا بۆ لاتینی لە صقلیە و ساڵی (١٤٨٦ز) چاپکرا و دواتریش چەندین جار چاپکرایەوە، هەموو کتێبەکانی (رازی) لە (ڤینیسیا) لە ساڵی (١٥٠٩ز) وەرگێڕدران و لە (پاریس)یش ساڵی (١٥٧٨ز)، بۆ دوایین جار ساڵی (١٧٤٥ز) بڵاوکرایەوە، تا کۆتایی سەدەی شانزەیەمی زایینیش کتێبەکانی ئەم زانایە لە ئەورووپا ڕۆڵێکی سەرەکییان هەبووە، ئەوەبوو لە ساڵی (١٥٣٧ز)دا یەکێك لە مامۆستایانی قوتابخانەی پزیشکی بەلجیکی لە

(لۆڤـان Lovan) هەسـتا بـە وەرگێڕانـی کتـێبی نۆیـەم لـە کتێبـەکانی (الرازي)، کە تا کۆتایی سەدەی حەڤدەیەمیش لە پرۆگرامەکانی خوێنـدنی پزیشکیدا مابوو.

ئەم دۆزینەوانە دراونەتە پاڵ (الرازی):

- بەکارهێنانی فتیلەی داخکردن.
- داهێنانی تەل و پەتەکانی دوورینەوەی نەشتەرگەری.
- دروستکردنی مەرهەمە جیوەییەکان.
- ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە لەسەر ترشی کبریتیك وکحول.
- دۆزینەوە ودەست نیشانکردنی چەند نەخۆشـییەکی مەترسـیدار لـە منالآندا و داهێنانی چارەسەری گونجاو بۆیان.
- هەڵدرینی میزەڵدان بۆ دەرهێنانی بەرد.
- هـەروەها لێکۆڵینـەوەی کـردووە بـە دوورینـەوەی ریخۆڵـەکان بـە نەشـتەرگەری بـە بـەکارهێنانی تـەلێکی بـاریکی وەرگـیراو لـە ریخۆڵـەی ئاژەلآن.
- هـەروەها نەشـتەرگەری بـۆ دەرهێنـانی کۆرپەلـەی زینـدوو لەسـکی دایکی مردوودا ئەنجامداوە.

(Rom Landau) دەڵێـت: لـە دیـارترین پزیشـکە موسـوڵمانەکان (الرازي)ە کە بە (Rhazes) ناسراوە لـە رۆژئـاوادا، نووسـەرانی مێـژووی پزیشـکی بـە یـەکێك لـە مـەزنترینی پزیشـکەکانی هـەموو سـەردەمەکانی دادەنێن، کە میراتێکی دەوڵەمەند و زۆری لـە دانراوەکـانی جێهـێڵاوە، کـە هەندێکیان لە چەند بـەرگێك پێکـدێن و بـۆ مـاوەی ١٠٠٠ سـاڵ رووناکییـان کزنەبووە.

دەربــارەی نەخۆشــییەکانی چــاو و چارەســەریان منــەتباری زانــا موسوڵمانەکانین، نوسـراوی (علـي بـن عيسـى) کـە ناوینـا (مـذکرة موجهـة لأطباء العيون) تا سەدەی نۆزدەیەم کاری پێدەکرا، یەکـەم نەشـتەرگەری بۆ ئاوی رەشی چاو (المحسَّن) سـاڵی (١٢٥٦ن) ئەنجامیـدا و هـەر ئـەمیش بـوو کـە دەرزی نـاوکون (نیـدڵ)ی داهێنـا، لـەو زانایانـەی کـە لـە بـواری نەخۆشـییەکانی چـاودا خزمـەتی گـەورەیان ئەنجامـدا (علـی البغـدادي) و (عمـار الموصـلي) بـوون، چـەندین دانـراوی زۆر باشـیان دانـا کـە باسـی ئەندامـەکانی چـاو و نەخۆشـییەکانیان و چارەسـەرەکانی دەکـات، ئـەم نووسینانە وەرگێڕدران بۆ لاتینی و بوون بە سەرچاوەیەك کە مامۆسـتایان و قوتابیـان پشـتیان پێدەبەسـت تـا ناوەڕاسـتی سـەدەی هەژدەیـەم، لـە هەمان ئەم بابەتەدا (إبن الهيثم)یش نامەیـەکی گرنگـی نووسـی دەربـارەی نەخۆشـییەکانی چـاو لەگـەڵ خزمەتـە گەورەکانیـدا لـەبواری (فیزیـا)دا، وەرگێڕانە لاتینییەکەی ئەم نامەیە تا ئەمڕۆش ماوە.

یەکــەم کــەس دەربــارەی زانســتی ژینگــە نووســیویەتی و باســی کاریگەریی ژینگەی لەسەر زیندەوەران کردووە (ابن خلدون) بووە.

(جـاحظ) یەکـەم کـەس بـووە کـە زانسـتی توێکـاریی بـەراوردکاریی (التشـريح المقـارن)ی دانـاوە، کـە دەچـوو سـکی ئـاژەڵانی هەڵـدەدڕی و بەراوردی دەکرد لەنێوان ئەنـدام و کۆئەندامەکانیانـدا، و بـە دامەزرێنـەری یەکەمی زانستی (زیندەوەرزانی ئەزموونکاریی) دادەنرێت، و یەکەم کـەس بووە کە لێکۆڵینەوەی لە ئاکار و هەڵس وکەوتی زیندەوەران کردووە.

هــەروەها موســوڵمانان پزیشــکی ڤیتێرنــەری (ئاژەڵی)یــان پشــتگوێ نەخستبوو، یەکێك لە گرنگترین ئەوانەی کـە پێـوەی خـەریکبوون (یعقـوب

بن أبي حزام) بوو (٩٠٢ن) كه پزیشكی ئاژەڵان یان بەیتەر (بیطار) بووە لە كۆشكی خەلیفەی عەبباسی (المعتضد)، كتێبێكی نووسیوە دەربارەی بەخێوكردنی ئەسپ بەناوی (الفروسیة وشیاه الخیل) كە زۆرێك لە بنەماكانی ڤێتێرنەری لەخۆگرتووە.

لە پزیشكە موسوڵمانە بەناوبانگەكان (إسحق بن عمران) بووە كە لە سەرووی ئەفریقا ژیاوە و خاوەنی كتێبەكانی (الأدویة المفردة) و (العنصر والتمام في الطب)ە، كە وەڵامی هەندێك كەسی نەشارەزای لە بواری پزیشكیدا داوەتەوە، خاوەنی داهێنان بووە لە نوسراوەكانیدا وەك (كتاب نزهة النفس) و (كتاب في المالنخولیا) لەسەر نەخۆشییە دەروونییەكان، و لە نەخۆشییە هەناوییەكاندا ئەم كتێبانەی نووسیوە: (كتاب في الفصد) و (كتاب في النبض) و (مقالة في علل القولنج وأنواعه وشرح أدویته) و (كتاب في البول).

هەروەها (أبوجعفر أحمد بن إبراهیم بن أبي خالد المعروف بابن الجزار) خەڵكی شاری (القیروان) بووە لە تونس، خۆی و باوكی و مامیشی پزیشك بوون، زانستی پزیشكی و زوربەی زانستەكانی سەردەمی خۆی وەرگرتووە، چەندین كتێبی پزیشكی گرنگی داناوە وەك (كتاب في علاج الأمراض) و (كتاب في الأدویة المفردة) و (كتاب في الأدویة المركبة) و گەورەترین كتێبی پزیشكی داناوە بەناوی (قوت المقیم) كە لە ٢٠ بەرگی گەورەدایە، هەروەها (رسالة في النفس) و (كتاب في المعدة وأمراضها ومداواتها)، و (كتاب طب الفقراء) و (رسالة في ابدال الأدویة) و (رسالة في الزكام وأسبابه وعلاجه) و (مجربات في الطب) و (مقالة في الجذام وأسبابه وعلاجه) و (كتاب المختبرات). بۆ یەكەم جار لە مێژوودا بەزانستیانە دەربارەی پزیشكی خۆپارێزی (الطب الوقائي أو طب المجتمع

(Preventive or Community Medicine) دواوه لـه کتێبـەکانی: (کتاب البلغة في حفظ الصحة) و (کتاب في نعت الأسباب المولدة للوباء في مصر وطريق الحيلة في ذلك وعلاج ما يتخوف منه).

له پزیشکه ناسراوەکانی تری ئیسلام (أبوالقاسم بن أبي صادق) که به (ئەبوقرات)ی دووەم ناسراوه و له سەدەی پێنجەمی کۆچیدا ژیاوه، ٢ کتێبی بەناوبانگی به عەرەبی نووسیوه به ناوەکانی: ١- شرح فصول أبوقراط. ٢- شرح مسائل الجنين.

هەروەها (ئەبولسەهل ئەلمەسیحی) له ساڵی (٤٠٣ك)دا مردووه و پزیشکی دەرباری عەبباسییەکان بووه و کتێبێکی نووسیوه بەناوی (المائة في الصناعة الطبية).

هەروەها (ئەبو سەعید عەبدوڵڵا) له ساڵی (٤٥٠ك)دا مردووه و له بەغدا ژیاوه، جگه له کاری پزیشکیی دەرمانیشی دروستکردووه، ئەمەش ناوی چەند کتێبێکی ئەم پزیشکەیه: ١- الروضة الطبيعية. ٢- لغة الحيوان ومنافعه. ٣- طبائع الحيوان وخواصه ومنافع أعضائه.

زۆر جار لەنێوان پزیشکه بەناوبانگەکانی دەوڵەتی ئیسلامدا گفتوگۆ و سیمینار سازدەکرا به مەبەستی موناقەشه کردنی زانیارییه پزیشکییەکان و راگۆڕینەوه، وەك ئەوەی که روویدا لەنێوان ٢ پزیشك لەسەدەی پێنجەمی کۆچیدا (١١ی زایینی) که (إبن رضوان و إبن بطلان) بوون.

(علی بن رضوان) (٤٦٠ك-١٠٦٨ز مردووه) سەرۆکی پزیشکانی میسر بووه له سەردەمی فەرمانڕەوای فاتیمی (المستنصر)دا، کتێبێکی نووسیوه دەربارەی (دفع مضار الأبدان بأرض مصر) بۆ وەڵامدانەوەی بۆچوونەکانی پزیشکی تونسی (إبن الجزار)، که مەقالەیەکی

سەرنجراکێشی تێدایە دەربارەی باری ئاووهەوا لە میسردا و پەیوەندی بە بابەتەکانی تەندروستی گشتی و هەندێك نەخۆشییەوە، بە تایبەتی نەخۆشی تاعون لەناو میسرییەکاندا، ئەم پزیشکە بە مونازەرە و گفتووگۆکەی لەگەڵ پزیشکی بەغدادی (إبن بطلان) بەناوبانگ بوو، کە سەبارەت بە هەندێك بابەتی فەلسەفی و بابەتی پزیشکی پەیوەندیدار بە ئاووهەواو وەرزەکان و کاریگەرییان لەسەر تەندروستی لەنێوانیاندا روویدا، هەروەها وویستیان ئەو راستییەیان بۆ دەرکەوێت کە ئایا ئەو دەرمانانەی کە لە بەغدا بەکاردێن بۆ نەخۆشی بەهەمان شێوە بۆ شاری قاهیرەش گونجاون یان نا؟.

## هەوڵەکانی موسوڵمانان لە پێشخستنی زانستی پزیشکی لە بۆچوونی ئینسایکلۆپیدیای بەریتانیدا

ئینسایکلۆپیدیای بەریتانی (Encyclopedia Britannica) یەکێکە لە گرنگترین سەرچاوەکانی زانیاریی لە جیهاندا، لە هەموو لایەکی جیهاندا وەك سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوی زانست و زانیاری لە هەموو بوارەکاندا وەردەگیرێت، دەربارەی مێژووی زانست و گەشەکردنی چەندین بابەتی مێژوویی بەسوودی تێدایە، کە لە زۆرێکیاندا وەك ئەمانەتێکی زانستی دانی بە هەوڵەکان و پێشدەستی موسوڵماناندا ناوە لە پێشخستنی زانستی پزیشکیدا لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆر کەم و کورتە لە باسەکەیدا، هەربۆیە بۆ دەرخستنی ئەم دانپێدانانەی ئەم سەرچاوە زانستییە هەرە گرنگە پێم باشبوو کە ئەو بەشەی تایبەتە بە هەوڵەکانی

موسوڵمانان له بواری پێشخستنی زانستی پزیشکیدا که له بەشی مێژووی زانستی پزیشکی (History of Medicine)دا هاتووه له ئینگلیزییەوه وەرگێڕم بۆ زمانی کوردی.

له سەرەتاوه بابەتەکه باسی پزیشکی کۆن و پەیدابوونی نەخۆشییەکان دەکات و راوبۆچوونه جیاوازەکان دەربارەی هۆکارەکانی نەخۆشی، دوایی دەچێته سەر زانستی پزیشکیی له مێژووی کۆنی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و میسردا، پاشان له هیند و چین و یابان، دوایی دێته سەر بابەتێکی تایبەتی بەناونیشانی رەگ و بنچینەکانی زانستی پزیشکی رۆژئاوایی نوێ (The roots of Western medicine) که تێیدا باسی ئەو هەوڵه زانستییانه کراوه که بوونه هۆی دامەزراندنی زانستی پزیشکی نوێ له رۆژئاوا، له هەوڵەکانی یۆنانییه کۆنەکان و رۆمانییەکانەوه دەستی پێکردووه، و پاشان چۆتەسەر رۆڵی گاورەکان و موسوڵمانان له کۆکردنەوه و وەرگرتنی ئەم زانسته و گواستنەوەی بۆ پاش خۆیان، دەڵێت:

گەورەترین خزمەتێك که له پێشتردا پێشکەشی زانستی پزیشکی کرابێت لەلایەن کڵێساوه بریتییه له پاراستن و وەرگێڕانی نووسراوه پزیشکییه یۆنانییەکان، که سەرەتا بۆ زمانی لاتینی وەرگێڕدران، و پاشان لەلایەن گاوره نەستوورییەکان (Nestorian Christian)ەوه (که کڵێسایەکی رۆژهەڵاتییه) قوتابخانەیەك بۆ وەرگێڕەکان پێکهێنرا بە مەبەستی وەرگێڕانی نووسین وکتێبه یۆنانیی وئیغریقییەکان بۆ زمانی عەرەبی.

بەناوبانگترین قوتابخانە و هەروەها نەخۆشخانەیەکی باشیش بووە بریتی بووە لە قوتابخانەی جندیسابور (Jundi Shāhpūr) کە کەوتۆتە خواروی رۆژئاوای وولاتی فارسەوە، کە لەوێ گەورەی پزیشکان جرجیس ئیبن بختیشوع (Jurjīs ibn Bukhtīshū) بووە، کە یەکەم بووە لە بنەماڵەیەکی وەرگێڕان و پزیشکان کە بۆ ٦ نەوە بەردەوام بوون، یەکێکی تر لە وەرگێڕە بەناوبانگەکان بریتی بووە لە حنین ابن إسحق (Hunayn ibn Isḥāq) کە ساڵی (٨٠٩ز) لەدایکبووە، وەرگێڕانەکانی وەك ووتوویانە بە کێشی خۆی ئاڵتوونی بۆ کردووە.

## زانستی پزیشکیی عەرەبی:

سەرچاوەیەك و عەمبارێکی تری فێربوون و زانستی پزیشکی لەو سەردەمانەدا بریتی بووە لە ئیمپراتۆریەتی مەزنی موسوڵمانان، کە لە ئیسپانیاوە تا فارس درێژبوو بووەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا کە عادەت وایە بووترێت پزیشکی عەرەبی بۆ باسکردنی ئەم سەردەمە، بەڵام هەموو پزیشکەکان عەرەب یان لە نەتەوە عەرەبییەکان نەبوون، و هەروەها هەمووشیان موسوڵمان نەبوون بەڵکو هەندێکیان گاور و جوولەکە بوون، بەڵام لەژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامی و لە هەموو پارچەکانییەوە پەیدابوون و دەرکەوتن.

یەکێك لە سەرەتاترین کەسایەتییەکان بریتی بوو لە الرازي (Rhazes)، کە بەرەچەڵەك فارسە و لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆیەمی زایینیدا لەدایك بووە لەنزیك (تاران)ی ئەمڕۆوە، کە کتێبێکی چەند بەرگی چارەسازیی لە زانستی پزیشکی پراکتیکیدا نووسیوە بەناوی (کتاب الحاوي[١٣٤] Kitāb al-hākī)، بەڵام بەناوبانگترین کاری لەرۆژئاوا

---

[١٣٤] لێرەدا بە هەڵە بۆ ئینگلیزی وەرگێڕدراوە و نووسراوە (کتاب الحاکي) کە دەستەواژە راستەکەی بریتییە لە (کتاب الحاوي).

بریتییە لە نووسینێك دەربارەی ئاوڵە و سوورێژە ( De variolis et morbillis) یان ( A Treatise on the Smallpox and Measles) کە تێیدا جیاوازی کردووە لەنێوان ئەم ٢ نەخۆشییەدا و توانیوێتی وەسفێکی ئاشکرای ئەم ٢ نەخۆشییە بکات.

لە کاتێکی دواتردا ئیبن سینا (Avicenna) (٩٨٠-١٠٣٧ن) کە هەر بە ڕەچەڵەك فارسە و پێیوتراوە ئەمیری پزیشکەکان، گۆڕەکەی لە (هەمەدان) بووە بە شوێنێکی گەشتیاری، توانیویەتی قورئان بخوێنێتەوە لە تەمەنی ١٠ ساڵاندا و لە تەمەنی ١٨ ساڵیدا بووە بە پزیشکی دیوانی کاربەدەستان (court physician)، سەرەکیترین کارە پزیشکییەکانی القانون في الطب (al-Qānūn fī aṭ-ṭibb) یان ( The Canon of Medicine) بووە، کە بووە کتێبێکی بنەڕەتی و لە زۆر قوتابخانەی پزیشکیدا وەك پرۆگرام بەکاردەهێنرا، وەك زانکۆی مونپیلییە (Montpellier) لە فەرەنسا کە تا (١٦٥٠ن) بەکاردەهێنرا، و تا ئێستاش لە ڕۆژهەڵاتدا هەر بەکاردەهێنرێت.

گەورەترین هاوبەشیی پزیشکیی عەرەبی لەبواری کیمیادا بووە و زانیاری دەربارەی چۆنێتی ئامادەکردنی دەرمانەکان، کیمیاییەکانی ئەو سەردەمە (خیمیایی) بوون و مەبەستی سەرەکییان بریتی بووە لە گەڕان بەدوای بەردی فەیلەسووفەکاندا (the philosopher's stone)، کە وا دانرابوو دەتوانێت کانزا ئاساییەکان بگۆڕێت بۆ ئاڵتون، لەگەڵ ئەمەشدا لە کاتی ئەنجامدانی تاقیکردنەوەکانیاندا ژمارەیەکی زۆر لە ماددەکان ناونران و خاسییەتەکانیان دەستنیشان کران، وهەندێکیان دۆزرانەوە کە نرخی پزیشکییان هەیە، زۆر دەرمان هەیە کە ئێستا بەکاردێن دۆزەرەوەکەی عەرەبەکان بوون، هەروەها زۆر میکانیزمی کیمیاییش بەهەمان شێوە ئەوان دۆزییانەوە وەك کەمکردنەوە و دڵۆپاندن (distillation and sublimation).

لــــەو كاتــــەدا و لەراســـتیدا بەدرێـــژایی ســــەردەمە مێژووییــــەكان نەشـــتەرگەری بـــە كـــەمتر دەزانـــرا لەچـــاو پزیشـــكیدا، و نەشـــتەركارەكان لەپلەیـــەكی نزمـــدا حیســـابیان بـــۆ دەكـــرا، نەشـــتەركاری بـــەناوبانگی ئەندەلوســـــی أبوالقاســــم الزهـــــراوي (Abū al-Qāsim) یــــان (Albucasis) لەگەڵ ئەمەشدا هەوڵی زۆریدا بۆ بەرز كردنـەوەی ئاسـتی نەشـتەرگەری لـە شـاری قورتوبـە، كـە سـەنتەرێكی گرنگـی بازرگـانی و رۆشـنبیری بـوو لەگـەڵ بـوونی نەخۆشـخانە و قوتابخانـەی پزیشـكی بـە هاوشانی شارەكانی بەغدا و قاهیرە، ئەم زانایـە نەشـتەركارێكی شـارەزا و وورد و بـــەئاگا و بەخـــەم بـــوو كـــە یەكـــەم نووســـینی نەشـــتەرگەریی روونكـراوەی نووسـی، كـە كاریگەرییـەكی گـەورە و فراوانـی هـەبوو لـە ئەورووپادا بۆ چەندین سەدە.

پزیشـكێكی تـری گـەورە لـە شـاری قورتوبـە كـە لـە سـەدەی ١٢دا لـەدایكبوو بریتـی بـوو لـە فەیلەسـووفی جوولەكـە: أبـوعمران موسـی بـن مـەیمون ( Abū Imran Mūsā ibn Maymūn ibn Ubayd Allāh) یـان (Maimonides)، كـە لـەو شـارە دەركـرا لەبەرئـەوەی نەبوو بە موسوڵمان (!!!) لە كۆتاییدا چوو بۆ شاری قـاهیرە كـە یاسـای ئەوێ نەرمتر و كراوەتر بوو، لەوێ توانی ناوبانگێكی زۆر گەورە بەدەسـت بێنێت كە ببێتە پزیشـكی تایبـەتی سـەركردەی موسـوڵمان صـلاح الـدینی ئەییوبی (Saladin)، هەندێك لە نووسینەكانی كە بە عیـبری نوسـرابوون وەرگێڕدران بۆ زمانی لاتینی و لەچاپدران.

پاشان لە ئینسـایكلۆپیدیاكەدا باسـی گواسـتنەوەی زانسـتی پزیشـكی موسوڵمانان بۆ ئـەورووپا كـراوە، بەتایبـەتی بـۆ قوتابخانـەی پزیشـكی لـە (سالێرنۆ)ی خوارووی ئیتاڵیا كە یەكەم قوتابخانەی پزیشكی یاسـایی بـوو لە ئـەورووپادا و لـە سـەردەمی گەشەسـەندنی پزیشـكی لای موسـوڵماناندا بنیـاتنرا، پاشـان بـەهۆی ئـەم كاریگەرییەشـەوە چـەندین قوتابخانـەی

پزیشکی تر بنیاتنران لە (مونپیلییە)ی فەرەنسا و (پۆلۆنیا و پادوا)ی ئیتاڵیا و لە بەریتانیاش.

هەرئەوەندەش بەسە کە دووبارە بڵێین هەرکەسێك کە لەمڕۆدا سەردانی کۆلیجی پزیشکی زانکۆی (پاریس) بکات وێنەی هەردوو زانای موسوڵمان (رازی) و (ئیبن سینا) دەبینێت کە یەکێك لە گەورەترین هۆڵەکانی ئەم زانکۆ بەناوبانگەی پێڕازێنراوەتەوە.

## دەقی ئینگلیزی ئەو بەشەی (مەوسوعەی بەریتانی) کە لەسەرەوە وەرگێڕدراوە:




medicine, history of
Encyclopaedia Britannica Library
Hellenistic and Roman medicine
In the following century the work of Aristotle, regarded as the first great biologist, was of inestimable value to medicine. A pupil of Plato at Athens and tutor to Alexander the Great, Aristotle studied the entire world of living things. He laid what can be identified as the foundations of comparative anatomy and embryology, and his views influenced scientific thinking for the next 2,000 years.
After the time of Aristotle, the centre of Greek culture shifted to Alexandria, where a famous medical school was established in about 300 BC. There, the two best medical teachers were Herophilus, whose treatise on anatomy may have been the first of its kind, and Erasistratus, regarded by some as the founder of physiology. Erasistratus noted the difference between sensory and motor nerves but thought that the nerves were hollow tubes containing fluid and that air entered the lungs and heart and was carried through the body in the arteries. Alexandria continued as a centre of medical teaching even after the Roman Empire had attained supremacy over the Greek world, and medical knowledge remained predominantly Greek.
Asclepiades of Bithynia (born 124 BC) differed from Hippocrates in that he denied the healing power of nature and insisted that disease should be treated safely, speedily, and agreeably. An opponent of the humoral theory, he drew upon the atomic theory of the 5th-century Greek philosopher Democritus in advocating a doctrine of strictum et laxum—the attribution of disease to the contracted or relaxed condition of the solid particles that he believed make up the body. To restore harmony among the particles and thus effect cures, Asclepiades used typically Greek remedies: massage, poultices, occasional tonics, fresh


medicine, history of
Encyclopaedia Britannica Library
Christian and Muslim reservoirs of learning
After the fall of Rome, learning was no longer held in high esteem, experiment was discouraged, and originality became a dangerous asset. During the early Middle Ages medicine passed into the widely diverse hands of the Christian Church and Arab scholars.
Translators and saints
It is sometimes stated that the early Christian Church had an adverse effect upon medical progress. Disease was regarded as a punishment for sin, and such chastening demanded only prayer and repentance. Moreover, the human body was held sacred and dissection was forbidden. But the infinite care and nursing bestowed upon the sick under Christian auspices must outweigh any intolerance shown toward medicine in the early days.
Perhaps the greatest service rendered to medicine by the church was the preservation and transcription of the classical Greek medical manuscripts. These were translated into Latin in many medieval monasteries, and the Nestorian Christians (an Eastern church) established a school of translators to render the Greek texts into Arabic. This famous school, and also a great hospital, were located at Jundi Shāhpūr in southwest Persia, where the chief physician was Jurjis ibn Bukhtishu, the first of a dynasty of translators and physicians that lasted for six generations. A later translator of great renown was Ḥunayn ibn Isḥāq, or Johannitius (born AD 809), whose translations were said to be worth their weight in gold.


medicine, history of
Encyclopaedia Britannica Library
About this time there appeared a number of saints whose names were associated with miraculous cures. Among the earliest of these were twin brothers, Cosmas and Damian, who suffered martyrdom (c. AD 303) and who became the patron saints of medicine. Other saints were invoked as powerful healers of certain diseases, such as St. Vitus for chorea (or St. Vitus' dance) and St. Anthony for erysipelas (or St. Anthony's fire). The cult of these saints was widespread in medieval times, and a later cult, that of St. Roch for plague, was widespread during the plague-ridden years of the 14th century.
Arabian medicine
A second reservoir of medical learning during these times was the great Muslim empire, which extended from Persia to Spain. Although it is customary to speak of Arabian medicine in describing this period, not all of the physicians were Arabs or natives of Arabia. Nor, indeed, were they all Muslims; some were Jews, some Christians, and they were drawn from all parts of the empire. One of the earliest figures was Rhazes, a Persian born in the last half of the 9th century near modern Tehrān, who wrote a voluminous treatise on medicine, Kitāb al-ḥāwī ("Comprehensive Book"), but whose most famous work, De variolis et morbillis (A Treatise on the Smallpox and Measles), distinguishes between these two diseases and gives a clear description of both.
Of later date was Avicenna (980–1037), also a Persian, who has been called the prince of physicians and whose tomb at Hamadan has become a place of pilgrimage. He could repeat the Qur'ān before he was 10 years old and at the age of 18 became court physician. His principal medical work, al-Qānūn fī aṭ-ṭibb (The Canon of Medicine), became a classic and was used at many medical schools—at


Encyclopaedia Britannica 2006 Ultimate Reference Suite DVD
SEARCH
medicine, history of
VIEW SEARCH RESULTS BY:
medicine, history of
medicine
science
The life of Aristotle (from Aristotle)
Bīrūnī, al-
technology
Three stages of development (from encyclopaedia)
disease
Imperial College of Science, Technology and Medicine
Utrecht, State University of
The rise of scientific medicine in the 19th century (from medicine, history of)
Lille I, II, and III, Universities of
Lisbon, University of
Avicenna
Iowa, University of
Washington, University of
Rochester, University of
medicine, history of
Encyclopaedia Britannica Library
Montpellier, Fr., as late as 1650—and reputedly is still used in the East.
The greatest contribution of Arabian medicine was in chemistry and in the knowledge and preparation of medicines. The chemists of that time were alchemists, and their pursuit was mainly a search for the philosopher's stone, which supposedly would turn common metals into gold. In the course of their experiments, however, numerous substances were named and characterized, and some were found to have medicinal value. Many drugs now in use are of Arab origin, as are such processes as distillation and sublimation.
At that period, and indeed throughout most historical times, surgery was considered inferior to medicine, and surgeons were held in low regard. The renowned Spanish surgeon Abū al-Qāsim (Albucasis), however, did much to raise the status of surgery in Córdoba, an important centre of commerce and culture with a hospital and medical school equal to those of Cairo and Baghdad. A careful and conservative practitioner, he wrote the first illustrated surgical text, which held wide influence in Europe for centuries.
Another great doctor of Córdoba, born in the 12th century, just as the sun of Arabian culture was setting, was the Jewish philosopher Maimonides. Banished from the city because he would not become a Muslim, he eventually went to Cairo, where the law was more lenient and where he acquired a reputation so high that he became physician to Saladin, the Saracen leader. (He was the original of El Hakim in Sir Walter Scott's Talisman.) A few of his works, written in Hebrew, were eventually translated into Latin and printed.
Medieval and Renaissance Europe

کۆتایی ئەم باسانەم بە وەرگێڕانی چەند بەشێك لە كتێبی (من روائع حضارتنا) دێنم کە لە نووسینی (د. مصطفى السباعي)یە، کە بریتین لە کۆمەڵێك ووتار لەسەر ناوازەیی و بێوێنەیی شارستانێتی ئیسلامی لە هەموو لایەنێکەوە، نووسەری کتێبەکەش کەسایەتییەکی ئیسلامی ناسراوە.

پێش زیاتر لە ٢٠ ساڵ بۆ یەکەمجار بەم کتێبە ئاشنابووم و خوێندمەوە، کە ئەو نموونانەی باسی کردوون سارسامی کردم و گەیشتمە باوەڕی تەواو بەوەی لە سایەی جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خودا و شوێنکەوتنی راستەقینەی پەیامی پیرۆزی ئیسلامدا مرۆڤایەتی دەتوانێت بگاتە لوتکە و چڵەپۆپەی هەموو ئەو سیستمانەی کە دەبنە مایەی بەختەوەر کردنی مرۆڤەکان و باشترکردنی ژیانیان لە هەموو لایەنەکانەوە، لەگەڵ رەچاو کردنی شێوازی مرۆییانە و بە بەزەییانە و میهرەبانانە لە هەڵس وکەوت لەگەڵ ئادەمیزادەکاندا.

لە راستیدا شارستانێتی ئیسلامی بەری جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خودا و بەرپاکردنی شەریعەتی ئیسلامی بووە لە دەوڵەتی ئیسلامیدا، و تا دونیاش بمێنێت هەموو مرۆڤایەتی قەرزاری ئەوانن لە زۆر لایەنی شارستانییەتدا، و بە تایبەتی پێشدەستییان لە بواری پێشخستنی زانست و مەعریفەدا کە کەس ناتوانێت نکوڵی لێبکات.

بە ڕاستی (د. مصطفى السباعي) خۆی زۆر جوانتر وبابەتیانە وسەرنجراکێشانەتر لەسەر بابەتەکە رۆییوە و پێم باشە ووتەکانی خۆیتان بۆ نەقڵ بکەم، دەڵێت:

لەم کتێبەدا باسی لایەنە ناوازەکانی شارستانێتی خۆمانم کردووە (شارستانێتی ئیسلامی)، کە تا ئێستاش کەسانی بەوویژدان و سەرڕاست سەرسام دەکات، هەموو لایەنەکانی ناوازەیی و بێوێنەیی شارستانییەتمانم باس نەکردووە، بەڵکو چەند نموونەیەکم بۆ گیانە مرۆیی و پۆزەتیڤەکەی شارستانییەتمانم لە مێژوودا خستۆتەروو، کە کەسانێك بەرپاکەر و هەڵگری بوون کە لەسەر ئاستێکی بەرزبوون لە باوەڕبوون بەخودا و شوێنکەوتەیی هەق و راستیی و بەرزیی دەروون و رۆشنایی روح و جوانی رەووشت و بەزەیی لەگەڵ خەڵکدا و دادپەروەریی لە حوکمدا، ئەمە لەگەڵ بەشداریی ناوازەیان لە کرۆکی شارستانییەتدا، جا ئەگەر پاشا و کاربەدەست یان زانا یان فەیلەسوف یان بازرگان یان خواپەرست یان پیاو یان ئافرەت یان پیر یان گەنج یان هەژار یان دەوڵەمەند بووبن، ئەمانە چەند نموونەیەکی کامڵیی مرۆڤەکان بوون کە لە خەیاڵی فەیلەسوف و حەکیمەکاندا نەبوون بەڵکو لەسەر زەوی و لەناو خەڵکی سەر زەویدا ژیان.

ئەم رۆحە پۆزەتیڤانەیە بە نموونە ناوازەکانییەوە تاکبووە لە شارستانێتی ئێمەدا کە جیای کردۆتەوە لە هەموو شارستانییەتەکانی تر لە کۆن و نوێدا، لە مێژوودا خەڵکانی رۆحی زۆر بوون لە نەتەوەکانی رۆژهەڵات و رۆژئاوادا کە زوربەیان بەشێوەیەکی نێگەتیڤانە ژیاون لەگەڵ شارستانییەتدا و خۆیان بە بەرزتر داناوە لەوەی تێیدا بەشداربن و تەنیا لە خەڵوەتگا و پەرستگاکان و لوتکەی شاخەکان و دەشت و ئەشکەوتەکاندا ژیانیان بەسەربردووە، بەڵام نموونە رۆحییەکانی ئێمە لە مێژووی شارستانییەتماندا ئەو کەسانە بوون کە جەنگی بنیاتنانی ژیانیان

بەرپاکردووە بە هەموو پێویستییەکانییەوە لە کارکردن و رەنجدان و قوربانیدان و فیداکاری، کە ئەمە نهێنی ناوازەیی و بێوێنەیی نموونە رۆحییە سەرسوڕهێنەرەکانی ئێمەیە لە مێژووی شارستانییەتەکاندا.

مەبەست لە بڵاوکردنەوەی ئەم باسانە ئەوەیە کە سەرنج رابکێشین بۆ ئەم نموونانە وەك بەڵگەیەك لەسەر ئەوەی کە لە توانامانداییە شارستانییەتێکی تەواوتر و بەرزتر پێکبێنین، و نەوەی نوێی ئوممەتەکەمان یاد بخەینەوە بەو ئەرکەی لەسەر شانیانە بۆ دروستکردنی شارستانییەتێکی مرۆییانەی بەرێز وەك چۆن باوباپیرانیان بەو کارە هەستان، مەبەستیشمان لە هێنانەوەی ئەم نموونانە ئەوە نییە کە بڵێین شارستانێتی ئێمە هیچ جۆرە نوقسانی و هەڵەیەکی نییە و هەمووی جوان و پرشنگدارە، بەڵکو مەبەست چەسپاندنی لایەنە مرۆییە زیندووەکانە و دەرخستنی ئەو ڕاستییەیە کە ئەم لایەنانە زۆر زۆرترن لە نوقسانییەکان، و وەڵام دانەوەی ئەو کەسانەیە کە هەمووی بە نوقسانی دەدەنە قەڵەم و بە دەستی ئەنقەست لە لیستی شارستانییەتە بنەڕەتەکان دەیکەنە دەرەوە.

## جیاکەرەوەکانی شارستانییەتمان:

زۆرترین شتێك کە سەرنجی لێکۆڵەرەوان دەربارەی شارستانێتی ئیسلامی رادەکێشێت ئەوەیە کە خاوەنی ئەم سیفات و جیاکەرەوانەیە:

١- لەسەر بنەمای وەحدانییەت و تاك و تەنهایی خودا لە بیروباوەڕدا دامەزراوە: کە یەکەم شارستانییەتێکە بانگەواز دەکات بۆ پەرستنی خودایەکی تاك و تەنها کە هاوەڵی نییە لە دەسەڵات و حوکمیدا، ئەم

سیفەتە رۆڵێکی گەورەی هەیە لە بەرز کردنەوەی ئاستی مرۆڤەکان و رزگار کردنی جەماوەر لە سنوور دەرچوونی کاربەدەستان و راستکردنەوەی پەیوەندی نێوان حوکمڕانەکان و حوکمکراوەکاندا، ئەم سیفەتە کاریگەرییەکی بێوێنەی هەبوو لە خاڵی بوونی شارستانییەتمان لە هەموو شوێنەوارەکانی هاوەڵدانان و بتپەرستی لە ئەدەب و فەلسەفەکانیدا لە بیرەباوەڕ و هەڵس وکەوتدا، ئەمەش هۆکاری سەرەکی وەرنەگێڕانی (ئیلیاذە) وکارەکانی ئەدەبی یۆنانی بوو، و کەمیی کارەکان بوو لەبواری هونەرەکانی وێنەکێشان و پەیکەرتاشی و هەڵکەندندا لە مێژووی ئیسلامدا، چونکە ئیسلام جەنگی بەرپاکرد لەگەڵ بتپەرستی و رێخۆشکەرەکانیدا ورێینەدا کە شوێنەوارەکانی لە شارستانییەتەکەیدا دەربکەوێت، کە پەیکەرەکان سیفەتێکی دیاری شارستانییەتەکانی ترە لە کۆن و نوێدا چونکە هیچ کامێکیان نەگەیشتنە ئاستی شارستانییەتی ئیسلامی لە بیروباوەڕی یەکتاپەرستیدا.

ئەم تاك و تەنهاییە لە بیروباوەڕدا هەموو سیستم و یاساکانی شارستانێتی ئیسلامی رەنگکردووە و یەکیخستوون.

ئەوەتا یەکێتی هەیە لە پەیامەکەدا و لە یاسادانانەدا، و یەکێتی هەیە لە ئامانجە گشتییەکان و لە کیانی مرۆییانەی گشتیدا، و یەکێتی هەیە لە هۆکارەکانی ژیان و شێوازی بیرکردنەوەدا، تەنانەت لێکۆڵەرەوانی هونەرە ئیسلامییەکان ئەم یەکێتییەیان لە شێواز و زەوقدا بۆ دەرکەوتووە لە هەموو جۆرەکانیدا، بۆ نموونە پارچەیەك لە عاجی ئەندەلوسی نەخشێنراو و پارچەیەکی تر لە چنراوەکانی میسر و سێیەمیش لە سیرامیکی شام و چوارەمیش لە کانزا ئێرانییەکان هەموویان لەگەڵ

ڕەنگاوڕەنگی شکڵ و ڕازاندنەوەیاندا یەك شێواز و یەك مۆرکیان پێوە دیارە.

٢- دووەم سیفەتی ئەوەبووە کە شارستانییەتێکی مرۆییانە بووە لە پاڵنەر و ئامانجەکانیدا، جیهانگیر بووە لە ئاسۆ و پەیامەکەیدا، ئەوەتا قورئانی پیرۆزە کە یەکێتی جۆری مرۆیی دیاریکردووە لەگەڵ جیاوازی لە ڕەگ و ڕەچەڵەك و نیشتمانەکانیاندا کە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ (الحجرات:١٣)، واتە: ئەی خەڵکینە بێگومان ئێمە هەمووتانمان لە نێر و مێیەك دروستکردووە (کە باوکە ئادەم و دایکە حەوایە)، و کردوومانن بە چەندەها گەل و تیرە و هۆزی جۆربەجۆر، تا یەکتر بناسن و پەیوەندیتان خۆش بێت بەیەکەوە، بەڕاستی بەڕێزترینتان لای خودا ئەو کەسانەتانە کە زۆرتر لەخوا ترسە و فەرمانبەرداری خودایە، بێگومان خوا زانا و ئاگایە بەهەمووان.

کاتێك کە قورئان ئەم یەکێتییە مرۆییە جیهانییەی ڕاگەیاندووە لەسەر ئاستی حەق و خێر و کەرامەتدا وای لە شارستانییەتەکەی کردووە کە وەك پەتی تەزبێحێك وابێت کە بلیمەتەکانی هەموو گەل و نەتەوەکانی کە ئاڵای فتوحاتی ئیسلامی پێیان گەیی تێیدا کۆببنەوە، هەربۆیە شارستانییەتێکە کە شانازی بە ڕۆڵە بلیمەتەکانییەوە دەکات لە هەموو میللەت و نەتەوەکان کە تەختی شارستانییەتەکەیان دامەزراند، ئەمە بە پێچەوانەی شارستانییەتەکانی ترەوەیە کە تەنها شانازی بە هەڵکەوتووەکانی دەکات کە لە نەوەی یەك ڕەگەز و یەك نەتەوەن، بۆ نموونە: ئەبوحەنیفە و مالیك و شافیعی و ئەحمەد و خەلیل بن ئەحمەد و

سـيبەوەيە و كينـدی و غـەزالی و فـارابی و ئـيبن روشـد و خـەواريزمی و هاوشـێوەی ئـەمان كـە جيـاوازن لـە ڕەچـەڵەك و نيشـتمانيان {كـە لـە نەتەوەكانی: تورك و فارس و (كورد) و عەرەب بوون}، ئەمانە ئەو كەسـە هەڵكـەوتوو و بليمەتانـە بـوون كـە شارسـانێتی ئيسـلامی بەهۆيانـەوە ناوازەترين ئاكامی بيری مرۆيی راست و دروستی پێشكەش كرد.

٣- سێيەم جياكەرەوەی ئەوەبووە كە جێگەی بنەما رەووشـتييەكانی خستۆتە پێشی پێشەوە لە هەموو ياساكانی و بوارەكانی چالاكييەكانيدا، و هـەرگيز وازی لـەم بنەمايانـە نـەهێناوە و نـەيكردوون بـە هۆكارێـك بـۆ سوودمەندی دەوڵەتێك يان كۆمەڵێك يان چەند تاكێك، جا لـە بوارەكـانی حوكمڕانيدا بووبێت، يان لەبوارەكانی تری زانستی و ياسـادانانددا بووبێـت، لـە جـەنگ يـان لـە ئاشـتيدا، لـە ئـابووری و خێزانيشـدا، ئـەم بنـەما رەووشتييانە گەيشتنە ئاستێكی بەرز كە لە هـيچ شارسـتانييەتێكی تـری كۆن و نوێدا نەگەيشتنە ئەو ئاستە، شارستانييەتی ئيسلامی لـەم بـوارەدا چـەند شـوێنەوارێكی بەجێهێشـتووە كـە مايـەی سەرسامی و رێزلێنانـە و دەيكاتـە تاكـە شارسـتانييەتێك كـە تـوانيبێتی بەختـەوەری مرۆڤايـەتی، بەختەوەرييەكی پوختی بێخلّتە دابين بكات بۆ كۆمەڵ وتاكەكانی.

٤- چوارەميان ئەوەيە كـە بـاوەڕی بـە زانسـت هـەبووە لـە راسـترين بنچـينەكانيدا، و لەسـەر بنـەمای عەقيـدەش دامـەزراوە لـە پـاكترين بنەماكانيدا، ژيريی و دڵی پێكەوە دواندووە و سـۆز و بـيری لەيـەك كاتـدا ورووژاندووە، كە ئەمـە سـيفەتێكە هـيچ شارسـتانييەتێكی تـر لـە مێـژوودا تێيدا هاوشانی نـەبووە، هـۆی نـاوازەيی ئـەم سـيفەتەی شارسـتانييەتمان ئەوەيە كە توانيويەتی ياسايەك بۆ دەوڵەت دابنێـت كـە لەسـەر بنـەماكانی

حەق و دادپەروەری دامەزراوە، پشتیشی بە ئاین و بیروباوەڕ بەستووە بەبێ ئەوەی کە هیچ کۆسپێك لەبەردەم پێشکەوتنی دەوڵەت و بەرز بوونی شارستانییەتدا دروست بکات، بەڵکو ئاین یەکێك بووە لە بەهێزترین فاکتەرەکانی پێشکەوتنی، چونکە لە چوارچێوەی دیواری مزگەوتەکانی بەغدا و دیمەشق و قاهیرە و قورتوبە و غەرناتەوە بوو کە تیشك و پرشنگەکانی زانست بۆ هەموو شوێنێکی دونیا چوون.

شارستانییەتی ئیسلامی تاکە شارستانییەت بووە کە تێیدا دین لە دەوڵەت جیانەکرایەوە و رزگاریشی بوو لە هەموو ئەو نەهامەتییانەی کە تێکەڵ کردنی ئاین و دەوڵەت لە ئەورووپادا بەرپای کرد لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، سەرۆکی دەوڵەت لەهەمان کاتدا خەلیفە و پێشەوای ئاینی موسوڵمانانیش بووە بەڵام حوکم لای ئەو تەنها بۆ حەق بووە و یاسادانانیش تەنها تایبەت بووە بە پسپۆڕەکانییەوە، هەموو کۆمەڵێك لە زانایان پسپۆڕی تایبەتی خۆیان هەبووە و هەمووان لەبەردەم یاسادا یەکسان بوون، و پلەبەرزی تەنها بە تەقوا و پارێزکاری و کردەوەی چاك و خزمەت کردنی خەڵك بووە.

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ﴿وَالله لَو أنَّ فَاطمـة بِنـت محمـد سَرَقَتْ لَقَطَعتُ يَدَها﴾ (رواه البخاري ومسلم)، واتە: سوێند بەخوا ئەگەر فاتیمەی کچی موحەممەدیش دزی بکات وەك هەموو کەسێکی تر دەستی دەبڕم لە سزادا، هەروەها: ﴿الخَلْقُ كلُّهُم عيال الله فَأَحَبُّهُم إلَيه أنْفَعُهُم لعِيالـه﴾ (رواه البزار)، واتە: هەموو خەڵکی دروستکراو و پەروەردەی خودان خۆشەویستترینیان لەلای خودا ئەوەیە کە چاکترین کەسە لەگەڵ دروستکراوەکانیدا.

ئەمە ئەو ئاینەیە کە شارستانێتی ئێمەی لەسەر دامەزراوە کە تایبەتمەندی تێدانییە بۆ سەرۆکێك یان زانایەکی ئاینی یان بنەماڵەدار یان دەوڵەمەندێك، تەنانەت پێغەمبەر (ﷺ) خۆیشی هەر مرۆڤێکی ئاساییە: ﴿قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاء رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا﴾ (الكهف:١١٠)، واتە: (ئەی پێغەمبەر ﷺ) پێیان بڵێ: بەڕاستی من تەنها ئادەمیزادێکم وەك ئێوە بەڵام ئەوەندە هەیە کە وەحی و نیگام بۆ دێت (کە ئەم ڕاستییەتان تێبگەیەنم)، کە بێگومان خوای ئێوە خوایەکی تاك و تەنهایە، جا ئەوەی دەیەوێت بەدیداری پەروەردگاری شاد ببێت، با بە خۆشنوودییەوە کار و کردەوەی چاك و دروست ئەنجام بدات و بەهیچ شێوەیەك لە پەرستنیدا هیچ کەسێك نەکاتە هاوەڵ و شەریك بۆی.

٥- کۆتایین سیفەتی شارستانییەتەکەمان کە باسی بکەین ئەو لێبوردەیی و سنگفراوانییە سەرسوڕهێنەرە بوو کە هیچ شارستانییەتێکی تر نەیناسیوە کە لەسەر بنەمای ئاین دامەزرابێت.

لەوانەیە لامان ئاسایی بێت کە کەسێك باوەڕی بە ئاین نەبێت هەموو ئاینەکان بە یەك چاو تەماشا بکات و هەڵس وکەوت وەك یەك لەگەڵ شوێنکەوتووەکانیاندا بکات، بەڵام ئەگەر یەکێك هەڵگری بیروباوەڕێکی تایبەتی بێت و باوەڕی وابێت کە ئاینەکەی ئەو ڕاستە و بیروباوەڕەکەی ڕاسترینە، و بشتوانێت کە جەنگ بکات و سەرکەوێت و شارەکان بگرێت و فەرمانڕەوایی و حاکمی بکات، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا باوەڕی تەواوی بەڕاستی ئاینەکەی وای لێنەکات کە زوڵم و ستەم بکات و لە سوننەتەکانی دادپەروەری لانەدات، و زۆریش لە کەس نەکات کە شوێن

ئاینەکەی ئەو کەون و بەیەك چاو تەماشای هەمووان بکات، بەڕاستی ئەمە کەسێکی سەیرە کە لە مێژوودا بوونی هەبووبێت!

ئەی ئەگەر چۆنە کە شارستانییەتێك وەك شارستانییەتی ئیسلامی لە مێژوودا لەسەر بنەمای ئاین دامەزرا بێت و یاساکانی لەوەوە وەرگرتبێت، بەلاّم لەگەڵ ئەمەشدا لە هەموو مێژوودا بە هاوشێوەی ئەم هیچ شارستانییەتێکی تر دادپەروەری و بەزەیی و مامەڵەی مرۆییانەی بەرپا نەکردبێت!! بەڕاستی ئەمەیان سەرسوڕهێنەرە و سەرنج ڕاکێشە! ئەمەبوو کە شارستانێتی ئێمە بەرپای کرد، و تەنها ئەوەندە بەسە کە بڵێین شارستانێتی ئێمە لەمێژوودا بەوە تاکە کە یەك ئاین بەرپای کرد بەلاّم بۆ شوێنکەوتووانی هەموو ئاینەکانی تریش بووە وەك یەك!.

## شوێنەوارەکانی شارستانێتی ئێمە لە مێژوودا:

پێشتر باسی ئەوەمان کرد کە بە ئەندازەی ئەو شوێنەوارە فیکری و ڕەووشتی و ماددییانەی کە شارستانییەتەکان پاش خۆیان جێیدێڵن ئەوەندە زیندوو و نەمر دەبن لەمێژوودا، شارستانێتی ئێمەش ڕۆڵێکی هەرە گەورەی بینیوە لە پێشکەوتنی مرۆڤایەتیدا، و لەبوارەکانی عەقیدە و زانست و حوکم و فەلسەفە و ئەدەب و هەونەر و غەیری ئەمانەشدا چەندین شوێنەواری نەمری جێهێشتووە کە کاریگەریی دوور و بەهێزیان هەبووە لەوەی کە ئێستا شارستانێتی نوێ پێی گەیشتووە،، دەتوانین لە ٥ بواری سەرەکیدا ئەو شوێنەوارانە کۆبکەینەوە:

١- لەبواری عەقیدە و دیندا: بنەماکانی شارستانێتی ئیسلامی کاریگەرییەکی گەورەیان هەبوو لەسەر بزوتنەوە ئاینییە چاکخوازەکان

(ریفۆرمخوازەکان) لە ئەورووپادا، هەر لە سەدەی حەوتەمی زایینییەوە تا سەردەمی راپەڕین و گەشەکردنی ئەورووپا، ئیسلام کە تاك و تەنهایی پەروەردگاری راگەیاند لە دەسەلات و بێگەردیی لە هەموو نوقسانییەك، و هەروەها سەربەخۆیی مرۆڤەکانی راگەیاند لە پەرستنی خوا و پەیوەندییان پێیەوە بەبێ نێوانگیریی پیاوانی ئاین، فاکتەرێکی سەرەکی بوو بۆ کرانەوەی بیری میللەتانی تر بۆ ئەم بۆچوونە بەهێز و ناوازانە، میللەتانی ئەو سەردەمە گیرۆدەی دەستی جیاوازییە مەزهەبییە خوێناوییەکان و دەسەلاتی پیاوانی ئاین بوون بەسەر بیروبۆچوون و مال و پارە و لاشەیانەوە.

زۆر ئاساییە ئەو میللەتانەی کە هاوسێی فتوحاتی ئیسلامی بوون لە رۆژهەلات و رۆژئاوادا کە کاریگەر ببن بە بنەما عەقیدەییەکانیان پێش هەموو شتێکی تر، ئەمەش بە فیعلی روویدا چونکە لە سەدەی حەوتەمی زایینییەوە زۆرێك لە رۆژئاواییەکان پەیدابوون کە ئینکاری پەرستنی وێنەکان و بوونی نێوەند لەنێوان خودا و بەندەکانیدا دەکرد، و داوای سەربەخۆییان دەکرد لە تێگەیشتنی کتێبە پیرۆزەکاندا دوور لە دەسەلاتی پیاوانی ئاین و چاودێرییان.

زۆرێك لە لێکۆلەرەوان لەگەل ئەو رایەدان کە (لوثر) لە جوولانەوە ریفۆرمخوازەکەیدا لەژێر کاریگەریی خوێندنەوەی کتێبەکانی فەیلەسوف و زانا موسولمانەکاندا بووە لە بۆچوونەکانیاندا دەربارەی ئاین و عەقیدە و وەحیدا، زۆرێك لە زانکۆکانی سەردەمی ئەویش پشتیان دەبەست بە نووسینەکانی فەیلەسوفە موسولمانەکان کە وەرگێڕدران بۆ زمانی لاتینی هەر لە سەردەمێکی کۆنەوە.

٢- لەبوارەكانی فەلسەفە و زانستدا: لە لقەكانی وەك پزیشكی و بیركاری و كیمیا و جوگرافیا و فەلەكدا ئەوروپا لەسەر بانگی زانایانمان خەبەری بووەوە كە خەریكی ووتنەوەی ئەم زانستانە بوون لە مزگەوتەكانی (ئیشبیلیە و قورتوبە و غەرناتە)دا، رابەرە یەكەمەكانی زانست لە رۆژئاوادا كاتێك دەهاتن بۆ قوتابخانەكانی ئێمە زۆر سەرسام دەبوون و بەشەوقەوە گوێیان لەم زانستانە دەگرت لە دەوروبەرێكی سەربەستدا كە وێنەی نەبوو لە وولاتەكانی خۆیاندا، لەو كاتەدا كە زانایانی ئێمە لە كۆڕە زانستییەكانیاندا باسی سووڕانەوەی زوی و خڕێتییان دەكرد و دەربارەی جوولەی تەنە ئاسمانییەكان دانراویان دەنووسی عەقڵییەتی ئەوروپا پڕ بوو لە ئەفسانە و خورافە لەسەر ئەم راستییانە، پاشان بزوتنەوەی وەرگێڕان لە عەرەبییەوە بۆ لاتینی لای رۆژئاواییەكان دەستی پێكرد و كتێبەكانی زانایانی ئێمە لە زانكۆكانی ئەوروپادا دەخوێنرا، كتێبی (القانون) لە زانستی پزیشكیدا و دانراوی (ئیبن سینا) لە سەدەی دوانزەدا وەرگێڕدرا، هەروەها كتێبی (الحاوي) دانراوی (رازی) كە لەو گەورەتر و فراوانترە لە كۆتایی سەدەی سیانزەدا وەرگێڕدرا، ئەم دوو كتێبە بربڕەی پشتی خوێندنی پزیشكی بوون لە زانكۆ ئەورووپییەكاندا تا سەدەی شانزەیەمی زایینی.

بەڵام كتێبەكانی فەلسەفە زۆر لەوە زیاتر مانەوە، رۆژئاوا فەلسەفەی یۆنانی كۆنی تەنها لەرێی كتێبەكان و شیكارەكانی زانایانی ئێمەوە ناسیوە، هەر لێرەوە كەسانی بەوویژدانی رۆژئاوا دان بەوەدا دەنێن كە ئێمە لە سەدەكانی ناوەڕاستدا مامۆستای ئەوروپا بووین بۆ ماوەیەك كە لە ٦ سەدە كەمتر نەبوو، رۆژهەڵاتناس (سیدیو) دەڵێت: {عەرەبەكان

نێودەوڵەتییەکاندا مرۆیی و بەزەیی خۆیان باس دەکەن لەکاتێکدا کە لە جەنگەکانیان و موستەعمەراتەکانیان و ئەو وولاتانەی کە لەژێردەستیاندا بووە بە ئاشکرا دڕندەیی و وەحشیگەریی خۆیان دەرخستووە، ئەگەر یەکێکیش بیانووبێنێتەوە بۆ کارە ئابڕوبەرەکانی ڕۆژئاواییەکان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بەوەی کە گەلێك بوون هێشتا شارستانێتی و مەدەنییەت ڕەووشتی دانەدابوون، ئەی لەمڕۆدا بیانوویان چییە؟ کە خۆیان بە رابەر و سەرمەشقی شارستانییەت و مامۆستای دونیا لە زانستەکان و داهێنراوەکان و هونەرەکاندا دەزانن؟! ئەم مەسەلەیە بەڕای ئێمە بریتیە لە خوویەکی خۆڕسك تیایاندا، نموونەی ئێمە و ئەوانیش وەك ووتەکانی ئەم شاعیرە وایە:

ملكنا فكان العفو منا سجية    فلما ملكتم سال بالدم أبطح
وما عجب هذا التفاوت بيننا    فكل إنـاء بالذي فيه ينضـح

## بەزەیی هاتنەوە بە گیانداراندا:

بریتییە لە بابەتێکی خۆش لە باسماندا دەربارەی شارستانێتی ئیسلامی، مرۆڤایەتی تا سەردەمی نوێش باوەڕیان وابوو کە ئاژەڵان بەشیان نییە لە بەزەیی، و تا ئەمڕۆش زۆرێك لە میللەتان لەزەت دەبینن لە کوشتنی ئاژەڵاندا و بە وەرزشی دادەنێن، لێرەدا شارستانێتی ئێمە دەردەکەوێت بە بنەماکانی و واقیعەکەشی کە بەرگێکی بەزەیی پۆشیوە و خاوەنی هەستێکی مرۆییانەی نەرمە کە هیچ شارستانییەتێکی تر نەیبووە لە کۆن و نوێشدا تا ڕۆژگاری ئەمڕۆمان، بەزەییەك کە سەرنج ڕاکێشە و مایەی سەرسوڕمانە.

یەکەم شتێك کە شارستانێتی ئێمە رایدەگەیەنێت لەبواری بەزەیی هاتنەوە بە گیانداراندا ئەوەیە کە ئاشکرای دەکات کە جیهانی ئاژەڵان وەك جیهانی مرۆڤەکان خاسییەت و تەبیعەت و رێکخستنی تایبەتی خۆیان هەیە: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي الأَرْضِ وَلاَ طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلاَّ أُمَمٌ أَمْثَالُكُم مَّا فَرَّطْنَا فِي الكِتَابِ مِن شَيْءٍ ثُمَّ إِلَى رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ﴾ (الأنعام:٣٨) واتە: هیچ زیندەوەرێك و گیانلەبەرێك نییە کە بەسەر زەویدا بڕوات و هیچ باڵندەیەك نییە کە بە باڵەکانی بفڕێت ئیللا ئەوانیش ئوممەت و گەلێکن وەك ئێوە، (دڵنیا بن) هیچ شتێك نییە کە پشتگوێمان خستبێت لە کتێبە تایبەتییەکەماندا (اللوح المحفوظ)، لەوەودوا هەر هەموو ئەمانە کۆدەکرێنەوە بۆ لای پەروەردگاریان. کەواتە مافی بەزەییان هەیە وەك مرۆڤەکان، تەنانەت بەزەیی هاتنەوە بە ئاژەڵاندا خاوەنەکەی دەخاتە بەهەشتەوە: ﴿قال رسول الله (ﷺ): بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي فَاشْتَدَّ عَلَيْهِ الْعَطَشُ ، فَنَزَلَ بِئْراً فَشَرِبَ مِنْهَا ، ثُمَّ خَرَجَ فَإِذَا هُوَ بِكَلْبٍ يَلْهَثُ، يَأْكُلُ الثَّرَى مِنَ الْعَطَشِ ، فَقَالَ لَقَدْ بَلَغَ هَذَا مِثْلُ الَّذِى بَلَغَ بِى فَمَلأَ خُفَّهُ ثُمَّ أَمْسَكَهُ بِفِيهِ ، ثُمَّ رَقِىَ ، فَسَقَى الْكَلْبَ فَشَكَرَ اللَّهُ لَهُ ، فَغَفَرَ لَهُ . قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ ، وَإِنَّ لَنَا فِى الْبَهَائِمِ أَجْراً، قَالَ: فِى كُلِّ كَبِدٍ رَطْبَةٍ أَجْرٌ﴾ (رواه البخاري ومسلم ومالك وأحمد وأبوداود)، واتە: کاتێك پیاوێك بە رێیەکدا دەڕۆیشت زۆر تینوی بوو چووە خوارەوە بۆ ناو بیرێك و لێی خواردەوە، کاتێك هاتە دەرەوە سەگێکی بینی کە هەسکە هەسکی بوو و خۆڵی دەخوارد لە تینوێتیدا، ووتی ئەم سەگە وەك منی لێهاتبوو لە تینوێتیدا، ئەوەبوو قۆنەرەکەی پڕکرد لە ئاو و بە دەمی گرتی و سەرکەوتەوە و ئاوەکەیدا بە سەگەکە، خوای گەورەش سوپاسی کرد و لە تاوانەکانی بووری، پاشا لە

پێغەمبەریان پرسی: ئایا ئێمە لە ئاژەڵانیشدا چاکەمان دەست دەکەوێت، فەرمووی: چاکەکردن بەرامبەر هەموو گیاندارێك پاداشتی تێدایە.

هەروەها دڵڕەقی بەرامبەر ئاژەڵان مرۆڤ دەخاتە ئاگرەوە: ﴿قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « دَخَلَتِ امْرَأَةٌ النَّارَ مِنْ جَرَّاءِ هِرَّةٍ لَهَا – أَوْ هِرٍّ – رَبَطَتْهَا فَلاَ هِيَ أَطْعَمَتْهَا وَلاَ هِيَ أَرْسَلَتْهَا تُرَمِّمُ مِنْ خَشَاشِ الأَرْضِ حَتَّى مَاتَتْ هَزْلاً »﴾ (رواه البخاري ومسلم) واتە: ئافرەتێك بەهۆی بەچکە پشیلەیەکەوە چووە ئاگرەوە کە بەستبوویەوە، نەئەوەتا خواردنی دایە و نە بەرەڵڵای کرد کە خۆی خواردنی خۆی پەیدا بکات تاوەکو لەبرساندا مرد، هەروەها حەرامە زۆر لەسەر وولاخ دابنیشین و دەفەرموێت: پشتی وولاخەکانتان مەکەن بەکورسی (رواه أحمد والحاكم)، هەروەها نابێت کاری لەتوانا بەدەری پێبکرێت، رۆژێك پێغەمبەر (ﷺ) چووە باخی پیاوێکی ئەنسارەوە کە ووشترێکی تێدابوو، کاتێك پێغەمبەری بینی فرمێسك بەچاوەکانیدا هاتە خوارەوە، پێغەمبەریش (ﷺ) چووە لای و فرمێسکەکانی سڕی و پرسیاری کرد: کێ خاوەنی ئەم ووشترەیە؟ خاوەنەکەی ووتی: من، ئەویش فەرمووی: بۆ لەخوا ناترسیت لەم ئاژەڵەدا کە خودا تۆی کردووە بە خاوەنی؟! چونکە سکاڵای بۆ کردم کە زۆر هیلاکی دەکەیت و خواردنی باشی نادەیتێ (رواه أحمد وأبوداود).

هەروەها نەفرین کراوە لەوەی کە ئاژەڵان دەکاتە نیشانەی چەکەکەی: ﴿لَعَنَ رَسول الله مَن اتَّخَذَ شَيْئاً فِيهِ رُوح غَرَضَا﴾ (رواه البخاري ومسلم)، و ئەوانەش کە داخیان دەکەن بۆ ئەوەی نیشانەبێت بۆ خاوەنەکەی، رۆژێك پێغەمبەر (ﷺ) بەلای گوێدرێژێکدا رۆی کە لە دەم وچاویدا نیشانە دروست کرابوو و فەرمووی: لەعنەتی خوا لەو کەسە بێت کە نیشانەی کردووە.

ئەگەر ئاژەڵەکەش لەوانە بێت کە گۆشتەکەی دەخورێت دەبێت چەقۆکە تەواو تیژبکرێت: ﴿قال رسول الله (ﷺ): إنَّ اللَّهَ كَتَبَ الإحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ فَإذَا قَتَلْتُمْ فَأحْسِنُوا القِتْلَةَ وَإذَا ذَبَحْتُمْ فَأحْسِنُوا الذَّبْحَ وَلْيُحِدَّ أحَدُكُمْ شَفْرَتَهُ فَلْيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ﴾ (رواه مسلم) واتە: خوای گەورە فەرمانی کردووە کە هەموو شتێك بەچاکی ئەنجام بدرێت، ئەگەر ئاژەڵتان سەربڕی بەباشی سەریبڕن و چەقۆکەتان تیژ بکەن و دوایی پاڵی بخەن، هەروەها دەبێت ئەم تیژکردنە لەبەرچاوی خۆیشیدا نەبێت، پێغەمبەر (ﷺ) بەلای کەسێکدا ڕۆیشت کە ئاژەڵەکەی ڕاخستبوو و لەبەردەمیدا چەقۆکەی تیژدەکرد، ئەویش پێی فەرموو: دەتەوێت دوو جار بیکوژیت؟! باشە بۆ چەقۆکەت پێش ئەوەی کە ڕایبخەی تیژنەکرد؟! (رواه الطبراني والحاكم).

بڕوانە ئەم نموونە بەرزەش دەربارەی بەزەیی هاتنەوە بە گیاندارانـدا لە شارستانێتی ئێمەدا، (عبدالله کوڕی مەسعود) دەڵێت: ڕۆژێك لە سەفەردا بووین لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ)، ئەوەبوو تەیرێکمان بینی لەگەڵ ٢ بێچوویدا ئێمەش بێچووەکانمان لێبرد، تەیرەکە هات و بەدەورماندا باڵەفڕەی دەکرد، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) هات و ئەمەی بینی فەرمووی: کێ دڵی ئەم دایکەی سوتاند بۆ بێچووەکانی؟ هەر ئێستا بێچووەکانی بۆ بگێڕنەوە (رواه أبوداود)، ڕۆژێکی تریش پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك شارە مێروولەیەکی بینی کە سوتێنرابوو، فەرمووی: کێ ئەمانەی سوتاند، ئەمە نابێت لەبەرئەوەی کە تەنها خودای ئاگر سزادەدات بەئاگر (رواه مسلم).

لەژێر ڕۆشنایی ئەم فەرمانانەدا شەریعەتی ئیسلام ئەوەندە یاسای بەزەیی و ڕەحمەت بە گیاندارانی داناوە کە مایەی سەرسوڕمانە و

بەخـەیاڵی کەسـدا نـەهاتووە، بڕیاریـداوە کـە بـەخێوکردنی ئـاژەڵ واجبـە لەسەر خاوەنەکەی کـە ئەگـەر نـەیکات دەبێـت بـەزۆر پێـی بکرێـت، یـان بیفرۆشێت یان بەرەڵای کات بۆ شوێنێك کە بتوانێت لێی بژی.

ئەمە بنەماکانن کە لە واقیعدا ڕەنگیان دایەوە، کاتێـك (عومـەر) بـەلای پیاوێکدا ڕۆی کە بزنەکەی ڕادەکێشا بـۆ سـەربڕین پێیـووت: تیاچـوون بـۆ تۆ بێت بۆ بەچوانی نایبەیت بۆ مـردن؟! (عومـەری کـوڕی عبـدالعزیز) لـە نامەیەکیدا بۆ کاربەدەسـتەکانی فـەرمانی کـرد کـە کـەس سـواری ئەسـپ نەبێت و هیلاکیان نەکەن مەگەر بۆ پێویستییەکی گرنگ نـەبێت، هـەروەها نووسی بۆ بەرپرسی ڕێگاوبـان کـە کـەس نابێـت وڵاخەکـەی بـە لغـاوێکی قورس ببەستێتەوە و نابێـت بنکەکـەی ئاسـن بێـت، یـەکێك لـە کارەکـانی موحتەسـیبەکانیش (کـە لێپرسـینەوە و چـاودێریی کارەکـانی خـەڵکییان دەکرد) ئەوەبوو کـە نەیاندەهێشـت وڵاخـەکان زۆرتـر لـە توانـای خۆیـان لێباربکرێت، لە دەزگا خێرخوازییەکانیشدا ئاژەڵان بێبەش نەبوون چـونکە مـاڵی وەقفـی تایبـەتی هـەبووە بـۆ چارەسـەری نەخۆشـی ئـاژەڵان و بـۆ چاودێریی پیر وپەککەوتەکانیان!!.

ئەمە هەمووی بەڵگەیە لەسـەر گیـانی بـەزەیی هاتنـەوە لای نەتـەوەی ئیسـلامیی کـە نموونـەی نییـە لـە هـیچ نەتەوەیـەکی تـردا، ڕاسـتگۆترین نموونەش لەسەر ئـەم گیانـە لـە شارسـتانییەتماندا ئەوەیـە کـە هـاوەڵێکی وەك (أبـو الـدرداء) دەبیـنین وڵاخێکـی دەبێـت کـە کاتێـك لـە گیانەڵـەدا دەبێت پێی دەڵێت: ئەی وڵاخەکـەم لـەلای پـەروەردگار سـکاڵام لێمەکـە چونکە من هەرگیز لە توانای خـۆت زیـاترم لێبـار نـەکردوویت! هـاوەڵێکی تریش (عدی بن حاتم) دەچوو نانی وورد دەکرد بۆ مێروولەکان و دەیـووت

ئەمانە دراوسێمانن وحەقیان بەسەرمانەوەیە، زانای موسوڵمان (أبوإسحق الشیرازي) کاتێك بەڕێدا دەڕۆی لەگەڵ پیاوێکی تردا سەگێکیان بینی، پیاوەکە بەسەگەکەیدا خوڕی، ئەم زانایەش پێیووت: وامەکە، ئەی نازانیت کە ئەم ڕێگەیە هاوبەشە لەنێوان ئێمە و ئەواندا!

بەرزیی ئەم دیاردەیە بەتەواوەتی هەست پێناکەین ئەگەر بێتو نەڕوانینە هەڵوێستی کەسانی تر بەرامبەر بە گیانداران لە کۆن و نوێدا، ئەوەی یەکەم شت سەرنجمان رادەکێشێت ئەوەیە کە لای میللەتانی تر هیچ هاندەرێك نییە بۆ بەزەیی هاتنەوە بە گیانداراندا و نەرمیی لەگەڵیان، بەڵکو لای میللەتانی تر تا سەدەی نۆزدەیەمی زایینیش گیانداران لەناودەبران وهەندێك جاریش دادگایی دەکران هەروەك مرۆڤ لەسەر کارەکانیان و حوکمی زیندانی و دەرکردن و مردنیان بەسەردا دەدرا هەروەك مرۆڤی تاوانبار![136].

---

[136] لەلایەکی ترەوە بڕوانە ئەم نموونانەی تر لە رۆژئاواوە کە ئاژەڵان وەك دەفری تاقیکردنەوەی چەکەکانیان بەکاردێنن: لە گۆڤاری (العربي)ی ژمارە (٣١٠)ی ساڵی (١٩٨٤)دا هاتووە:

وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پێش جەنگی دووەمی جیهانی یەکەم مەڵبەندیان دروستکرد بۆ ئامادەکردنی ماددە ژەهراوییەکانی چەکە کۆمەڵکوژەکان، وردە وردە پەرەیان پێسەند دوای جەنگەکە تاوەکو ٣ مەڵبەندی گەورەی سەرەکییان دروستکرد، زیاتر لە ٩٥٠ ملیۆن دۆلاریان تێچوو، کە دەیانتوانی ساڵی ٥٦٠ هەزار تەن ماددەی ژەهراوی بەرهەم بێنن، تا ساڵی ١٩٦٥ زیاتر لە ١٠٠ هەزار ئاژەڵیان بەکارهێنا وەك سوووتەمەنی چەکە کیمیاییەکان لەکاتی تاقیکردنەوەیاندا! هەروەها (بەریتانیا)ش هەستا بەهەمان ئەم تاقیکردنەوانە بەڵام ئەم تەنیا ٢ هەزار گیانلەبەر و زیندەوەری لەناوبرد لە تاقیکردنەوەکانیاندا! (روسیا)ش لە ئەنجامی هەمان ئەم تاقیکردنەوانەیدا زیاتر لە ٢٠ هەزار ئاژەڵی لەناوبرد!!!

## دەزگا خێرخوازییەکان:

گەورەترین بەڵگە لەسەر پێشکەوتنی نەتەوەکان و شایەنییان بۆ پێشەوایەتی کردنی جیهان بریتییە لەو گیانە مرۆییە بەهێزەی لەناو ئەندامەکانیدایە، کە دەبێتە مایەی خێر و بەزەیی بۆ هەموو دانیشتوانی زەوی لە مرۆڤ و گیاندارانیش، بەم پێوەرەیە کە شارستانییەتەکان نەمر دەبن و پێش ئەوانی تر دەدەنەوە.

ئوممەتی ئێمە گەیشتە لوتکە لەم بوارەدا کە هیچ میللەتێکی تر پێی نەگەیشتەوە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆشمان، لە سەردەمانی کۆندا چاکە لەلای میللەتانی تر تەنها لە سنووری پەرستگاکان و خوێندنگاکاندا بووە، لە سەردەمی نوێشدا میللەتانی ڕۆژئاوا گەیشتوونەتە لوتکە لە پڕکردنەوەی پێویستییە کۆمەڵایەتییەکان لەڕێی دەزگا گشتی و کۆمەڵایەتییەکانیانەوە، بەڵام نەگەیشتوونەتە لوتکەی مرۆییانەی پوخت کە تەنها بۆ خودا بێت وەك نەتەوەی ئێمە پێیگەیشت لە سەردەمە جیاوازەکانیدا، گەڕان بەدوای ناوبانگ و ناسراوی و ناودەرکردن و نەمریی کاریگەریی سەرەکی هەیە لە هاندانی ڕۆژئاواییەکان بۆ کارە مرۆییەکان، بەڵام دەبینین پاڵنەری سەرەکی نەتەوەی ئێمە بۆچاکەکردن تەنها ڕەزامەندی خودا بووە جائەگەر خەڵکی پێیان بزانیایە یان نا.

لەلایەکی ترەوە دەزگا خزمەتگوزارییەکانی ڕۆژئاوا زوربەی جار تەنها تایبەتە بە نەوەکانی وڵاتی خۆیان.

بەڵام دەبینین دەزگا خێرخوازییەکانی ئێمە باوەشی کراوە بووە بۆ هەموو مرۆڤێك بەڕەهایی بەبێ گوێدانە ڕەگەزی یان زمانی یان وڵاتی یان ئاینەکەی یان مەزهەبی.

هەروەها جیاوازییەکی تر ئەوەیە کە ئێمە دەزگای خزمەتگوزاریمان بۆ چەند مەبەستێکی تایبەتی دروستکرد لە هەندێك بواری هاوکاری کۆمەڵایەتیدا کە تا ئەمڕۆش ڕۆژئاواییەکان شتی وایان دروست نەکردووە، و مایەی پێزانین و سەرسوڕمانن! ! و بەڵگەشە لەسەر ئەوەی ئەو گیانە مرۆییەی شارستانێتی ئێمە فراوانتر و پاکتر و هەمەلایەنەتر بووە لە هەموو شارستانییەتەکانی تر.

ئیسلام بە بەردەوامی هانی چاکە دەدات و داوا دەکات کە لە فەقیری نەترسین ﴿الشَّيْطَانُ يَعِدُكُمُ الْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِالْفَحْشَاء وَاللّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلاً وَاللّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾ (البقرة:٢٦٨) واتە: (کاتێك ئێوە لە ماڵ و داراییتان دەبەخشن) شەیتان بەڵێنی هەژاری و نەداریتان پێدەدات (دەتانترسێنێت بە هەژاری)، و فەرمانتان پێدەکات بە گوناه و تاوان و خراپە و نەبەخشین، خوای گەورەش بەڵێنی لێخۆشبوونێکی تایبەتی خۆیتان پێدەدات، لەگەڵ زۆریی ڕۆزیی و بەهرەی فراواندا، خوداش فراوانگیر و زانایە.

ئەم چاکەکارییەش گشتگیر دەکات بەسەر هەموو مرۆڤێکدا، پێغەمبەر (ﷺ) بۆی ڕوونکردووینەتەوە کە چاکە کردن تەنها بە پارە و سامان نییە بەڵکو دەرگای زۆری تری هەیە وەك فەرمان کردن بە چاکە و بەرگری لەخراپە و لابردنی ناڕەحەتی لەڕێگای خەڵکی و ئاشتەوایی نێوان ناکۆکەکان و تەنانەت یارمەتیدانی یەکتری لەبارکردنی کەلوپەلەکانیاندا، هەربۆیە دەبینین پێغەمبەر و هاوەڵەکانی دەسپێشخەر بوون لە چاکەکاریدا بەتایبەتی ئەو شتانەی کە خۆشەویستیش بووە لەلایان دەیانکرد بەخێر، هەر لێرەوە بۆچوونی (وەقف) لە شەریعەتی ئیسلامیدا

پەیدابوو کە سەرچاوەیەکی بەپێزبوون بۆ دابینکردنی پارەی دەزگا کۆمەڵایەتییەکان.

دەزگا خێرخوازییەکان ٢ جۆر بوون: یەکێکیان ئەوانەبوون کە لەلایەن دەوڵەتەوە دروستدەکران و وەقفی فراوانیان بۆ دیاری دەکرا بۆ پڕکردنەوە پێویستییەکانیان، جۆری دووەمیش ئەوانەبوون کە لەلایەن ئەمیرەکان و سەرکردەکان و دەوڵەمەندانەوە دروستدەکران جا پیاو بوونایە یان ئافرەت، لێرەدا ناتوانین هەموو ئەو دەزگایانە بژمێرین بەڵکو ئاماژە بە هەندێکیان دەدەین:

یەکەم و گرنگترین دەزگا خزمەتگوزارییەکان مزگەوتەکان بوون کە خەڵکی پێشبڕکێیان دەکرد لە دروست کردنیاندا، کە لەناویاندا پەرستنەکان و هەموو چالاکییە کۆمەڵایەتییەکانیش ئەنجام دەدران.

لەگرنگترین دەزگاکانی تر قوتابخانە و نەخۆشخانەکان بوون کە بە تایبەتی باسیان دەکەین، هەروەها دروستکردنی خان و دیوەخان و ئوتێل بۆ ڕێبواران و بێجێگایان و هەژاران، هەر لەم جۆرانە ئەو تەکێ و خانەقایانە بوون کە بۆ خەڵوەتگرتن بۆ پەرستنی خودا دروستدەکران، هەروەها خانووی تایبەت بۆ هەژاران دروستدەکران کە ئەو کەسانەی خانوو و لانەیان نەبووە دەچوونە ئەوێ، هەروەها (سیقایەکان) کە بریتی بوون لە هێنان و ئامادەکردنی ئاو بۆ سەر ڕێگا گشتییەکان بۆ هەموو خەڵکی، هەروەها چێشتخانە میللییەکان کە تێیاندا نان و گۆشت و شۆربا و شیرینی و خواردنی تریش دەبەخشرایەوە، هەروەها خانووی تایبەتی بۆ حاجییەکان لە مەککە کە بەشێوەیەك بڵاوبوو بوونەوە کە هەموو زەوی مەککەی گرتبووەوە و هەندێك فەتوای ئەوەیاندا کە لەکاتی حەجدا

حەرامە لە مەککە خانوو بەکرێ بدرێت چونکە زوربەی خانووەکانی وەقفە بۆ خێر، هەروەها هەڵکەندنی بیر لە دەشت و چۆڵەوانییەکاندا بۆ ئاودانی مەڕوماڵات و رێبواران کە ژمارەیان ئێجگار زۆر بوو بە تایبەتی لەنێوان بەغدا و مەککە و دیمەشق و مەدینە و نێوانی زوربەی شارە گەورەکان، کە بەجۆرێك بوون رێبواران زۆر بەدەگمەن تووشی تینوێتی دەبوون.

هەروەها شوێنەکانی ریبات و پاسەوانی کردن لەرێی خوادا، کە موجاهیدەکان هەموو پێویستییەکانیان لە چەك و خواردن و خواردنەوە لێیانەوە دەستدەکەوت و ئەم شوێنانە رۆڵی گەورەیان بینی لە بەرپەرچدانەوەی هێرشەکانی رۆم لە سەردەمی عەبباسییەکاندا و هێرشەکانی خاچپەرستان بۆ سەر وولاتی شام و میسر، لەگەڵ ئەمانەشدا وەقفی تایبەتی بۆ ئەسپ و شمشێر و رِم و ئامێرەکانی جیهاد هەبووە و ئەمانە بوونە هۆی ئەوەی کە کارگەی گەورەی دروستکردنی کەرەستەکانی جەنگ لە وولاتماندا بڵاوببێتەوە، و بەشێوەیەك ووردەکار بوون کە وای دەکرد خاچپەرستەکان لە ئێمە چەك بکڕن لەکاتی ئاشتیدا لەگەڵ ئەوەشدا کە زانایان ئەم کردەوەیەیان حەرامکرد، بەڵام بڕوانە چۆن لە رۆژگاری ئەمڕۆدا ئەم پرۆسەیە پێچەوانە بۆتەوە و بووین بەبار بەسەر رۆژئاواوە لە کڕینی چەك و کەرەستەی جەنگیدا و ئەوانیش بە مەرجی تایبەتی خۆیان پێمان دەفرۆشن.

لە دەزگا کۆمەڵایەتییەکانی تر ئەو وەقفانە بوون کە بۆ چاکردنی رێگەوبانەکان و پردەکان دانرابوون، و هەروەها ئەوانەش کە بۆ قەبرسانەکان بوون کە کەسێك هەڵدەستا بە بەخشینی پارچەیەك زەوی فراوان بۆ ئەوەی بکرێت بە گۆڕستانێکی گشتی، هەروەها وەقف هەبووە

بـۆ كڕینـی كفـن بـۆ مـردووی هـەژاران و ناشـتنیان، دەزگـا هاوكارییـە كۆمەڵایەتییەكانیش مایەی سەرسوڕمانی گەورە بـوون، دەزگـای تایبـەتی هـەبووە بـۆ منداڵـە دۆزراوەكـان و هـەتیوەكان بـۆ خەتەنـە كـردن و چاودێرییان، دەزگاش بۆ پەككەوتە و كوێر و كەمئەندامەكان كە تێیـدا بـە سەربەرزی دەژیان و هـەموو پێویسـتییەكانیان لـە جێگـا و خـۆراك و جـل وبەرگ و فێركردن بۆیان دابیندەكرا، هەروەها دەزگای تایبەتی هـەبوو بـۆ چـاككردنی بـارودۆخی گـیراوان و بـەرز كردنـەوەی ئاسـتی خۆراكیـان بـۆ پاراستنی تەندروستییان، هەروەها دەزگاش بۆ كـوێر و پەككەوتـەكان بـۆ دیاری كردنی كەسانێك بۆ خزمەتكردن و ڕێنیشـاندانیان، هـەروەها دەزگـا هەبووە بۆ ژنهێنان بـۆ كـوڕان و شـوكردنی ئـەو كچـانەی كـە دەسـتكورت بوون و لە توانای كەس وكاریاندا نەبووە، كە بە ڕاستی سـۆز دەربڕینێكـی بێوێنەیە ! .

هـەروەها دەزگـا هـەبووە بـۆ پێـدانی شـیر و شـەكر بـە دایكـان و شیردەران، یەكێك لە كارە خێرخوازییەكانی صلاح الدین ئەوەبووە كـە لـە دەرگای یەكێك لە قەڵاكانیدا لە دیمەشق بۆرییەكی بۆ شیر و بۆرییەكی بـۆ شـەكراو دانـابوو كـە دایكـان هەفتـەی ٢ جـار دەهـاتن بـۆ وەرگرتنـی پێویستییەكانیان لە شیر و شەكراو بۆ منداڵانیان.

لە كۆتاییدا باسی ئەو دەزگایانـە دەكـەین كـە بـۆ چارەسـەری ئاژەڵـە نەخۆشـەكان و خـۆراك پێـدانیان و ئاگـاداری كردنیـان لــەكاتی پەككەوتنیاندا، وەك ئەوەی كە دەشـتێكی تایبـەتی لـە دیمەشـق دانرابـوو بۆ وولاخ و ئاژەڵە پیرەكان و پەككەوتەكان كـە تێیـدا دەلـەوەڕان تـا ئـەو كاتەی دەمردن.




ئەمانە ٣٠ جۆر بوون لە دەزگا خێرخوازییەکان کە لە سایەی شارستانێتی ئێمەدا دروستکران[١٣٧].

ئایا هیچ نموونەیان بینراوە لە نەتەوەکانی پێشتردا؟!

تەنانەت لەمڕۆشدا هەندێکیان نموونەیان نییە!

ئەمانە چەند دەستێکی پاك و بە دەستنوێژبوون کەخزمەتی هەزاران وهەتیوان وپەککەوتە وبێدەسەڵاتەکانیان دەکرد.

---

[١٣٧] جورێکی تر لە دەزگا خێرخوازییەکان چەند شوێنێك بوون کە پێیان دەووترا (دار الزبادي) کە ئیشیان بریتی بوو لە پێشکەش کردنی قاپ و قاچاخ و کونەی ئاو بۆ ئەو خزمەتکارانەی کە لە رێگەی کڕین و خزمەتکردنی خاوەنەکانیاندا کونە و قاپ و قاچاخەکانیان لەدەست دەکەوت و دەشکان، پارچە شکاوەکانیان دەبرد و لەو شوێنە بە خۆڕایی لەبری شکاوەکە دانەیەکی ساغی لێکچووی دەدرایە، کە تەنها مەبەست لەمە بریتی بوو لە پاراستنی ئەو کەنیزە و خزمەتکارانە لە تووڕەبوون و ستەمی خاوەنەکانیان ئەگەر بیانزانیایە کە شتەکانیان شکاندووە!!.

## قوتابخانه و په یمانگا زانستییه‌کان:

قوتابخانـه‌کان له‌ســه‌ر بنـه‌مای ئـه‌و ئه‌وقافـه زۆرانـه دامـه‌زران کـه ده‌وڵه‌مه‌نده‌کان له سه‌رکرده و زانایان و بازرگانـان و پاشـا و شـازاده‌کان پێشکه‌شیان ده‌کرد، که له زۆریدا زۆر زیادڕه‌وی تێداکرا، تـه‌نها ئه‌وه‌نـده به‌سه که بزانیت هیچ شـار و لادێیـه‌ك لـه سه‌رانســه‌ری جیهـانی ئیسـلامیدا خاڵی نه‌بووه له چه‌ندین قوتابخانه که ده‌یان زانا و مامۆستا وانـه‌یان تێـدا ده‌ووته‌وه.

مزگه‌وت بریتی بوو له ناووکی یه‌که‌می قوتابخانـه‌کان لـه شارسـتانێتی ئێمه‌دا، که ته‌نها شوێنی په‌رستشه‌کان نـه‌بووه بـه‌ڵکو موسـوڵمانان تێیـدا فێــری خوێندنـــه‌وه و نووســـین و قورئـــان و زانســـته‌کانی شـــه‌ریعه‌ت و زمانه‌وانی و زانسته جۆراوجۆره‌کانی تریش ده‌بوون.

پاشان له‌پاڵ مزگه‌وته‌کاندا مه‌کته‌به‌کان دروستکران و تایبه‌ت کران بـه فێرکردنـی خوێندنــه‌وه و نووســین و قورئــان و زانســته‌کانی عــه‌ره‌بی و بیرکاری، ئه‌م مه‌کته‌بانه له قوتابخانه‌ی سـه‌ره‌تایی ئێسـتامان ده‌چـوون و ژماره‌یـان ئه‌وه‌نـده زۆر بـوون کـه (ئـیبن حه‌وقـه‌ل) تـه‌نها له‌یـه‌ك شـاری دورگـه‌ی صـقلیه‌دا ٣٠٠ دانـه‌یان لێده‌بـژێرێت، زۆر جـار ئه‌وه‌نـده فـراوان ده‌بوون که ته‌نها یه‌ك مه‌کته‌ب ده‌یتوانی سه‌دان و هه‌زاران قوتابی له‌خۆی بگرێت، له مێژووی ژیانی زانا (أبوالقاسم البلخـي)دا باسـی ئـه‌وه ده‌کرێـت که مه‌کته‌بێکی هه‌بووه زیاتر له ٣٠٠٠ قوتابی تێیدا خوێندوویانه!

پاشان هـه‌ر لـه پـاڵ مزگـه‌وت و مه‌کته‌به‌کانـدا قوتابخانـه فه‌رمییـه‌کان دروسـتکران کـه خوێنـدن تیایانـدا لـه خوێنـدنی دواناوه‌نـدی ئـه‌مڕۆمان ده‌چـوو، و خوێنــدن تیایانــدا بــه‌خۆڕایی بــووه بــۆ هــه‌موو توێــژه‌کان،

خوێندنیان ٢ جۆر بووە: بەشێکی ناوخۆیی بۆ غەریب و دوورە وولاتەکان و ئەوانەی کە توانای ماددییان رێی نەدەدان کە لەسەر خەرجیی کەس وکاریان بخوێنن، و هەروەها بەشێکی دەرەکی بۆ ئەوانەی کە دەیانوویست ئێوارە بچنەوە بۆ لای کەس وکاریان، بەشە ناوخۆییەکەش بەخۆرایی بووە، کە تێیدا خواردن و نوستن و خوێندنەوە و پەرستن بۆ قوتابییەکە دابیندەکرا، بەم شێوەیە هەموو قوتابخانەیەك مزگەوت و هۆڵەکانی خوێندن و ژووری نوستنی قوتابییەکان و کتێبخانە و چێشتخانە و حەمامی تێدا بووە، هەندێك قوتابخانەی تر لەسەروو ئەمانەوە یاریگای سەربەتاڵی بۆ یارییە لاشەییەکانی تێدابووە، هەتا ئێستاش نموونەی ئەم قوتابخانانەمان ماوە کە سەرانسەری جیهانی ئیسلامی داپۆشیبوو.

لەشاری دیمەشق هەتا ئەمڕۆمان قوتابخانەی (النورية) کە پاڵەوانی سەرکردە (نورالدين زنكي) بنیاتینا و دەکەوێتە بازاڕی بەرگدرووەکانەوە هەرماوە و نموونەیەکی زیندوومان پیشاندەدات بۆ ئەندازیاریی قوتابخانەکان لە سەردەمەکانی شارستانێتی ئیسلامیدا، (ئیبن جوبەیر)ی گەڕۆك لە سەرەتای سەدەی حەوتەمی کۆچیدا سەری لەم قوتابخانەیە داوە و زۆر پێی سەرسام بووە و دەربارەی نووسیوە، نموونەی ئەم قوتابخانانە لە شاری (حەلەب)یش دەبینین وەك قوتابخانەکانی (الشعبانية و العثمانية و الخسروية) کە هەتا ئێستاش بۆ قوتابییەکان ژووری مانەوە و هۆڵی خوێندنی تێدایە، کە پێشتر خواردنیشیان تێدا دەخوارد، کە دوایی ئەم سیستمە گۆڕدرا و کرا بە مووچەیەکی دیاریکراو کە لە کۆتایی مانگدا دەدرا بە قوتابیان وکارمەندانی قوتابخانەکە.

دیارترین نموونەی ئەم قوتابخانانە لە میسر بریتییە لە (الجامع الأزهر)، کە مزگەوت وقوتابخانەیەکی بالاّ بووە و لە هۆڵەکانیدا بازنەکانی فێرکردن هەیە و لە هەموو لایەکییەوە بە ژووری مانەوەی قوتابییەکان دەورە دراوە، و قوتابییەکانی هەر وولاّتێك لەلایەکیدا دادەنیشن بەجیا، وەك بەشی شامییەکان و بەشی مەغریبییەکان و بەشی تورکەکان و بەشی سودانییەکان و .....هتد[138] .

[138] لە وولاّتە رۆژئاواییەکانیشەوە قوتابی دەهاتن بۆ وولاّتانی ئیسلامی بە تایبەتی بۆ زانکۆکانی ئەندەلوس بۆ خوێندن و فێربوون، تەنانەت لە سەردەمی خەلیفەی ئومەوی لە ئەندەلوس (عبدالرحمن الناصر)دا زیاد لە ٧٠٠ قوتابی کوڕ و کچی رۆژئاوایی لە قورتوبە دەیانخوێند، کە یەکێك لە دەستە قوتابییە نێردراوەکان بە لێپرسراوێتی (شازادە ئیلیزابێس) ی کچی خاڵی پاشا (لویسی شەشەم)ی پاشای فەرەنسا بوو، هەروەها (فیلیپ)ی پاشای (باڤاریا) نوێنەرێکی نارد بۆ لای (هیشام)ی دووەم کە نوسراوێکی پێبوو تێیدا داوای مۆڵەتی دەکرد بۆ ناردنی وەفدێك لە وولاّتەکەیەوە بۆ ئەندەلوس بۆ ئەوەی شارەزای لایەنەکانی پێشکەوتن و شارستانێتی ببن و سوودی لێوەرگرن لە وولاّتی خۆیان، ئەوەبوو خەلیفە رازی بوو و وەفدەکە لە (٢١٥) قوتابی پێکهاتبوو بە سەرۆکایەتی وەزیر (ویلمبین) هاتن.
هەرووەها پاشای ئینگلتەراش وەفدێکی تری نارد بە سەرۆکایەتی کچی براکەی کە تێیاندا ١١ کچی کاربەدەستان و دەسەلاّتدارانی تێدابوو، وەفدەکە بە سەرۆکایەتی قەشە (سفیلك) سەرۆکی خزمەتکارانی کۆشکی پاشایەتی گەیشتنە شاری ئیشبیلیە، مەبەستی ئەم وەفدە وەك لەو نامەیەی پێیان بووە دەردەکەوێت کە پاشا دەڵێت: ئێمە گوێمان لەو پێشکەوتنە مەزنە بووە کە پەیمانگاکانی زانست و پیشەسازی لە وولاّتی ئاوەدانی ئێوەدا هەیەتی، ئێمەش وویستمان کە نموونەیەك لەم پلەبەرزانە بۆ قوتابیان و لاوانی خۆمان بیچرین، بۆ ئەوەی سەرەتایەکی باش بێت بۆ ئێمە کە شوێنپێی ئێوە هەلگرین بە مەبەستی بلاّوکردنەوەی رووناکی زانست لە وولاّتماندا کە تاریکایی و نەزانیی لە هەموو لایەکەوە دایپۆشیوین، خەلیفەی موسوڵمانان زۆر بەجوانی پێشوازی لێکردن و بڕیاریدا کە خەرجی ئەم وەفدە لە پارەی بەیتولمالی موسوڵمانان بێت.

لێرەدا کە باسی قوتابخانەکان دەکەین دەبێت باسی مامۆستاکان و بارودۆخیان و مووچەکانیان بکەین.

سەرۆکی قوتابخانەکان لە باشترینی زانایان و بەناوبانگترینیان بوون، لەمێژووی زانا بەناوبانگەکاندا ئەو قوتابخانانە باسکراون کە تێیاندا وانەیان ووتۆتەوە: (ئیمامی نەوەوی و ئیبنوصەلاح و ئەبو شامە و تقی الدینی سوبوکی و عمادالدین ابن کثیر) و غەیری ئەمانەش لە قوتابخانەی (دار الحدیث) لە دیمەشق مامۆستا بوون، (غەزالی و شیرازی و ئیمامی حەرەمەین و شاسی و الخطیب التبریزي و قەزوینی و فەیروزئابادی) و غەیری ئەمانیش لە قوتابخانەی (النظامیة) لە بەغدا مامۆستابوون و بەم شێوەیە، مامۆستایان لە سەرەتای ئیسلامدا کرێیان وەرنەدەگرت بۆ وانە ووتنەوە، و کاتێك کە رۆژگار تێپەڕی و شارستانییەت فراوان بوو و قوتابخانەکان دروستکران و ئەوقافی زۆریان بۆ تەرخانکرا، ئیتر مامۆستاکان مووچەی مانگانەیان بۆ بڕدرایەوە.

تەنها ئەوانەی شایەتی لێهاتوویی و زانستیان بۆ دەدرا دادەنیشتن بۆ وانە ووتنەوە، مامۆستایان رێگەیاندەدا بە قوتابییە سەرکەوتووەکانیان کە بازنەی وانە ووتنەوەی تایبەت بەخۆیان دروستبکەن، هەروەها پێش وەفاتیان کەسێکی لێهاتوویان لە قوتابیانیان دیاری دەکرد بۆ وانە ووتنەوە لەجێیان، کاتێکیش کە قوتابخانە فەرمییەکان دروستکران ئەو کەسانەی لێوەی دەردەچوون مۆڵەتی زانستییان پێدەدرا لەلایەن شێخی قوتابخانەکەوە، کە لە بڕوانامەکانی دەرچوونی ئەمڕۆمان دەچوون، پزیشکان رێگەیان پێنەدەدرا کە بە کاری پزیشکییەوە خەریك بن تاوەکو کە ئەم بڕوانامەیەیان وەرنەگرتایە لە سەرۆکی پزیشکانی قوتابخانەکەوە.



مامۆستایان پۆشاکێکی تایبەت بەخۆیان هەبووە کە لە پیشەوارانی تر جیای کردوونەتەوە، لەسەردەمی (أبو یوسف)دا مێزەرێکی رەش و جبەیەك بووە، لە سەردەمی فاتیمییەکاندا مێزەرێکی سەوز و پۆشاکێکی ٦ پارچەیی ئاڵتوناوی بووە، لەبەرکردنی جبە و تایبەت بوونی بە زانایان و مامۆستایانەوە لە سەردەمی ئومەوییەکانەوە دەستی پێکرد، جلەکانی زانایان لە ئەندەلوس جیاوازییەکی کەمی هەبووە لە زانایانی رۆژهەلات، کە پاشان رۆژئاواییەکان لە مامۆستایانی ئەندەلوسەوە جلەکانیان وەرگرت و بووە بنەمای ئەو پۆشاکە زانستییەی ئەمڕۆ لە زانکۆکانی ئەورووپادا ناسراوە، مامۆستایان سەندیکای خۆیان هەبووە هەروەك سەندیکاکانی قوتابیان و پیاوماقولان و پیشەوەران لەو سەردەمانەدا، مامۆستایان خۆیان سەرۆکی خۆیان هەڵدەبژارد و کاربەدەستان دەستیان تێنەدەخست تەنها لە حاڵەتی روودانی ناکۆکیدا نەبێت لەنێوانیاندا.

بەم شێوەیە قوتابخانەکان و پەیمانگا باڵاکان جیهانی ئیسلامییان پڕکردبوو لە هەموو لایەکییەوە، مێژوو بە شانازی و گەورە زانینەوە باسی هەندێك لە کاربەدەستانی موسوڵمانان دەکات کە هەستان بە دروستکردنی قوتابخانەکان لە هەموو شارەکانی ژێردەسەڵاتیاندا:

ئەوەتا (صلاح الدینی ئەیوبی) لە شارەکانی میسر و دیمەشق و موصلٚ و قودس قوتابخانەی دروستکرد.

(نورالدین زەنکی)یش تەنها لە شام ١٥ پەیمانگای زانستی دروستکرد (٦ لە دیمەشق و ٤ لە حەلەب و ٢ لە حەما و ٢ لە حیمص و ١ لە بەعلەبەك).

هەروەها (نظام الملك)ی وەزیری سەلجوقی عێراق و خوراسانی پڕکرد لە قوتابخانە، کە دەڵێن لە هەموو شارێکی عێراق و خوراساندا قوتابخانەیەکی دروستکردووە، تەنانەت لە شوێنە دوورە دەستەکانیشدا وەك (جەزیرەی ئیبن عومەر) قوتابخانەیەکی گەورەی چاکی دروستکردووە، هەرکاتێکیش بیبیستایە لە شوێنێك زانایەکی شارەزا و ناسراو هەیە قوتابخانەیەکی بۆ دروست دەکرد و وەقفی بۆ دیاری دەکرد و کتێبخانەشی بۆ دروستدەکرد.

قوتابخانەی (النظامیة) لە بەغدا یەکەمیان و گرنگترینیان بووە کە بەناوبانگترین زانایانی موسوڵمان لەنێوان سەدەکانی پێنجەم و نۆیەمی کۆچیدا وانەیان تێدا دەووتەوە، ژمارەی قوتابییەکانی گەیشتە ٦٠٠٠، کە لە کوڕی ناسراوترین کەسەوە بۆ هەژارترین کەس وانەیان تێدا دەخوێند بەخۆڕایی، و لەسەروو ئەمەشەوە قوتابیانی هەژار پارەیەکی دیاری کراویان دەدرایە.

لـەپاڵ ئـەم پیـاوە گەورانـەدا شـازادەکان و دەوڵەمەنـدەکان و بازرگانەکان پێشبڕکێیان دەکرد لـە دروسـتکردنی قوتابخانـەکان و دیـاری کردنی وەقف بۆیان بەشـێوەیەك کـە بـەردەوامی و هـاتنی قوتـابی بۆیـان دەستەبەر بکـات، زۆرێکـیش هـەبوون کـە ماڵـەکانی خۆیانیـان دەکـردە قوتابخانـە و هـەموو کتێبـەکانیان و بنیاتنراوەکـانی تریـان بـۆ دەکردنـە وەقف بۆ قوتابیانی زانست و فێرخوازان.






قوتابخانـەکان جۆریـان زۆر بـووە، هـەیانبووە بـۆ فێرکردنی قورئـانی پـیرۆز و تەفسـیر و لەبـەرکردنی، قوتابخانـەی تایبـەت بـە فـەرموودەی پێغەمبـەریش (ﷺ) هـەبووە، هـەروەها قوتابخانـەکانی فیقـە کـە زۆرترینیان بـووە و بـۆ هـەر مەزهـەبێك قوتابخانـەی تایبەتی خۆی هەبووە.

هـەروەها قوتابخانـەی پزیشـکی و قوتابخانـەی تایبـەت بـە هـەتیوانیش هـەبووە، ئـەوەتا زانـا (النعیمـي) کـە لـە زانایـانی

سەدەی دەیەمی کۆچییە لە کتێبی (الدارس في تأريخ المدارس)دا خشتەیەکی دروستکردووە بۆ قوتابخانەکانی دیمەشق و ئەوقافەکانیان، کە لەمەوە دەزانین کە تەنها لە دیمەشقدا ٧ قوتابخانەی قورئان و ١٦ی فەرموودە و ٣ بۆ هەردووکیان و ٦٣ بۆ فیقهی شافیعی و ٥٢ بۆ فیقهی حەنەفی ٤ بۆ فیقهی مالیکی و ١١ بۆ فیقهی حەنبەلی هەبوون، ئەمانە بێجگە لە قوتابخانەکانی پزیشکی و مانەوەی سەربازان و ئوتێلەکان و تەکێیەکان و مزگەوتەکان، کە لە هەموویاندا قوتابخانە هەبوون بۆ فێرکردنی خەڵکی.

لەگەڵ ئەمانەدا ئەگەر باسی بارودۆخی رۆژئاواییەکان بکەین و ئەو حاڵەتی نەخوێندەواری و نەزانینە تەواوەی باڵی بەسەردا کێشابوون سەرماندەسوڕمێت، کە زانست هیچ لانەیەکی نەمابوو تەنها لە خەڵوەتگا و کڵێسای قەشەکاندا نەبێت و تەنها تایبەت بووە بەپیاوانی ئاینەوە، لێرەدا ئەو گەورەیی و پێشکەوتنەمان بۆ دەردەکەوێت کە ئوممەتی ئێمە لە سەردەمە زێڕینەکانی‌دا پێیگەییوە، ئای چەندێك شارستانێتی ئێمە پێشڕەو و ناوازە بووە لە مێژووی دەزگا کۆمەڵایەتییەکان و پەیمانگا زانستییەکاندا، و چەندێك ئیسلام دەستی باڵای هەبووە لە بڵاوکردنەوەی زانست و زانیاریدا، و بەرزکردنەوەی ئاستی رۆشنبیری گشتی و ئاسانکردنی رێگاکانی فێربوون بۆ هەموو نەوەکانی وڵات.

(ئیبن کەسیر) لە کتێبی مێژوویی (البداية والنهاية في التأريخ) لە رووداوەکانی ساڵی (٦٣١ك)دا دەڵێت: (لەم ساڵەدا بینای قوتابخانەی موستەنسیرییە لە بەغدا تەواو بوو، کە پێشتر قوتابخانەی هاوشێوەی دروستنەکراوە لە جیهاندا! وەقف کرا لەسەر چوار مەزهەبەکە، کە هەر یەکێکیان ٦٢ فەقیە و ٤ موعید و مامۆستایەکی هەر مەزهەبێکی هەبووە،

هەروەها شێخی فەرمووده و دوو قورئـان خـوێن و ١٠ دووبـاره كـەرەوه و مامۆستایەكی پزیشكی و ١٠ له موسوڵمانان كـه بـه زانسـتی پزیشـكییەوه خەریك بوون، و نووسینگەیەكی هەتیوان، بۆ هەموویان له نان و گۆشـت و حـەڵوا و پـاره وپـوول ئەوەنـده دیـاریكرا كـه سـەروزیادی هەریـەكێكیان بـووه...) لـه كۆتاییـدا دەڵێـت: (چـەندین كتێبخانـەی بـۆ وەقـف كـرا كـه وێنـەیان نـەبووه لـه زۆرییـان و جـوانی نووسـینەوەیاندا و باشـی ئـەو كتێبانەی بۆی وەقف كرابوون).

## نەخۆشخانەكان و پەیمانگا پزیشكییەكان:

لەو بنەما گرنگانەی كه شارستانێتی ئێمەی لەسەر دامەزرا بریتییـه لـه كۆكردنەوەی نێوان پێویستییەكانی لەش و رۆح، كه گرنگیدانی به لـەش و پێویسـتییەكانی بـه زەرورەت دانـاوه بـۆ گەیشـتن بـه بەختـەوەری و گەشانەوەی رۆح، له ووته گرنگه ناسراوەكانی دانەری ئەم شارستانییەته (ﷺ) ئەوەیه كه فەرموویەتی: ﴿وَإِنَّ لِجَسَدِكَ عَلَيْكَ حَقًّا﴾ (رواه البخـاري ومسـلم) واتـه: لەشـت حـەق و مـافی بەسـەرتەوه هەیـه، ئـەوەی تێبینـی دەكرێـت لـه پەرسـتنه ئیسـلامییەكاندا ئەوەیـه كـه دەیـەوێت گـرنگترین مەبەستێك له مەبەستەكانی زانستی پزیشـكی بێنێتـەدی كـه بریتییـه لـه پاراسـتنی تەندروسـتی[١٣٩]، ئـەوەتا نوێـژ و رۆژوو و حـەج و پێویسـتییەكانیان هـەموویان تەندروسـتی لـەش و چـالاكی و هێـزی دەپـارێزن، ئەگـەر بـەرگری كردنـی ئیسـلام بـۆ نەخۆشـییەكان و

---

[١٣٩] ئیبن عـەبباس پێناسـەی پزیشـكی بـەوه دەكـات كـه: زانسـتێكه دەربـارەی پاراسـتنی تەندروستی تەندروستان و گێرانەوەی تەندروستی بۆ نەخۆشەكان دەكۆڵێتەوه.

بڵاوبوونەوەیان و هاندانی بۆ چارەسەری نەخۆشییەکانی بخەینەسەر، ئەوا بنەما زانستییە بەهێزەکانی شارستانێتی خۆمانمان بۆ دەردەکەوێت لەبواری پزیشکیدا، و رادەی ئەو سوودە گەورەیەمان بۆ دەردەکەوێت کە زانست وەریگرت لە دروستکردنی نەخۆشخانەکان و پەیمانگا پزیشکییەکاندا، و دەرچوواندنی ئەو پزیشکە ناوازانەی کە تا ئێستا مرۆڤایەتی شانازی بە بالادەستی ئەوانەوە دەکات بەسەر هەموو زانستەکانەوە بەگشتی و زانستی پزیشکی بەتایبەتی.

عەرەبەکان لەپێش ئیسلامدا قوتابخانەی (جندیسابور)ی پزیشکییان ناسیوە کە (کیسرا) لە ناوەراستی سەدەی شەشەمی زایینیدا دایمەزراند و هەندێك لە پزیشکەکانیان دەرچووی ئەوێ بوون وەك (الحارث بن أبي كلدة) کە لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) ژیاوە، و ئامۆژگاری هاوەڵانی دەکرد بەوەی نەخۆشییەکانیان لای ئەو چارەسەر بکەن، لە سەردەمی (الوليد بن عبدالملك)دا یەکەم نەخۆشخانەی فەرمی لە ئیسلامدا دروستکرا کە تایبەت بوو بە گولەکان، و پزیشکی تێدا دامەزراند و مووچەی بۆ برینەوە، دوای ئەمە دروستکردنی نەخۆشخانەکان بوردەوام بوو و پێیان دەووترا (بیمارستان) واتە لانەی نەخۆش.

دوو جۆری سەرەکی لە نەخۆشخانە هەبوون: جۆرێکی گەڕۆك و جۆرێکی جێگیر، گەڕۆکەکان بۆ یەکەم جار لە ژیانی پێغەمبەردا (ﷺ) ناسران بە تایبەتی لە جەنگی (خەندەق)دا کە خەیمەیەك هەڵدرا بۆ چارەسەری بریندارەکان و کاتێك (سەعدی کوڕی موعان) بریندار بوو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بیبەن بۆ خەیمەکەی (رەفیدە) تا لەدواییدا سەری لێدەدەم، کە یەکەم نەخۆشخانەی سەربازی بوو لە ئیسلامدا،

پاشــان خەلیفــە و کاربەدەســتەکان فراوانیانیــان کــردن بەشــێوەیەك کــە نەخۆشخانە گەڕۆکەکان ئامادەکرا بوون بە هەموو شتێك کــە نەخۆشــەکان پێویستیان بووە لە دەرمان و خۆراك و خواردنەوە و جل وبەرگ و پزیشــك و دەرمانســاز، کــە ئــەم نەخۆشــخانانە دەگوازرانــەوە لــە دێیەکــەوە بــۆ دێیەکی تر لەو شوێنانەی کە نەخۆشخانەی جێگیریان تێدانەبووە.

نەخۆشــخانە جێگیرەکــانیش ژمارەیــان زۆر بــووە و شــارەکانیان لێپڕبووە، تەنانەت شارۆچکە بچووکەکانی جیهانی ئیسلامی خاڵی نــەبوون لــەو ســەردەمانەدا لــە نەخۆشــخانەیەك یــان زیــاتر، بــۆ نموونــە شــاری (قورتوبە)ی پایتەختی ئەندەلوس بە تەنها ٥٠ نەخۆشخانەی تێدابووە!.

نەخۆشخانەکان جۆراوجۆر بوون، هەیانبووە تایبەت بووە بــە ســوپاوە کە چەند پزیشکێکی تایبــەتیان هــەبووە، ئەمانــە بێجگــە لــە پزیشــکەکانی خەلیفــە و ســەرکردە و ئــەمیرەکان، هــەروەها نەخۆشــخانەی تایبــەت بــۆ بەندکراوەکان هەبووە کە ڕۆژانــە پزیشــکان دەچــوون ســەریان لێــدەدان و نەخۆشەکانیان بەبوونی دەرمانی پێویست چارەسەر دەکرد.

بنکەی فریاگوزاری خێراش هەبووە کە لە نزیــك مزگەوتــەکان و شــوێنە گشــتییەکاندا دادەنــران کــە قــەرەباڵغی لەســەر بــووە، (المقریـزي) باســی ئــەوەمان بــۆ دەکــات کــە (إبــن طولــون) کاتێــك مزگەوتــە بەناوبانگەکــەی بنیاتنــا لــە (میســر) لــە پشــتەوەیدا شــوێنێکی دروســتکرد کــە کۆگایــەکی دەرمانیشــی هــەبووە و هــەموو جــۆرە دەرمــان و گیراوەیــەکی تێــدابووە و خزمەتکاری هەبووە.

هــەموو ڕۆژێکــی جومعــە پزیشــکێك دادەنیشــت بــۆ چارەســەرکردنی نەخۆشەکانی نێوان نوێژ خوێنەکان.

هەروەها نەخۆشخانەی گشتیش هەبووە کە دەرگاکانی کراوە بوون بۆ چارەسەری هەموو خەڵکی، و دابەش کرابوون بۆ ٢ بەش: بەشێکی تایبەت بە پیاوان و بەشێك بۆ ئافرەتان، هەر بەشێکیان چەندین هۆڵی تێدابووە کە تایبەت بوون بەجۆرێکی نەخۆشی، لەوانە: بەشی نەخۆشییە هەناوییەکان و چاو و نەشتەرگەری و شکاوی و ئێسك گرتنەوە و هەروەها بۆ نەخۆشییە دەروونییەکانیش.

بەشی هەناوی دابەشکرابوو بۆ چەند ژوورێك بۆ نەخۆشییە درمەکان و سکچوون و غەیری ئەمانە.... هەموو بەشێك چەند پزیشکێکی هەبووە کە بەرپرسێکیان هەبووە، واتە: بەرپرسێك بۆ بەشی هەناوی و یەکێکی تر بۆ بەشی نەشتەرگەری و شکاوی و یەکێکی تر بۆ بەشی چاو، سەرۆکی پزیشکانی نەخۆشخانەش پێیدەووترا (ساعور) و پزیشکەکانیش بە نۆرە کاریان دەکرد کە هەر پزیشکێك کاتێکی دیاری کراوی هەبووە و بەسەر ئەو هۆڵانەدا دەگەڕا کە چارەسەری نەخۆشەکانی تێدا دەکرد، لە هەموو نەخۆشخانەیەکیشدا ژمارەیەك فەڕاش و کارگوزار هەبوون لە پیاوان و ئافرەتان و هەروەها پەرستار و یارمەتیدەریش هەبوون، کە هەریەکێکیان مووچەیەکی باشی دیاری کراوی هەبووە.

هەموو نەخۆشخانەیەك دەرمانخانەیەکی خۆی هەبووە کە پێی ووتراوە (خزانة الشراب) و چەندین جۆر گیراوە و دەرمانە بەهێزەکانی تێدا بووە کە لە شوێنی تر نەبوون.

هەروەها ئامێرە نەشتەرگەرییەکان و دەفری شووشەیی جۆراوجۆر و غەیری ئەمانیشی تێدابووە کە لە شوێنی تر نەبووە مەگەر لە گەنجینەی پاشاکاندا نەبێت!.

نەخۆشـخانەکان هـەروەها پەیمانگایـەکی پزیشـکیش بـوون، کـە لـە هـەموو نەخۆشـخانەیەکدا هـۆڵێکی گـەورەی وانـە ووتنـەوە هـەبووە کـە سەرۆکی پزیشکان لەگەڵ پزیشکەکانی تـر و قوتابییەکانیانـدا دادەنیشـتن و لەملاولایانـدا کتێبـەکان و ئامێرە پزیشـکییەکان هـەبوون، قوتابییـەکان لەبەردەمی مامۆستاکەیاندا دادەنیشـتن دوای ئـەوەی کـە سـەریاندەدا لـە نەخۆشـەکان و چارەسـەریان دەکـردن، پاشـان دەسـتیاندەکرد بـە لێکۆڵینەوە پزیشکییەکانیان و گفتوگۆ لـەنێوان مامۆسـتا و قوتابییەکانـدا دەسـتی پێـدەکرد، هـەروەها کتێبـە پزیشکییەکانیشـیان دەخوێنـدەوە، زۆرجار مامۆستا قوتابییەکانی لەگەڵ خۆی دەبـرد بـۆ نـاو نەخۆشـخانەکە بـۆ ئەنجامـدانی وانـە پراکتیکـی و کردارییـەکان بـۆ قوتابییـەکانی لەسـەر نەخۆشـەکان، هـەروەك چـۆن ئـەمڕۆ هـەمان شـت دەکرێـت لـەو نەخۆشخانانەی سەر بە کۆلیجە پزیشکییەکانن.

پزیشـك (إبـن أبـي أصـيبعة) کـە لـە بیمارسـتانی نـوری لـە دیمەشـق پزیشـکی خوێنـدبوو دەڵێـت: {دوای ئـەوەی کـە هـەردوو پزیشـك (مهـذب الـدين و عمـران) تـەواو دەبـوون لـە چارەسـەری نەخۆشـەکانی نـاو بیمارستانەکە کە منیش لەگەڵیان بـوون، دەچـووم لەگـەڵ پزیشـك (رضـي الـدين الـرحبي) دادەنیشـتم و لێیـەوە فێـری چـۆنێتی دۆزینـەوەی نەخۆشـییەکان دەبـووم و ئـەو شـتانەی بـۆ نەخۆشـەکانی دەنووسـی، و لەگەڵیـدا گفتوگۆمـان دەکـرد دەربـارەی زۆرێـك لـە نەخۆشـی و چارەسەرەکانیان} .

رێگە نـەدەدرا بـە پزیشـك بـەوەی کـە بـە تـەنها چارەسـەری نـەخۆش بکـات تـاوەکو تاقیکردنەوەیـەکی ئـەنجام نەدایـە لەبـەردەم گـەورەی

پزیشکانی وولاتدا، نامەیەکی پێشکەش دەکرد لەو بەشەدا کە دەیویست مۆڵەتی لەسەر وەرگرێت کە لە نووسینی خۆی یان وەرگێراو لە نووسینی گەورە زانایەکی بواری پزیشکی دەبوو و خۆی هەڵدەستا بە شەرح کردن و لێکۆڵینەوەی، ئیتر گەورەی پزیشکان تاقیدەکردەوە و پرسیاری لێدەکرد لە هەموو شتێك لەو بوارەدا، ئەگەر باش وەلامی بدایەتەوە ئەوا مۆڵەتی دەدایە بۆ مومارەسە کردنی پیشەی پزیشکی، لەسەردەمی خەلیفەی عەبباسی (المقتدر)دا وا رێکەوت کە هەندێك پزیشك هەڵەیان کرد لە چارەسەری نەخۆشێکدا و نەخۆشەکە مرد، ئەوەبوو خەلیفە فەرمانی کرد کە هەموو پزیشکەکانی بەغدا تاقیکردنەوەیان سەرلەنوێ بۆ بکرێتەوە، ئەوەبوو (سنان بن ثابت) کە گەورەی پزیشکەکانی بەغدا بوو تاقیکردنەوەی بۆ کردن.

پزیشکان ژمارەیان تەنها لە شاری بەغدایا زیاتر بوو لە ٨٦٠ پزیشك، ئەمە بێجگە لەو پزیشکە ناسراوانەی کە تاقینەکرانەوە و بێجگە لە پزیشکەکانی خەلیفە و وەزیرەکان و کاربەدەستەکانیش!.

لێرەدا ئەوەمان لەیاد نەچێت باسی ئەوە بکەین کە هەموو نەخۆشخانەیەك کتێبخانەیەکی ئاوەدانی تێدابووە بە کتێبە پزیشکییەکان و هی تریش کە مامۆستایان و قوتابیان پێویستییان پێدەبوو، تەنانەت دەڵێن لە نەخۆشخانەی (إبن طولون)دا لە میسر کتێبخانەیەك هەبووە کە زیاد لە ١٠٠ هەزار بەرگ کتێبی تێدابووە لە هەموو زانستەکاندا.

یاسای داخڵبوون لە نەخۆشخانە بەخۆڕایی بووە بۆ هەمووان کە جیاوازی لەنێوان دەوڵەمەند و هەژار و دوور و نزیك نەبووە، سەرەتا نەخۆشەکان لە هۆڵە دەرەکییەکە دەپشکنران، ئەوەی کە نەخۆشییەکی

سووکی هەبوویێت دەرمانی بۆ دەنووسرا و لە دەرمانخانەی نەخۆشخانە وەریدەگرت و دەڕۆی، ئەوانەشی کە حاڵەتەکانیان پێویستی بە داخڵبوونی نەخۆشخانە بکردایە ناوی تۆمار دەکرا و دەبرا بۆ حەمام و جلەکانی دادەنا و لە شوێنێکی تایبەت بۆی هەڵدەگیرا، پاشان قاتێك جل و جێگەیەکی راخراوی چاکی دەدرایە، دوایی ئەو دەرمانەی پێدەدرا کە لەلایەن پزیشکەوە بۆی نوسرابوو و خواردنێکی دەدرایە کە لەگەڵ باری تەندروستیدا بگونجێت، بەو ئەندازەیەی کە پێویستێتی.

کاتێك دەچووە باری چاکبوونەوەوە دەخرایە ئەو هۆڵەی بۆ چاکبووەکان تەرخان دەکرا، کاتێکیش تەواو چاك دەبوویەوە قاتێك جلی نوێی دەدرایە لەگەڵ بڕێك پارە کە بەشی بکات تا ئەو کاتەی توانای کارکردنی دەبێت.

ژوورەکانی نەخۆشخانەکان پاك وخاوێن بوون و ئاوی پێدا ڕۆیشتووە و هۆڵەکانی بە باشترین ئەساس و ناوماڵ ڕێکخراوە، هەموو نەخۆشخانەیەکیش پشکنەری پاك وخاوێنی هەبووە لەگەڵ چاودێرانی دارایی، زۆر جاریش خەلیفە یان کاربەدەستەکە خۆی هەستاوە بە سەردانی نەخۆشەکان و سەرپەرشتی مامەڵەی باش ومرۆییانەی لەگەڵیان کردووە.

ئەمانە ئەو یاسایانە بوون کە لەهەموو نەخۆشخانەکانی جیهانی ئیسلامیدا جێبەجێدەکران، جا لە ڕۆژهەلات یان لە ڕۆژئاوا بووبن، لەهەموو نەخۆشخانەکانی بەغدا ودیمەشق و قاهیرە ومەککە ومەدینە ومەغریب وئەندەلوسدا، لێرەدا لەم باسەماندا باسی ٤ نەخۆشخانەی ٤ شاری پایتەختی ئیسلامی لەو سەردەمانەدا دەکەین وەك نموونە:

یەکەم: نەخۆشخانەی (العضدي) لە بەغدا:

کە (عضد الدولة بن بویة) لە ساڵی (٣٧١ك) دروستی کرد ئەویش پاش ئەوەی کە پزیشکی بەناوبانگ (الرازي) شوێنەکەی هەڵبژارد بەوەی کە ٤ پارچە گۆشتی بەشەو لە ٤ لای شاری بەغدا دانا و بۆ ڕۆژی دوایی لەو شوێنەی کە باشترین پارچە گۆشتی لێمابووەوە بڕیاری دروستکردنی نەخۆشخانەکەیاندا، ئیتر نەخۆشخانەکە دروستکرا و پارەیەکی ئێجگار زۆری تێدا سەرفکرا و ٢٤ پزیشکی بۆ کۆکردەوە، پاشان هەرچی پێویست بوو لە کتێبخانەیەکی زانستی و دەرمانخانە و چێشتخانە و مەخزەن بۆی دروستکرا، ساڵی (٤٤٩ك) خەلیفە (القائم بأمر الله) نەخۆشخانەکەی نوێ کردەوە و چەندین دەرمان و گیراوەی دەگمەنی بۆ کۆکردەوە کە دەستکەوتنیان لە شوێنی تر زەحمەت بوو.

دووەم: نەخۆشخانەی (نوری) گەورە لە دیمەشق:

سوڵتان (الملك العادل نورالدین زنكي) لە ساڵی (٥٤٩ك-١١٥٤ز) دروستیکرد لە پارەیەك کە وەك فیدیە لە یەکێك لە پاشاکانی خاچپەرستان وەریگرت، کاتێك دروستکرا یەکێك بوو لە باشترین نەخۆشخانەکانی هەموو جیهانی ئیسلامی، وەك مەرج بۆ هەژار و کەمدەرامەتەکان دروستیکرد، کاتێکیش کە دەوڵەمەندان پێویستییان بە دەرمانەکانی بووایە دەیاندرایە، دەرمان و چارەسەر بەخۆڕایی بووە بۆ هەموو نەخۆشێك کە بۆی دەچوو، ئەم نەخۆشخانەیە بەردەوام بوو لە کارە گەورەکەی تا ساڵی (١٣١٧ك)، کە پاشان نەخۆشخانەی (الغرباء) دروستکرا کە ئەو نەخۆشخانەیە لەمڕۆدا کۆلیجی پزیشکی زانکۆی

سوریا سەرپەرشتی دەکات، ئیتر نەخۆشخانەی (نوری) داخرا و دوایی وەك قوتابخانەیەکی ئەهلی بەکارهێنرا.

### سێیەم: نەخۆشخانەی (المنصوري) گەورە:

کە بە بیمارستانی (قەلاوون) ناسراوە، پێشتر ماڵی یەکێك بووە لە ئەمیرەکان کە دواتر پاشا (المنصور سیف الدین قلاوون) کردی بە نەخۆشخانە لە ساڵی (٦٨٣ك-١٣٠٨ز)دا و وەقفی بۆ دانا بە ئەندازەی ١٠٠ هەزار درهەم لە ساڵێکدا، پاشان مزگەوتێك و قوتابخانەیەك و لانەیەکی هەتیوانی بۆ زیادکرد، ئەم نەخۆشخانەیە هەستا بە ئەنجامدانی کارە مرۆییە بەرزەکەی بەشێوەیەك ئەو پزیشکی چاوانەی کە تێیدا کاریان کردووە باسی ئەوەیان کردووە کە رۆژانە ئەو نەخۆشانەی کە داخڵدەبوون و ئەوانەی کە دەردەچوون لە ٤٠٠٠ کەس تێدەپەڕین!

هەموو کەسێکیش کە دەردەچوو و چاك دەبوویەوە لە نەخۆشییەکەی پۆشاکێکی نوێ و چەند درهەمێکی دەدرایە بۆ ئەوەی ناچاری کاری قورس نەبێت یەکسەر دوای دەرچوونی، لە ناوازەترین تایبەتمەندییەکانی ئەوەبووە کە دەبوو خواردنی هەرنەخۆشێك لە دەفرێکی تایبەتی داپۆشراودا بۆی ببرێت بەبێ ئەوەی کە نەخۆشێکی تر بەکاری بهێنێت.

### چوارەم: نەخۆشخانەی مەراکیش:

کە پاشای موەحیدی (المنصور أبو یوسف) دروستی کرد، گۆڕەپانێکی گەورەی لە باشترین شوێنی مەراکیشدا هەڵبژارد و فەرمانی کرد بە بنیاتنەرەکان کە بە باشترین شێوە دروستیکەن و لە هەموو

دارێکی بەردار و بۆنداری تێدا بڕوێنرێت، پاشان ئاویان بۆ راکێشا کە بەناو هەموو بەشەکانیدا دەڕۆی، بێجگە لە چوار حەوزی گەورەی ئاویش، پاشان فەرمانی کرد کە راخەر و ناومالّی نایابی بۆ دابین بکەن لە خوری و کەتان و ئاوریشم و غەیری ئەمانە، چەندین دەرمانسازی تێدا دامەزراند بۆ دروستکردنی دەرمانەکان و گیراوەکان و کلەکان، بۆ نەخۆش پۆشاکی رۆژ و شەوی بۆ دیاریکرا بۆ زستان و هاوینیش، کاتێك نەخۆش چاك دەبوویەوە ئەگەر هەژار بوایە کە دەردەچوو پارەیەکی دەدرایە بۆ ئەوەی پێی بژی تا دەکەوێتەوە سەر کار، ئەم نەخۆشخانەیە تایبەت نەبوو بە هەژارانەوە بەڵکو هەر کەسێك لە مەراکیش نەخۆش بکەوتایە بۆی دەبرا و چارەسەر دەکرا تا ئەوەی کە چاك دەبوویەوە یان دەمرد، پاشا خۆی هەموو جومعەیەك سەردانی دەکرد و هەواڵی نەخۆشەکانی دەپرسی و دەربارەی مامەڵەی پزیشکەکان و پەرستارەکان پرسیاری لێدەکردن.

ئەمانە بریتی بوون لە ٤ نموونە لە سەدان نەخۆشخانە کە لە رۆژهەڵات و رۆژئاوای جیهانی ئیسلامیدا بڵاوبووبوونەوە، لە سەردەمێکدا کە ئەورووپا لە تاریکی و نەزانیدا نوقم بووبوون و دەربارەی ئەم نەخۆشخانانە و ووردەکاری و پاکیان و بەرزیی سۆزی مرۆیی تیایاندا هیچی نەدەزانی، ئێستاش بابچینە سەر ووتەکانی رۆژهەڵاتناسی ئەڵمانی (ماکس مایەرهۆف) کە دەربارەی نەخۆشخانەکانی ئەورووپا دەدوێت لەو سەردەمەی کە نەخۆشخانەکانی شارستانێتی ئێمە بەو شێوەیە بوون کە وەسفمان کردن، (د. ماکس) دەڵێت:

(نەخۆشخانە ئیسلامییەکان و سیستمی تەندروستی لە وولاتە ئیسلامییەکان لە کۆندا ئێستا وانەیەکی توند و سەختمان فێردەکەن، کە

به تەواوەتی قەدر و ڕێزی نازانین تەنها دوای ئەنجامدانی بەراوردێکی سادە نەبێت لەگەڵ نەخۆشخانەکانی ئەورووپا لەو کاتەدا).

زیاد لە ٣ سەدە زیاتر بەسەر ئەورووپادا رۆی لەو کاتەی موسوڵمانانەوە پێش ئەوەی کە نەخۆشخانە گشتییەکان مانای خۆیان هەبێت، و زیادڕەوی ناکەین ئەگەر بڵێین کە تا سەدەی هەژدەیەمیش (١٧١٠ن) نەخۆشەکان تەنها لە ماڵەکانی خۆیاندا چارەسەر دەکران یان لە چەند خانوویەکی بچووکدا، کە نەخۆشخانەکان لەم کاتەدا بریتی بوون لە خانووی بێلانەکان و شوێنی خێرکردن، باشترین نموونەش بریتییە لە نەخۆشخانەی (ئۆتێل دیۆ) لە پاریس کە گەورەترین نەخۆشخانەکانی ئەورووپا بووە لەو سەردەمەدا، هەریەك لە (ماکس توردو و تینون) بەم جۆرە باسی دەکەن:

(نەخۆشخانەکە ١٢٠٠ جێگەی تێدایە، کە ٤٨٦ دانەی یەك نەفەرییە، و باقییەکەی کە پانی هەریەکێکیان لە ٥پێ تێنەدەپەڕی لەنێوان ٣-٦ کەسی لەسەر دەنووست، هۆڵە گەورەکان بۆگەن و شێدار بوون و دەرکەی هەواگۆڕکێیان نەبووە، هەمیشە تاریك بوون، لەهەموو کاتێکدا نزیکەی ٨٠٠ نەخۆشت دەبینی کە لەسەر زەوییەکە و بەسەر یەکدا نوستوون یان لەسەر گلۆڵەیەك کا و لە حاڵەتێکی رەزیلیدان.

دەبینیت لەسەر جێگە مامناوەندییەکان ٤ یان ٥ یان ٦ نەخۆش لەپاڵ یەکدا راکشاون کە قاچی یەکێکیان بەسەری ئەوی تریانەوەیە، دەبینیت منداڵ لەپاڵ پیر وپەککەوتەدایە و ئافرەت لەپاڵ پیاودایە، لەوانەیە باوەڕ نەکەیت کە بڵێین ئافرەت دەبینیت لەکاتی منداڵبووندا لەسەر یەك جێگا راکشابوو لەگەڵ منداڵێکدا کە بە ئازاری ناوسکەوە

دەتلایەوە و هەردووکیان تا گری تێبەردابوون، ئەم دووانە لەپاڵ کەسێکدان کە تووشی نەخۆش پێست بووە و بەردەوام خۆی دەخورێنێت بەنینۆکە خوێناوییەکانی و کێمی دومەڵەکانی دەڕژێت بەسەر پەردەی جێگاکەدا!

خواردنی نەخۆشەکان لەپیسترین جۆرێك بووە کە عەقڵ تەصەوری بکات و بە بڕێکی زۆر کەم بەسەریاندا دابەشدەکرا و لە چەند کاتێکی دوور لەیەکدا و بەبێ خشتە، راهیبە ئافرەتەکان عادەتیان بووە کە خاتری نەخۆشە گوێڕایەڵ و دووڕووەکان بگرن لەسەر حیسابی نەخۆشەکانی تر، و دەچوون مەییان دەرخوارد دەدان و شیرینی و خواردنی چەوریان دەدانێ لەوانەی کە خێرخوازان وەك چاکە دەیاندا بە نەخۆشخانەکە، ئەمە لەکاتێکدا کە زۆر پێویستییان بە ریجیم و خواردن کەمکردنەوە هەیە، ئەمانە دەبووە هۆی ئەوەی هەندێکیان بە زۆرخۆری بمرن و هەندێکی تریان لەبرسا.

دەرگای نەخۆشخانەکە هەمیشە کراوە بووە بۆ هەموو هاتووچۆکەرێك! کە بەهۆی ئەمەوە درمەکان بڵاودەبوونەوە، هەروەها لەرێی پاشەڕۆ و هەوای پیسیشەوە، ئەگەر چاکەکاران یارمەتییان نەدانایە ئەوا نەخۆشەکان لەبرسانا دەمردن، یان هەندێك جار بە زۆرخۆری و شەکرە دەمردن، جێگەکان پڕبوون لە مێرووە مشەخۆرەکان و هەوای ژوورەکان لە بۆگەنیدا تەحەممول نەدەکرا، تەنانەت خزمەتکار و پەرستارەکان نەیاندەوێرا بچنە ناو ژوورەکانەوە تا لووتیان بە پەڕۆیەکی تەڕکراو بەسرکە دانەپۆشییایە، لاشەی مردووەکان بە لایەنی کەمەوە ٢٤ سەعات لەسەر جێگەکان دەمانەوە پێش ئەوەی کە لابرێن، زۆر جاریش

لاشەکە شیدەبووەوە و بۆگەنی دەکرد لەپاڵ نەخۆشێکی تردا کە خەریك بوو شێت دەبوو! !).

ئەمە بەراوردێکی سادە بوو لەنێوان بارودۆخی نەخۆشخانەکان لە شارستانێتی ئێمەدا و بارودۆخیان لەلای ڕۆژئاواییەکان لەو سەردەمانەدا، کە بەڵگەیە لەسەر ئەو دواکەوتنە زانستییەی خەڵکی ئەورووپا لەسەری بوون، و نەزانی ئاشکرایان بە بنەماکانی نەخۆشخانەکان و بگرە بە یاساکانی پاراستنی تەندروستی گشتیش بەشێوەیەکی گشتی.

کۆتایی ئەم بەشەمان بەم ئاکامانە دەهێنین کە پێمان خۆشە سەرنجیان بۆ ڕاکێشین: ئێمە لە شارستانییەتماندا لەپێش ئەورووپییەکانەوە بووین بە ٩ سەدە لە ڕێکخستنی نەخۆشخانەکاندا، و نەخۆشخانەکانی ئێمە لەسەر بناغەی سۆزێکی مرۆییانەی بەرز دامەزرا بوو کە لە مێژوودا وێنەی نییە، تەنانەت تا ئەمڕۆش ڕۆژئاواییەکان نایزانن، ئێمە لەپێشترینی میللەتەکان بووین لە زانینی کاریگەریی مۆسیقا و ئەدەب و پێکەنین و ئاماژە دەروونییەکان لە چارەسەری نەخۆشییەکاندا، ئێمە لە هاوسۆزی و هاوکاری کۆمەڵایەتیدا گەیشتینە ئاستێك کە تا ئەمڕۆش شارتانێتی ڕۆژئاوا پێی نەگەیشتووە کاتێك کە پزیشکی و چارەسەر و خۆراك بۆ نەخۆشەکان بەخۆڕایی بووە، و بگرە کە کاتێك نەخۆشەکە چاك دەبووەوە ئەوەندە پارەی دەدرایە بۆ ئەوەی بتوانێت خەرجی خۆی بکات تا دەکەوێتەوە سەر کار.

ئەمە پاڵنەرێکی مرۆیی بووە کە تێیدا ئێمە گەیشتینە لوتکە کاتێك ئاڵای شارستانییەتمان بەدەستەوە بوو، ئەی ئایا ئەمڕۆ ئێمە لەکوێین و ئەو ڕۆژئاواییانەش لەکوێ! ؟

## کتێبخانە گشتی و تایبەتییەکان:

لەوەی کە پەیوەندی هەیە بە دەزگا زانستی و خێرخوازییەکان لە شارستانێتی ئێمەدا بریتییە لە باسکردنی کتێبخانەکان، کە بریتی بوون لە قوتابخانەیەکی فێرکردن و چەند دەزگایەك کە کاربەدەستان و دەوڵەمەندان و زانایان مەسرەفیان دەکێشا، ئەمەش بە مەبەستی بڵاوبوونەوەی زانست لەنێوان خەڵکیدا بە تایبەتی لەو سەردەمانەدا کە چاپکردن بوونی نەبووە و کتێبەکان تەنها بەهۆی بەدەست نووسینەوە لەلایەن خەڵکانی تایبەتەوە کۆپی دەکران، بەم شێوەیە نرخی کتێبەکان دەگەیشتە ئاستێك کە زەحمەت بوو قوتابیانی زانست و زانا هەژارەکان بتوانن بیانکڕن، ئیتر چۆن دەیتوانی ئەگەر بیویستایە کە کۆمەڵێك کتێبی هەبێت لەو زانستەی کە دەیویست تێیدا پسپۆڕ بێت؟ لێرەوە دەبینین کە دروستکردنی کتێبخانە گشتییەکان لە کۆمەڵگای ئێمەدا لە کۆندا پاڵنەرێکی مرۆیی هەبووە سەرەتا و پاشان پاڵنەرێکی زانستیش پێکەوە.

لەوانەیە ئەدەبی عەرەبی بریتی بێت لە دەوڵەمەندترین ئەدەبیاتەکانی جیهان دەربارەی هەڵدان و گۆرانی ووتن بەسەر کتێبدا و خۆشویستنی و حەزکردن بۆ قسەکردن دەربارەی، زانا (أحمد بن إسماعیل) دەڵێت: (کتێب بریتییە لەو هاودەمەی کە دەسپێشخەری دەکات لەکاتی بێئیشیدا، و بانگت ناکات لەکاتی سەرقاڵیتدا، و داوات لێناکات خۆتی بۆ رێك وجوان بکەیت، و بریتییە لەو هاوەڵەی کە وەسفت ناکات، و لەو نزیکەی کە لە خشتەت نابات، وئەو هاودەمەی کە هەرگیز لێت بێزار نابێت، و لەو ئامۆژگاریکەرەی کە هەرگیز زەلیل و سەرشۆڕت ناکات)، لێرەوە موسوڵمانان خوێندنەوەی کتێبیان پێباشتر بووە لەچوون بۆ کۆڕ

و کۆبوونەوەکان، و نزیکی ئەمانیان پێخۆشتربووە لە نزیکی خەلیفە و کاربەدەستەکانیش، بەم گیانە زانستییەوە زانایان و دەوڵەمەندان و کاربەدەستانمان خولیای کتێبەکان و کۆکردنەوەیان بوون، تەنانەت بەلاّ و ناخۆشی ماڵییان پێخۆشتر بووە لە فەوتان ولەدەستدانی کتێبەکانیان.

جارێك کۆمەڵێك سەرباز هێرشیان کردە سەر ماڵی وەزیر (إبن العميد) و بەسەر پاسەوانەکانیدا سەرکەوتن و هەموو گەنجینە و ماڵەکەیان بۆ تالاّن کرد، کە تەنانەت کاتێك گەڕایەوە شتێکی دەستنەکەوت کە لەسەری دابنیشێت یان ئاوی تێدا بخواتەوە! بەلاّم دڵی زیاتر لەلای کتێبەکانی بوو کە لە هەموو شتێك زیاتر لای خۆشەویست بوون، و ژمارەیان زۆر زۆربوو و لە هەموو زانستەکان و بوارەکانی ئەدەبدا بوون و بە باری ۱۰۰ ووشتر زیاتر هەڵدەگیران، کاتێك (إبن العميد) بەرپرسی کتێبخانەکەی بینی هەواڵی لێپرسی، ئەویش ووتی: وەك خۆیان ماون و کەس دەستکاری نەکردووە، ئیتر زۆری پێخۆش بوو و ئیسراحەتی کرد و پێیووت: شایەتی دەدەم کە تۆ کەسێکی باوەڕپێکراو و دڵسۆزی، هەموو گەنجینەکانی تر قەرەبوو دەکرێنەوە، تەنها ئەم کتێبخانەیە کە قەرەبوو نابێتەوە.

بەم گیانە زانستییەوە بوو کە موسوڵمانان پێشبڕکێیان دەکرد لە کڕینی نوسراوە زانستییەکان لە نوسەرەکانیان پاش تەواوبوون لە نووسینیان، (الحكم)ی ئەمیری ئەندەلوس بیستی کتێبی (الأغاني) تەواو بووە، هەربۆیە یەکسەر ۱۰۰۰ دیناری نارد بۆ (أبوالفرج الأصفهاني)ی نووسەرەکەی بۆ ئەوەی نوسخەیەکی بۆ بنێرێت، ئەویش نوسخەیەکی کتێبەکەی بۆ نارد و لە ئەندەلوس کتێبەکە خوێندرایەوە پێش ئەوەی لە عێراق (کە نووسەرەکەی لێدادەنیشت) بخوێنرێتەوە، هەر لەم گیانە

زانستییەوە بوو کە کتێبخانەکان لە هەموو لایەکی جیهانی ئیسلامیدا بڵاوبوونەوە، بەدەگمەن هەبووە قوتابخانەیەك کتێبخانەیەکی گشتی لەپاڵەوە نەبووبێت، بەدەگمەن دێیە بچووکەکانیش کتێبخانەیان نەبووە، ئەوە ئەگەر سەیری شارەکان و پایتەختەکانمان بکردایە ئەوا پڕبوون لە کتێبخانەکان بەشێوەیەك کە وێنەی نەبووە لە مێژووی چاخەکانی ناوەڕاستدا.

کتێبخانەکان ٢ جۆری سەرەکی بوون: گشتی و تایبەتی، کتێبخانە گشتییەکان لەلایەن خەلیفە و ئەمیرەکان و زانایان و دەوڵەمەندەکانەوە بنیات دەنران، بینای تایبەتییان بۆ دروست دەکرا، کە زۆرجار دەکران بەهاوپێچی مزگەوتەکان و قوتابخانە گەورەکان، بینا تایبەتییەکانی قوتابخانەکان بریتی بوون لە چەندین ژوور کە چەند هۆڵێکی فراوان پێکییەوە دەبەستنەوە، کتێبەکان لەسەر رەفەی جێگیرکراو بەدیوارەکەوە دادەنران، کە هەر ژوورێك بۆ زانستێکی تایبەتی دادەنرا، بۆ کتێبەکانی فیقە ژوورێك و بۆ پزیشکی ژوورێك و بۆ ئەدەب ژوورێك و بەم شێوەیە، هۆڵی تایبەتی تێدابووە بۆ خوێندنەوە، لەگەڵ چەند ژوورێك بۆ نووسەرەوەکان بۆ کۆپی کردنی کتێبەکان، لە هەندێکیاندا ژووری مۆسیقاش هەبووە کە خوێنەران بۆ پشوو وەرگرتن بۆی دەچوون کە ئەمە ناوازە بووە لە شارستانێتی ئێمەدا.

هەروەها ژووری تێدابووە بۆ فێربوون و گفتوگۆی زانستی لەنێوان سەردانیکەرانی کتێبخانەکاندا، هەموویان بە راخەر و ناوماڵ و ئەساسێکی ئیسراحەت و فەخم دەڕازێنرانەوە، لە هەندێك کتێبخانەدا چێشتخانەش هەبووە لەگەڵ ژوور بۆ مانەوەی غەریبەکان، هەروەك ئەوەی دەربارەی کتێبخانەکەی (علي بن يحيى المنجم) ووتراوە، کە کۆشکێکی گەورەی

هەبووە لە دێیەكی نزیك بەغدا و كتێبخانەیەكی مەزنی هەبووە كە ناوی ناوە (خزانة الحكمة)، كە خەڵكی لە هەموو لایەكەوە بۆی دەچوون و لەوێ دەمانەوە و جۆرەكانی زانستیان وەردەگرت، كتێبەكان لەبەردەستیاندا بووە و مەسرەفی باشیان بۆ كراوە كە هەمووی لە پارەی (علي بن يحيى) خۆی بووە، لەمەش سەیرتر نموونەی وامان هەیە كە ئەمڕۆش شتی وەهامان نەبیستووە لە پێشكەوتووترین پایتەختەكانی شارستانێتی ڕۆژئاوادا، لە شاری موسڵ خانوویەك هەبووە كە (أبوالقاسم جعفر بن حمدان الموصلي) دروستی كردووە و ناویناوە خانووی زانست (دار العلم) كە كتێبخانەیەكی هەموو زانستەكانی تێدا بووە و وەقف بووە لەسەر قوتابیانی زانست و كەس ڕێی لێنەدەگیرا لە چوونە ژوورەوەی، ئەگەر كەسێكی غەریب بهاتایە بۆ زانست ئەوا كتێب و پارەشی دەدرایە، هەموو ڕۆژێكیش دەكرایەوە، باشە تا ئێستا شتی واتان بیستووە لە كتێبخانەیەكی (لەندەن) یان (واشنتۆن) یان پایتەختێكی ناسراوی تر كە ئەدەب و زانست و پارەش بدات بە قوتابیانی زانست؟!..

كتێبخانە گشتییەكان چەندین فەرمانبەریان هەبووە كە لێپرسراوێكیان هەبووە و هەمیشە یەكێك بووە لە ناسراوترین زانایانی سەردەمی خۆی، هەروەها كەسانێك كە كتێبیان دەدا بە خوێنەران و وەرگێڕەكانیش كە كتێبە ناعەرەبییەكانیان دەگۆڕی بۆ زمانی عەرەبی، و چەندین خەتخۆش كە بە خەتە خۆشەكانیان كتێبەكانیان دەنووسییەوە و كۆپییان دەكردن، و هەروەها بەرگتێكگریش كە كتێبەكانیان تەجلید دەكرد بۆ پاراستنیان لە فەوتان، ئەمانە بێجگە لە كارگوزارەكان كە كتێبخانەكە پێویستی بوو، بۆ هەموو كتێبخانەیەكی گەورە و بچووكیش پێڕست هەبووە بە هەموو كتێبەكانی بۆ ئاسان دۆزینەوەیان، كە بەپێی

لقـەکانی زانسـت ڕێکخرابـوون، لـەپاڵ هـەر دۆلابێکـی کتێبیشـدا لیسـتێك هەبووە کە ناوەکـانی کتێبـەکانی تێـدابووە، ئـەوەش ناسـراوە لـە یاسـای کتێبخانەکاندا کە ئیستیعارەی دەرەکی هەبووە بۆ هەموو خـەڵك بەرامبـەر بـــە بارمتەیـــەك، بـــەلام زانایـــان و ناســـراوان هـــیچ بارمتەیـــەکیان لێوەرنەدەگیرا[140].

سەرچاوە داراییەکانی کە خەرجی کتێبخانەکانی دابین دەکرد یان لـەو وەقفانـەوە بـووە کـە بـۆی کـراون وەك لـە زوربـەی کتێبخانەکانـدا، یـان لەلایـەن ئـەو کاربەدەسـتان و زانایـان و دەوڵەمەندانـەوە کـە دروسـتیان دەکرد خەرجی بۆ دابیندەکرا، ووتراوە کـە خـەرجی (محمـد بـن عبـدالملك الزيات) بۆ کتێبخانەکەی مانگی ۲۰۰۰ دینـار بـووە، خەلیفـە (المـأمون)یش بە کێشی کتێبەکان ئاڵتونی دەدا بە (حنين بن أسحق) بۆ هەر کتێبێـك کـە وەریدەگێڕا بۆ زمانی عەرەبی، با ئێستاش هەندێك نموونە بهێنینـەوە لـەو کتێبخانە گشتی و تایبەتییانەی کە لە مێژووی ئێمەدا بەناوبانگ بوون:

## بەناوبانگترین کتێبخانەکان:

کتێبخانەی خەلیفە فاتیمییەکان لە قـاهیرە: زۆر سەرسـوڕهێنەر بـووە بـەو موصـحەف و کتێبـە نایابانـەی لەخۆی گرتبـوو، ژمـارەی کتێبـەکانی وەك زۆرێـك لـە مێژوونوسـان دەڵـێن گەیشـتە ۲ ملیـۆن کتێـب، لەگـەڵ ئەمەشدا کە (المقريزي) بۆ ئەوە دەچێت کـە ملیۆنێـك و ٦٠٠ هـەزار کتێـب بووە !!!

---

[140] (یاقوت الحموي) لە کتێبی (معجم البلدان)دا وەسفێکی زۆر باشـی لێپرسـراوانی کتێبخانـە گشتییەکانی شاری (مەرو) دەکات بەوەی کە ڕێیاندا ۲۰۰ بەرگ کتێب بخوازێـت بـەبێ ئـەوەی هیچ بارمتەیەکی لێوەرگرن.

هەروەها کتێبخانەی (دار الحکمة) لە قاهیرە: کە (الحاکم بأمر الله)ی فاتیمی دروستی کرد و لە ١٠ی جومادی دووەمی (٣٩٥ك)دا کرایەوە، ئەوەندەی کتێب تێدا کۆکردەوە کە بۆ هیچ پاشایەکی پێش ئەو کۆنەبووەوە، بەشێوەیەك کە ٤٠ خیزانەی تێدابووە و تەنها یەك خیزانەیان ١٨٠٠٠ کتێبی تێدابووە؟![١٤١].

هەروەها (بیت الحکمة) لە بەغدا: کە (هارون الرشید) دروستی کرد، و لە سەردەمی (المأمون)دا گەیشتە لوتکەی بەرزییەکەی، زۆر لە زانکۆیەك دەچوو کە کتێبی جۆراوجۆری تێدابووە و زانایان بۆ خوێندنەوە و گفتوگۆ و نووسینەوە تێیدا کۆدەبوونەوە، چەندین وەرگێڕ و نووسەرەوەی تێدابووە کە ئەو کتێبانەیان وەردەگێڕا کە (الرشید و المأمون) لە فتوحاتەکانی (ئەنقەرە و عەموریە و قوبروص) دەستیاندەکەوت.

هەروەها کتێبخانەی (الحکم)ی کاربەدەستی ئەمەوی لە ئەندەلوس: کە لەوپەڕی گەورەیی و فراوانیدا بووە و ژمارەی کتێبەکانی وەك دەڵێن گەیشتە ٤٠٠ هەزار بەرگ (یان ٦٠٠ هەزار بەرگ)[١٤٢]، چەندین پێڕستی وورد و ڕێکخراوی هەبووە بەشێوەیەك کە تەنها پێڕستی تایبەت بە دیوانەکانی شیعری کتێبخانەکە گەیشتە ٤٤ بەرگ.

---

[١٤١] هەندێك دەڵێن سەرجەمی کتێبەکانی ئەم کتێبخانەیەش گەیشتە ٢ ملیۆن بەرگ!.

[١٤٢] وەك دەڵێن لە ئەندەلوسدا زیاد لە ٢٠ کتێبخانەی گشتی هەبووە کە ملیۆنەها کتێبیان لەخۆ گرتووە، ئەمە لە کاتێکدا کە گەورەترین کتێبخانەی گشتی لە ئەوروپادا لەو کاتەدا ژمارە کتێبەکانی لە چەند هەزارێك تێنەدەپەڕی، لە دائیرەی مەعاریفی کاسۆلیکی (Catholic Encyclopedia)دا هاتووە کە کتێبخانەی کڵێسای کانتەربەری (Canter bury) کە دەوڵەمەندترین کتێبخانەکانەکانی ئەو سەردەمەی ئەوروپا بووە ١٨٠٠ بەرگ کتێبی تێدابووە لە سەدەی ١٤ی زایینیدا!.

هـەروەها کتێبخانـەی (بـني عمـار) لـە (طـرابلس): کـە نموونەیـەکی گـەورەیی و مـەزنی بـووە، بـە تـەنها ١٨٠ خـەتخۆش و نووسـەرەوەی تێـدابووە کـە کتێبیـان کـۆپی دەکـرد بەدەسـت، و بـە شـەو و بـە ڕۆژ دەگۆڕدران بۆ ئەوەی کە کاری کۆپی کردن تێیدا نەوەستێت[١٤٣].

کتێبخانە تایبەتییەکانیش ئەوەندە زۆر بوون کە مێژوو بە شـانازییەوە باسیان دەکات، لـە هـەموو شـار و شارۆچـکەیەکی ڕۆژهـەڵات و ڕۆژئـاوای جیهانی ئیسلامیدا بڵاوبوون، بەدەگمەن زانایەك هەبووە کە کتێبخانەیـەکی تایبەتی نەبووبێت کە هەزاران بەرگیان تێدابووە، لەوانە:

کتێبخانەی (الفتح بن خاقان) کە زۆر فراوان بـووە، داوای لـە پیـاوێکی هەرە باشی سەردەمی خۆی لە ئەدەب و زانستدا کرد کە بۆی کۆبکاتـەوە کە (علي بن یحیی المنجم) بوو، ئەویش ئەوەندەی کتێب بۆ کۆکردەوە بـە تایبەتی لە بواری مەعریفە و حیکمەتدا کە لە هیچ کتێبخانەیەکی تردا ئـاوا کۆنەبوو بوونەوە، هـەروەها کتێبخانـەی (إبـن الخشـاب) (٥٦٧ك مـردووە) کە لە زاناترین کەسایەتییەکان بـووە لـە نـەحودا و هـەروەها لـەبوارەکانی تەفسـیر و فـەرموودە و مـەنتیق و فەلسەفەشـدا، زۆر خولیـای کتێـب و کۆکردنەوەیان بووە.

هـەروەها کتێبخانـەی (جمـال الـدین القفطـي) (٦٤٦ك مـردووە) کـە ئەوەنـدەی کتێـب کـۆکردەوە کـە وەسـف نـاکرێن، تەنانـەت لـە شـوێنە دوورەکانەوە بۆیان دەهێنـا لەبـەر دەسـتبڵاوی و پاداشـتە زۆرەکـانی، لـە

---

[١٤٣] هەروەها ئەو کتێبخانەیەی (عضـد الدولـة) لـە شـاری شـیراز دروسـتیکرد لـە (٣٦٠) ژوور پێکهاتبوو لەگەڵ مۆڵێکی گـەورە کـە لـە هـەموو لایەکـەوە بـە پـارك و بـاخ و بێسـتان دەورە درابوو !!.

دونیـادا تـەنها کتـێبی خۆشدەویسـت و خـۆی بـۆ تـەرخان کـرد تەنانـەت ژنیشـی نـەهێنا بـۆ ئـەوەی مـاڵ و منـاڵ سـەرقاڵی نەکـەن، کتێبخانەکـەی وەسـیەت کـرد بـۆ (الناصـر) کـە نرخەکـەی گەیشـتە ٥٠ هـەزار دینـار، هەروەها کتێبخانەی (بنو جرادة العلماء) لە شاری حەلەب، یـەکێکیان (کـە ناوی أبوالحسن بن أبي جرادة) بوو (کە ٥٤٨ک مردووە) بە خـەتی خۆشـی خۆی ٣ دۆلابی لە کتێبە نایابەکان بۆ خـۆی نووسـییەوە و یـەك دۆلاب بـۆ باوکی و دۆلابێکی تریش بۆ کوڕەکەی، هـەروەها کتێبخانـەی (الموفـق بـن مطران الدمشقي) (٥٨٧ك مـردووە) کـە هیممـەتێکی گـەورەی هـەبووە لـە کۆکردنەوەی کتێبدا، تەنانـەت کاتێـك کـە مـرد لـە دۆلابەکانیـدا لـە کتێبـە پزیشـکییەکان و غـەیری ئـەمانیش نزیکـەی ١٠٠٠٠ بـەرگی هـەبووە، لـە خزمەتیدا ٣ نووسەرەوە هەبوون کە بەردەوام کتێبیـان بـۆ دەنووسـییەوە و ئەمیش مووچە و ڕۆزی دەدانێ.

ئێمـە کاتێـك کـە دڵخۆشـی دەروونمـان پڕدەکـات بـەوەی کـە ئـا بـەو شـێوەیە کتێـب و کتێبخانـەکان بـڵاو بـوون لـە هـەموو لایـەکی جیهـانی ئیسـلامیدا لـە سـەردەمە زێڕینەکانیـدا، لەهـەمان کاتـدا غـەم و پـەژارە دامانـدەگرێت کاتێـك کـە چارەنووسـی ئـەم کتێبخانانـەمان بـۆ ڕوون دەبێتەوە، وئـەو هەموفەوتانـدن وسـووتاندن و لەناوبردنـەی کـە تووشـی هاتن بەدرێژایی سەدەکان، وبە هـیچ شـێوەیەك ناتوانرێـت ئەنـدازەی ئـەو لەدەستچـوونە گەورەیـەی زانسـت بپێورێـت و قـەرەبوو بکرێتـەوە، کتێبخانەکانمان تووشی چەندین کارەسـات و بـەڵا هـاتن کـە بوونـە هـۆی فەوتانـدنی ملیۆنـەها کتێـب بـۆ هـەتا هەتایـە، کـە بـریتین لـە بـەنرخترین شوێنەوار و پاشماوەی فیکری ئیسلامی لە مێژوودا.

بەڵا و کارەساتی تەتەرەکان کاتێك کە بەغدا یان داگیرکرد پێش هەموو شتێك تووشی ئەم کتێبخانانە بوون، هەموومان دەزانین کە تەتەرە بەربەری و ناشارستانییەکان هەموو کتێبەکانی کتێبخانە گشتییەکانی بەغدایان فڕێدایە ناو رووباری دیجلەوە بەشێوەیەك کە رووبارەکەیان پێپڕکردەوە و سوار دەیتوانی بەسەریاندا لەم رۆخی رووبارەکەوە بپەڕێتەوە بۆ ئەوبەر، ئاوی رووبارەکەش بۆ ماوەی چەندین مانگ بوو بە رەشێکی قەترانی بەهۆی مرەکەبی ئەو کتێبانەی کە فڕێدرابوونە ناوی.

هەروەها کارەساتی داگیرکاریی خاچپەرستانیش بووە هۆی لەناوچوونی بەنرخترین کتێبخانەکانمان لە شارەکانی قودس و تەرابولس و مەعەڕڕە و غەززە و عەسقەلان و غەیری ئەمانیش لەو شارانەی کە کاولیان کردن، تەنها ئەوەندە بەسە کە بزانین هەندێك لە مێژوونووسان بڕی ئەو کتێبانەی کە خاچپەرستەکان تەنها لە شاری تەرابولس لەناویانبردن نزیکەی ٣ ملیۆن بەرگ بوون[١٤٤] !!

نسکۆی دەستبەسەرا گرتنی ئیسپانییەکان بۆ ئەندەلوسیش بووە هۆی لەناوبردنی ئەو کتێبخانە گشتی وتایبەتە مەزنانەی کە مێژوو بە سەرسامییەوە باسیان دەکات! هەموویانیان سووتان بەهۆی کارەکانی قەشە رەگەزپەرستەکانەوە، تەنانەت مێژوونووسان دەڵێن لە ١ رۆژدا و لە گۆڕەپانی شاری غەرناتەدا نزیکەی ١ملیۆن کتێبیان سووتاند!

ئەمە بریتی بوو لە کتێبخانەکانمان لە چاخەکانی شارستانییەتماندا، و ئەوەش چارەنووسیان بووە.

---

[١٤٤] لەناویاندا ٥٠ هەزار نوسخەی قورئانی پیرۆز و تەفسیرەکانی بووە!.

لەگەڵ ئەوەشدا داننان بە چاکەی دوژمنان قورسە بۆ دەروون، بەڵام دەبێت دان بەوەدا بنێین کە کتێبخانەکانی ئەورووپا بوونە هۆی پاراستنی پاشماوەیەکی کەمی ئەم میراتە زانستییەمان لە دانراو وکتێبەکان، تەنانەت ئێستا لە گەوهەری دانراوە عەرەبییەکان ئەوەندە هەیە لە کتێبخانەکانی ئەورووپادا کە زۆریان لە هەموو جیهانی ئیسلامیدا دانەیەکیان نەماوە؟

## کۆڕ و کۆبوونەوە زانستییەکان:

ئەمە بریتییە لە لایەنێکی خۆش لە لایەنەکانی شارستانییەتە گەشەکەمان، کە کاریگەرییەکی گەورەی هەبووە لە بڵاوکردنەوەی رۆشنبیری و برەوپێدانی زانستدا، و لە بەرز کردنەوەی ئاستی کۆمەڵایەتی و زەوقی زانستی لە ناوەندە رۆشنبیرییەکاندا، ئەم مەجلیس و کۆڕ و کۆبوونەوە زانستییانە زۆر بڵاو و جۆراوجۆر بوون لە شارەکان و پایتەختەکانماندا، و رووبەکی پرشنگدار بوون لە رووەکانی رابوونی فیکریی ئوممەتەکەمان لە گەرمەی دەسەڵات و هێزیدا.

هیچ گومانت لەمەدا نامێنێت کاتێك دەبینیت زوربەی توێژەکانی کۆمەڵ لە خەلیفە و کاربەدەستان و زانایان و ئەدیبان و شاعیران لێکۆڵینەوە تایبەتییەکانی خۆیانیان لە کۆبوونەوە تایبەتی و گشتییەکاندا کردبووە مەیدانێکی پێشبڕکێی زانستی و ئەدەبی و فەلسەفی، ئەم ئوممەتەی ئێمە لە تینوێتی و گەرمیدا بۆ زانست و پرۆگرامەکانی گەیشتە ئاستێك کە هەست بە مەزنی و گەورەییەکەی دەکەیت.

ئەم کۆڕ وکۆبوونەوانە زۆر و جۆراوجۆر بوون، بۆ نموونە ئەو کۆڕ وکۆبوونەوانەی کە خەلیفە خۆی سەرۆکایەتی دەکرد و تێیدا بەناوبانگترین زانایان و ئەدیبان و فەقیهان کۆدەبوونەوە، لە سەرەتای ئیسلامدا وەك مەجلیسێکی نوێنەران وابووە کە سەرپەرشتی کارەکانی دەوڵەت و کاربەدەستەکانی لێوەکراوە، پاشان لە سەردەمی ئومەوییەکاندا بوون بە کۆڕی حیکمەت و ئەدەب و شیعر.

پاشان لەسەردەمی عەبباسییەکاندا گەشەی کرد و بریتی بوون لە ناوازەترین کۆڕ و کۆبوونەکان لە جوانی و فەخمیی راخەر و ئەساسەکەی و فراوانییەکەی و زۆریی زانایان و ئەدیبانی، و جۆراوجۆریی بابەت و هونەرەکانیدا، ئەمە بێجگە لە کۆڕە مۆسیقییەکان و گۆرانییەکان، لە ناسراوترین خەلیفە عەبباسییەکان لە فەخمیی و ناوازەیی کۆڕ وکۆبوونەوەکانیان (الرشید والمأمون) بوون، تەنها بەسە ئەوەندە بزانین کە (الرشید) لە مەجلیسەکانیدا ئەمانەی کۆدەکردەوە: لە شاعیرەکان: (أبو نواس وأبوالعتاهیة ودعبل ومسلم بن الولید والعباس بن الأحنف)، و لە فەقیهەکان: (أبویوسف والشافعي ومحمد بن الحسن)، و لەزمانەوانەکانیش: (أبوعبیدة والأصمعي والکسائي)، و لە مێژوونووسانیش: (الواقدي) مێژوونووسی بەناوبانگ، و لە گۆرانیبێژانیش: (إبراهیم الموصلي وإسحاقی کوڕی).

خەلیفە (المأمون)یش مەجلیسەکانی لە ناوازەترین مەجلیسە زانستییەکان بووە لە مێژووی شارستانێتی ئیسلامیدا.

چونکە خۆی لە مەزنترینی زانایان بووە، و کۆڕەکانی شەپۆلی دەدا بە کۆمەڵێکی بێوێنە لە پیاوانی زانست و ئەدەب و شیعر و پزیشکان و

فەیلەسوفەکانیش کە لە هەموو لایەکی وولآتەوە بانگی دەکردن و هەمووی لەژێر کەرەم و رێزی خۆیدا نوقم دەکرد بەجیاوازی رەگەز و وولآتەکانیان.

ئەوەشمان بیرنەچێت کە دووکانەکانی کتێب نووسەرەوەکانیش بەهەمان شێوە کۆڕێك بووە بۆ زانایان لە هەموو بوارەکاندا کە گفتوگۆ و راگۆڕینەوەیان تێدا ئەنجامدەدا، کتێب فرۆشەکانیش خۆیان زوربەی کات ئەدیب و رۆشنبیر بوون کە سوودێکی گەورەیان لەکارەکەیان وەردەگرت بۆ تێرکردنی برسێتییان بۆ زانست، ئەوەندە بەسە کە بزانین (إبن النديم) خاوەنی (الفهرست) و (ياقوت الحموي) خاوەنی (معجم الأدباء) و (معجم البلدان) هەردووکیان دووکانی کتێب فرۆشتنیان هەبووە، زۆر جاریش (أبوالفرج الأصفهاني) خاوەنی کتێبی (الأغاني) و (أبو نصر الزجاج)ی ئەدیب و زمانەوان و موفەسیری قورئان لە دوکانی کتێب فرۆشەکاندا کۆدەبوونەوە و دەربارەی شیعر و ئەدەب گفتوگۆیان دەکرد لەگەڵ ئەو شاعیر و ئەدیبانەی کە دەهاتن بۆ ئەو دووکانانە.

لەدواییدا دەڵێین ئەو ئوممەتەی کە شایەنی ژیان و سەربەرزییە خۆراکی خۆی لە زانستدا دەبینێتەوە پێش هەموو شتێك، ئوممەتی ئێمەش کاتێك ژیانی دەکرد بە بەر میللەتانی تردا هەموو رێگایەکی گرتبوەبەر بۆ دەستکەوتنی زانست و بلآوکردنەوەی، بەڵکو زوربەی نەوەکانی لە خەلیفەوە بۆ بازرگان و کارکەرەکان پێشبڕکێیان دەکرد بۆ دەستخستن و بلآوکردنەوەی هۆکارەکانی زانست لە کتێب و قوتابخانەکان، هەروەك بینیشمان قسە و گفتوگۆکانیشیان لە مجلیسە زانستییە ناوازەکانیاندا زوربەی بۆ زیادبوونی زانست و کرانەوەی مێشك و

تیژکردنــەوەی بــووە، کــە تەنانــەت لــە دانیشــتن و یــاریکردن و کــات بەسەربردنەکانیشیاندا زانا و ئەدیب بوون.

لێــرەدا باســی کــۆڕی زانایــان و فوقــەها و فــەرموودەزان و ئامۆژکارەکانیشمان نەکرد، کە ئەمانە ئەوەنـدە زۆربـوون لـە هـەموو شـار ولادێیەکدا هەبوون، بـەکورتی دەتـوانین بڵـێین کـە شارسـتانێتی ئێمـە لـە سەردەمە پرشنگدارەکانیدا هەموو جیهانی ئیسلامی پڕکردبـوو لـە زانست کە هەموو ماڵەکان و مزگەوتـەکانی و قوتابخانـەکانی و یانـەکانی و کـۆڕ و مەجلیسەکانی و دووکانەکانی داپۆشیبوو، بەشـێوەیەك کـە وای لـە زانـای گەورە (گۆستاف لۆبۆن) کـرد کـە بڵێـت: (خۆشەویسـتی موسـوڵمانان بـۆ زانسـت زۆر گـەورە بـووە، و گەیشـتنە ئاسـتێکی زۆر بـەرز و مـەزن لـە ڕۆشبیریدا دوای ئەوەی کە فتوحاتەکانیان تەواو کرد بە ماوەیەکی کـورت، بەشێوەیەك کە توانییان شارستانێتییەك داهێنن کە زانسـتەکان و ئـەدەب و هونەرەکان تێیدا بەتەواوەتی گەشانەوە و گەیشتنە لوتکە).

## پایتەختەکان و شارە گەورەکان:

ئێمە ئێسـتا لـە سـەدەی چـوارەمی کۆچیدایـن یـان سـەدەی دەیـەمی زایینی، وبەشێوەیەکی خێرا چـاوێك دەگێـڕین بەسـەر شـارەکانی جیهـانی ئیسـلامی و جیهـانی ڕۆژئـاوادا، کـە لێـرەدا تووشـی تـۆقین دەبـین لـەو جیاوازییــە گەورەیــەی لــەنێوان ئــەم دوو جیهانــەدا بــووە، ســەرمان دەسوڕمێت کاتێك کە جیهانێکی پڕ لـە ژیـان و هێـز و شارسـتانییەت (کـە جیهـانی ئیسـلامییە) دەبیـنین بەرامبـەر بـە جیهـانێکی دواکـەوتوو کـە شـوێنەواری ژیـان و زانسـت و شارسـتانێتی تێـدا نـەماوە (کـە جیهـانی

ڕۆژئاوایە)، دەبا هەوڵ بدەین بەراوردێك لەنێوان ئەم ٢ جیهانەدا بکەین، با سەرەتا بە جیهانی ڕۆژئاوا دەست پێبکەین بۆ ئەوەی بزانین کە ژیانی دانیشتووانی و فراوانی شارەکانیان و ئاستی خەڵکەکەی چۆن بووە؟.

لە کتێبی مێژووی گشتی (ألفیس و رامبو)دا هاتووە: ئینگلتەرای ئەنگلۆسەکسۆنی لە سەدەی حەوتەمی زایینییەوە و تا دوای دەیەم زۆر هەژار بووە لە زەوییەکەیدا و پەیوەندی پچڕابوو بە وڵاتەکانی ترەوە، زۆر سەرەتایی و وەحشی بوون و خانووەکانیان بە بەردێکی دانەتاشراو دروست دەکرد و بەقوڕێکی شێلراو بنیاتیان دەنا و لە زەوی تەختانیدا دروستیان دەکرد، خانووەکانیان تەسك و دەرکەیان ناخۆش و دانەخراو بووە، هەروەها گەوڕ و شوێنی ئەسپ و ئاژەڵەکانیان پەنجەرەیان نەبووە و دەبووە هۆی تووشبوونی ئاژەڵ و ماڵاتەکان بە چەندین نەخۆشی جۆراوجۆر کە تەنها دەرامەتی وڵات بوون.

وەنەبێ خەڵکەکان ئەمینتر و ماڵەکانیان لە ئاژەڵەکان خۆشتر بووبێت، سەرۆکی تیرە لە کوخەکەیدا لەگەڵ خێزان و خزمەتکار و ناسیاوەکانیدا دەژیا، هەموویان لە هۆڵێکی گەورەدا کۆدەبوونەوە کە لە ناوەڕاستیدا زۆپایەك هەبووە کە دووکەڵکێشەکەی لە سەقفی ماڵەکەوە دەچووە دەرەوە، هەموویان لەسەر یەك سفرە نانیان دەخوارد کە سەرۆك و ژنەکەی لەلایەکی سفرەکەدا بوون، چەتاڵ نەناسرابوو و کووپەکان لەخوارەوەیاندا پیتێکی لەسەر بووە و دەبووایە هەریەکێك کووپی خۆی بەدەستەوە بگرێت یان بە یەك جار هەڵیداتە ناو دەمی، گەورەی ماڵ لە ئێوارەدا دوای نانخواردن و خواردنەوە و سەرخۆشی دەچووە ژوورەکەی خۆی، پاشان مێزەکان لادەبران و ئەوانی تر

هەموویان پێکەوە لەسەر زەوی ئەو هۆڵەدا دەخەوتن و هەریەکێك چەکی خۆی بەدەستەوە دەبوو لەکاتی خەوتندا لەبەر ئەوەی دزەکانی ئەو کاتە ئەوەندە بەجورئەت بوون کە وای لە خەڵکەکە دەکرد کە هەمیشە لە ئامادەباشیدا بن بۆ ئەوەی زەفەریان پێنەبەن.

ئەورووپا لەو کاتەدا پڕبووە لە دارستانە چڕەکان و دواکەوتوو بووە لە کشتوکاڵەکەیدا، لە زۆنگا و گۆلاوەکانی دەوروبەری شارەکانەوە بۆنێکی کوشندە دەهات کە خەڵکی دادەگرت و لەناوی دەبردن، خانووەکانی شارەکانی پاریس و لەندەن لە دار و قوڕی شێلراو بە کا و قەصەب دروستدەکران (وەك خانووی لادێکانی ئێمە پێش نیو سەدە)، پەنجەرە و ژووری گەرمکراویان نەبووە، هەروەها جێگە و سیستەمی نووستنیان نەناسیوە و تەنها جێگایان بریتی بووە لەو کا و پووشەی کە لەسەر زەویدا دەیانڕشت، پاك وخاوێنییان نەناسیوە و ناوسکی ئاژەڵەکان و پیسی چێشتخانەکانیان لەبەردەم ماڵەکانیاندا فرێدەدا و لێیانەوە بۆنێکی ناخۆش دەهات.

هەموو خێزانێك لە یەك ژووردا دەخەوتن بە پیاو و ژن و منداڵەکانەوە، و زۆرجاریش ئاژەڵەماڵییەکانیان لەگەڵ خۆیاندا دەخەواند، جێگەی ئەوان بریتی بووە لە کیسێك کا کە لە سەروویەوە کیسێکی خوری هەبووە کە وەك سەرین بەکارهاتووە، شەقامەکانی شارەکان ئاوەڕۆ و رووناکی و بەرد ڕێژییان نەبووە، گەورەترین شاریش لە ئەورووپادا ژمارەی دانیشتوانی لە ٢٥ هەزار تێنەپەڕیوە.

ئەمە بریتی بووە لە حاڵی ڕۆژئاوا لە سەدەی پانزەیەم و دوای ئەمیشدا بە دانپێدانانی مێژوونووسانی خۆیان، دەبا ئێستا بەخێرایی

پێش ئەوەی ئەم وێنەیەمان بیرچێتەوە بچین بۆ جیهانی ئیسلامی و شار و پایتەختە مەزنەکانی وەك بەغدا و دیمەشق و قورتوبە و غەرناتە و ئیشبیلیە، بۆ ئەوەی بزانین ئەم شارانە و شارستانییەتەکەیان چۆن بووە.

بابچین بۆ شارەکانی ئەندەلوس کە دراوسێی ئەورووپا بوون و باسمان لێوەکرد، و باهەوڵ بدەین کە تەنها خاسییەتە دیارەکانیان نەك هەموو شتێکیان باس بکەین، دەبابزانین چۆن بوون؟

قورتوبە (Cordoba) لە سەردەمی (عبدالرحمن)ی سێیەمی ئومەوی پایتەختی ئەندەلوسی موسوڵمان بووە، شەوان بە چراخان رووناك دەکرایەوە و موسافیران تا ماوەی ١٠میل بەهۆی پرشنگی رووناکییەکەی دەیانتوانی رێگەی خۆیان ببینن و وون نەبن، شەقام و جادەکانی بەردرێژ کرابوون، و شۆستەکانی لە جادەکەوە بەرز کرابوونەوە، چواردەوری درابوو بە باخ و بێستانی گەش و سەوز، تەنانەت ئەوەی دەهات بۆ ئەم شارە نزیکەی ١ سەعات بەناو ئەم باخ و بێستانانەدا پیاسەی دەکرد ئینجا دەگەیشتە شارەکە.

دانیشتوانی لە ١ ملیۆن کەس زیاتر بوون (لەو کاتەدا کە دانیشتوانی گەورەترین شاری ئەورووپا لە ٢٥ هەزار کەس زیاتر نەبوون)، حەمامەکانی نزیکەی ٩٠٠ دانە بوون و خانووەکانی ٢٨٣٠٠٠ خانوو و ٨٠٠٠٠ کۆشك بووە، ٦٠٠ مزگەوتی تێدابووە، خرێتی شارەکە ٨ فەرسەخ بووە (واتە نزیکەی ٣٠کم)، هەموو دانیشتوانەکەی خوێندەوار بوون و لە بەشی رۆژهەڵاتیدا بەتەنها ١٧٠ ئافرەتی خۆشنووس هەبوون کە بە خەتی کوفی قورئانیان دەنووسی، ئەمە تەنها لە یەك لای شارەکەدا.

٨٠ قوتابخانەی گشتی تێدابووە کە هەژارەکان بەخۆڕایی تێیدا فێردەکران، ٥٠نەخۆشخانەی تێدابووە.

مزگەوتە گەورەکەی کە تا ئەمڕۆش شوێنەوارە مەزنەکەی بەنەمری ماوە نموونەیەك بووە لە هونەر و داهێناندا، بەرزی منارەکەی ٤٠ باڵ بووە و گومەزە بەرزەکەی لەسەر چەند بناغەیەکی تەختەیی هەڵکەندراو جێگیر بووە، لەناوەوە ١٠٩٢ پایەی هەیە کە لە مەرمەڕی جۆراوجۆر دروستکراون و بوونەتە هۆی دروستبوونی ١٩ بەش بەدرێژی و ٣٨ بەش بە پانی، لەشەودا بەهۆی ٤٧٠٠ چراخانەوە رووناك دەکرایەوە کە لە هەموو ساڵێکدا ٢٤ هەزار رەتڵ رۆنیان سەرف دەکرد، بەشی خوارووی ١٩ دەرگای هەبووە کە بە لەوحی برۆنزی پتەو داپۆشرابوون جگە لە دەرگای ناوەندییان کە بە لەوحی ئاڵتونی داپۆشرابوو، لەهەریەك لە رووەکانی رۆژهەڵات و رۆژئاواشدا ٩ دەرگای هاوشێوەی ئەمانە هەبووە، میحرابی مزگەوتەکە ئەوەندە بەسە کە مێژوونووسە رۆژئاواییەکان دەربارەی دەڵێن: (بریتییە لە جوانترین شتێك کە چاوی مرۆڤی دەچێتەسەر، هیچ شتێکی تری کۆن یان نوێ ناگاتە جوانی و رازاندنەوە و بەرزییەکەی).

هەر بۆ شاری قورتوبە شارۆچکەی (الزهراء)ی ئەمر بە هونەر و ناوازەکانی زیادکرا، بەشێوەیەك کە مێژوونووسی تورکی (چیا پاشا) دەربارەی دەڵێت: (بریتی بوو لە سەرسوڕهێنەری زەمانە کە هاوشێوەی ئەم بەخەیاڵی بەنناکاندا نەهاتووە لەو کاتەوەی پەروەردگار گەردوونی دروستکردووە، و وێنەیەك وەك وێنەی ئەم لە مێشکی هیچ ئەندازیارێکدا دروست نەبووە لەو کاتەوەی کە عەقڵەکان پەیدابوون).

لە شاری (الزهراء)دا هۆڵ و مەجلیسێك هەبووە کە ناوی (قصر الخلافة) بووە، سەقف و دیوارەکانی لە ئاڵتون و مەڕمەڕی پوختی

ئەستوور بوون لە هەموو رەنگێك، لە ناوەڕاستیدا حەوزێکی گەورەی مەڕمەڕ هەبووە کە پڕبووە لە جیوە، لە هەموو لایەکی ئەم مەجلیسەدا ٨ دەرگا هەبوون کە سەرەکانیان لە عاج و ئەبانۆسی رازاو بە ئالتوون و جۆرەهای گەوهەر پێکهاتبوون و چوارچێوەکەی لە مەڕمەڕی رەنگاورەنگ و بلووری روون پێکهاتبوو.

تیشکی خۆر لەم دەرگایانەوە دەهاتە ژوورەوە و ناوەڕاست و دیوارەکانی ئەم مەجلیسەی رووناك دەکردەوە و بەهۆی رەنگە جۆراوجۆرەکانەوە رووناکییەکی دروستدەکرد کە مێشکی دەسووڕماند و چاوەکانی گێژدەکرد، خەلیفە (الناصر) ئەگەر بیویستایە یەکێك لە دانیشتوان بترسێنێت ئاماژەی دەکرد بۆ یەکێك لە بەندەکانی کە جیوەی ناو حەوزەکە بجوولێنێت، ئیتر رووناکییەك لە مەجلیسەکەدا پەیدا دەبوو وەك تیشکی هەورە بروسکە و دڵەکانی پڕدەکرد لە خۆشی، بەشێوەیەك کە دانیشتوانی هۆڵەکە وایاندەزانی دەفڕن و لە هەوادان تا ئەو کاتەی کە جیوەکە بجوولایەتەوە.

هەروەها شارەکە کارگەکانی پیشەسازی و ئامێرەکانی تێدابووە، وەك شوێنی دروستکردنی ئامێر و چەکەکانی جەنگ و شوێنی دروستکردنی خشڵەکانی خۆڕازاندنەوە و شوێنی دروستکردنی پەیکەر و زەخرەفە و هەڵکەندراوەکان و غەیری ئەمانیش لە پیشە و پیشەسازییەکان، دروستکردنی ئەم شارۆچکەیە ماوەی ٤ ساڵی خایاند، لەم کۆشکە مەزنەدا خەلیفە (المستنصر) لە ساڵی (٣٥١ك)دا پێشوازی کرد لە پاشای ئیسپانیای مەسیحی کە (أردون بن اذنفوش) بوو، کاتێك چووە ناو زەهراوە و گەورەیی و مەزنی و خزمەتکارەکانی و سەربازەکانی و ئامێرە

جەنگییەکانی بینی تووشی سەرسوڕمان بوو! سەرسوڕمانەکەی گەیشتە لوتکە کاتێك کە گەیشتە مەجلیسی خەلیفە (المستنصر) و لە پاڵیدا گەورە پیاوانی دەوڵەت و ڕێزدار و ئەشراف و گەورە زانایان و خەتیبەکان و گەورە سەرکردە سەربازییەکانی بینی، کاتێك کە پاشای ئیسپان ویستی نزیك بێتەوە سەری رووتکرد و کڵاوەکەی داکەند و بەپێوە مایەوە تاوەکو خەلیفە ڕێگەیدا لێی نزیك بێتەوە و دانیشێت.



ئەگەر لێرەوە بچین بۆ (غەرناتە) گەورەیی بینا و ئاوەدانی ئیسلامیمان بە تەواوەتی بۆ روون دەبێتەوە، بە تایبەتی لە کۆشکی (الحمراء)دا کە نموونەیەکی سەسوڕهێنر بووە و تەماشاکەرانی سەرسام دەکرد، تا ئەمڕۆش لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژەکاندا مایەی سەرسوڕمان و سەردانی گەشتیارانە لە هەموو لایەکی جیهانەوە، ئەم کۆشکە لە قەدپاڵی چیایەکدا دروستکراوە کە دەڕوانێت بەسەر شاری

غەرناتە و باخ و بێستانە فراوان و بەپیتەکانی دەوروبەریشیدا، کە وای لێدەکات لە جوانترینی دیمەن و شوێنەکانی دونیا بێت، لە کۆشکەکەدا چەندین هۆڵی جۆراوجۆری تێدابووە، وەك: هۆڵی شێرەکان، و ژووری ٢ خوشکەکە، و هۆڵی دادپەروەری، و هۆڵی باڵوێزەکان، کە ناتوانین لەم باسە کورتەدا وەسفی تەواوی (الحمراء)ی ناوازە بکەین.

باسیش دەربارەی شارە ئەندەلوسییەکانی تر و ئەو فەخمی و مەزنییەی کە هەیانبووە کاتمان زۆر دەبات و درێژدەبێتەوە، و تەنها ئەوەندە بەسە کە بڵێین لە شارێکی تردا کە (ئیشبیلیە) بووە، بەتەنها ٦٠٠٠ ئامێری ئاوریشم چنین هەبووە[١٤٥]، و لە هەموو لایەکیدا بە داری زەیتوون دەورە دراوە، و زیاتر لە ١٠٠ هەزار ئامێری گوشینی زەیتون و دروستکردنی زەیتی زەیتوونی تێدابووە.

با ئێستاش روو وەرگێڕین و بچین بۆ رۆژهەڵاتی جیهانی ئیسلامی بۆ ئەوەی کە نموونەی شارێکی گەورەی و شارستانییە ناوازەکەی ببینین، کە لێرەدا تەنها باسی شاری (بغداد) و باسی پێکهاتەکەی و چۆنێتی دروستکردنی دەکەین کە لە سەردەمەکانی دواتردا دوای دروستکردنی بووە یەکێك لە عەجایبەکانی دونیا کە پێشتر نموونەی لەمجۆرە بوونی نەبووە.

بەغدا پێش ئەوەی کە خەلیفەی عەبباسی بەناوبانگ (المنصور) دروستی بکات تەنها کێڵگە و بازارێکی بچووك بووە کە سەری هەموو ساڵێك بازرگانانی دەوروبەری تێیدا کۆدەبوونەوە بۆ کڕین و فرۆشتن، کاتێك کە (المنصور) نیازی دروستکردنی هێنا ئەندازیاران و خەڵکی بەننا

---

[١٤٥] ئەمە بێجگە لە ١٦٠٠ کارگەی جۆراوجۆری تر، تەنها ژمارەی کرێکارانی چنین ٣٠٠٠٠ کرێکار بوون، لە شاری (طلیطلة)ش زیاد لە ٥٠٠ کارگەی قوماش هەبووە کە کرێکارانی نزیکەی ٤٠٠٠٠ کەس بوون!

و شارەزایانی پێوان و رووپێوی و دابەشکردنی زەوی لە هەموو لایەکەوە بۆ هێنا، پاشان بەدەستی خۆی یەکەم خشتی بیناکەی دانا و ووتی: (بسم الله الرحمن الرحيم والحمد لله يورثها من يشاء من عباده والعاقبة للمتقين) واتە: بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان و سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە دەیکاتە میراتی هەر کەسێك لە بەندەکانی کە بیەوێت و پاشەرۆژیش هەر بۆ پارێزکارانە، پاشان ووتی: لەسەر بەرەکەتی خودا بنیاتی بنێن.

سەرجەمی ئەوەی بۆی سەرفکرا لە دروستکردنیدا گەیشتە ٤ ملیۆن و ٨٠٠ هەزار درهەم، ژمارەی ئەو کرێکارانەی لە دروستکردنیدا بەشداربوون گەیشتە ١٠٠ هەزار کەس، ٣ شوورەی هەبووە کە یەك لەدوای یەك بوون، ژمارەی دانیشتوانی گەیشتنە ٢ ملیۆن کەس، ژمارەی شەقام وکۆلانەکانی گەیشتنە ٦٠٠٠ لە بەری رۆژهەلاتی و ٤٠٠٠ لەبەری رۆژئاوای.

بەناویدا بێجگە لە دیجلە و فورات ١١ روباری لاوەکی دەرۆیشتن کە ئاوەکەیان دەچووە هەموو مالێك و کۆشکێکی شارەکەوە، لە روباری دیجلەدا بە تەنها لە پەڕینەرەوەکان بە بەلەم ٣٠ هەزار بەلەم هەبووە! ژمارەی گەرماوەکانی گەیشتنە ٦٠ هەزار گەرماو کە لە کۆتایی دەسەلاتی عەبباسییەکاندا کەمبۆوە بۆ کەمتر لە ٢٠ هەزار دانەیەك، مزگەوتەکانی گەیشتنە زیاتر لە ٣٠٠٠، دانیشتوانی و زۆریی زانایان و ئەدیبان و فەیلەسووفان لەنێوانیاندا ناتوانرێت ئەژمار بکرێن.



کۆتایی ئەم باسەمان بە باسی

مەزنی ئەم شارە لە سەردەمی خەلیفە (المقتدر)دا و رادەی بەرزیی و جوانی خەلافەت دەکەین کاتێك کە نوێنەری پاشای رۆم سەردانی کرد، ماڵی خەلیفە (دار الخلافة) لە گەورەیی و فراوانیدا گەورەتر بووە لە شارێکی گەورەی ئەمڕۆی سوریا، کاتێك نوێنەری پاشای رۆم گەیشتە شارەکە لە خانووی میوانەکان دانرا، پاشان سەربازان ریزکران لە خانووی میوانانەوە بۆ خانووی خەلیفە کە ژمارەیان گەیشتە ١٦٠ هەزار سەرباز لەنێوان سوار و پیادەدا، نوێنەرەکەش بە نێوانیاندا رۆی تا گەیشتە شوێنی خەلیفە و سەلامی لێکرد.

خەلیفەش فەرمانی کرد کە بە (دار الخلافة)دا گەشتی پێبکرێت کە چۆڵکرا بوو و تەنها ٧٠٠٠ خزمەتکار و ٧٠٠ دەرگەوان و ٤٠٠٠ بەندەی رەشپێستی تێدامابوو! خەزێنەکان کرانەوە کە ئامێرەکانی جەنگ و چەکەکان تێیدا وەك کەل وپەلی بووك رێکخرابوون، کاتێك کە نوێنەری پاشای رۆم چووە ناو خانووی دارەکەوە (دار الشجرة) سەری سوڕما، کە بریتی بوو لە دارێکی زیوو کە کێشەکەی ٥٠٠ هەزار درهەم بوو، ١٨ لقی هەبووە کە هەر لقێکیان لقی بچووکتری هەبووە و لەسەر ئەم لقانە باڵندە و چۆلەکەی لە هەموو جۆرێك و لە ئاڵتون و زیو دروستکراوی پێوە بووە، زوربەی لقەکانی دارەکە لە زیو بووە و هەندێکیان ئاڵتوون بوون و لە چەند کاتێکی دیاری کراودا بەلەنجە دەلەرینەوە، چەندین گەڵای رەنگاوڕەنگی هەبووە کە لەگەڵ بادا دەجوولانەوە، هەریەکێك لەم تەیرە زیوی و ئاڵتونییانە جریوە و فیکە و دەنگیان لێوە دەهات، لە تەنیشت خانووی دارەکەوە پەیکەری ١٥ سوار لەسەر ١٥ ئەسپ هەبوون کە جلی جەنگییان لەبەر کرابوو و بەدەستیانەوە رم هەبووە، و لەسەر یەك خەت بەدوای یەکدا دەخولانەوە، هەروەك ئەوەی کە هەریەکێکیان بەدوای ئەوی ترەوە بێت، پاشان برا بۆ ئەو کۆشکەی کە ناوی (الفردوس) بووە

کە لە ئامێرەکانی جەنگ و چەك ئەوەندەی تێدابووە مەگەر خودا بزانێت!

پاشان لە کۆشکێکەوە بران بۆ کۆشکێکی تر لە (دار الخلافة)دا تا ژمارەی ئەو کۆشکانەی گەڕان گەیشتە ٢٣ کۆشك، پاشان گەڕانەوە بۆ کۆڕی خەلیفە موقتەدیر جارێکی تر پاش ئەوەی کە ٧ جار لە گەڕانەکەیاندا پشوویان کرد، لەو شوێنانەی کە نوێنەری پاشای ڕۆم سەردانی کرد بریتی بوو لە کۆشکی ئاژەڵان کە هەموو جۆرێك لە ئاژەڵانی کێوی و ماڵی تێدابوو، هەروەها شوێنی فیلەکان کە ٤ فیلی تێدابووە و بەسەر هەر یەکێکیانەوە ٨ کەسی هیندی هەبووە کە جڵەوگیری بوون، هەروەها شوێنی شێر و دڕندەکان گەڕان کە ١٠٠ دانەی تێدابووە، ٥٠ لەلای ڕاست و ٥٠ لەلای چەپ کە هەریەکێکیان بەدەست شێرەوانێکەوە بووە و لەسەر و ملیاندا زنجیر و کۆت هەبووە، بێگومان نوێنەری پاشای ڕۆم لە دەروونی خۆیدا گەیشتە لوتکەی سەرسامی و بە گەورە زانین پاش ئەوەی کە مەزنیی (دار الخلافة)ی بینی، چونکە لە هەموو دونیادا خانوویەکی هاوشێوەی ئەم خانووە نەبووە کە ئەم دیوێتی.

ئیتر ئەمانە بەسن بۆ ئەوەی کە مەزنیی و بێوێنەیی شارستانییەتی خۆمانمان بۆ دەرکەوێت لە گەرمە و لوتکەی بەرزیی و هێزیدا.

لە کۆتایین بەشی ئەم کتێبەدا جێی خۆیەتی کە شایەتی هەندێکی تر لە زانایان و ناودارانی رۆژئاوا خۆیان بهێنم سەبارەت بە پێشدەستیی و سەرمەشقیی موسوڵمانان لە پێشخستنی زانستدا و رۆڵی بەرزی شارستانییەتە مەزنەکەیان:

– مێژوونووس و ئەدیبی فەرەنسی (گۆستاف لۆبۆن Gustave Lebon) لە کتێبی شارستانێتی عەرەب (حضارة العرب)دا دەڵێت:

خەڵکی ئەندەلوس بە زۆری زانایان و لێزمەی ئەدەب و بەرزیی پادشایان و خۆشویستنیان بۆ زانست ناسرابوون، ئەوانەی کە زانست و ئەدەب بەرزیان دەکرنەوە ئەمانیش بەرزیان رادەگرتن و رێزیان لێدەگرتن، مێشکی مرۆڤ لەوانەیە باوەڕ بەوە نەکات کە نوسراوەکانی (إبن حزم) کە زۆربەیان لەناوچوون گەیشتنە ٤٠٠ بەرگ لە ٨٠ هەزار لاپەڕەدا!

نوسراوەکانی (عبدالملك بن حبيب السلمي) کە لە ئەندەلوس لە ساڵی (٢٣٨ك)دا کۆچی دوایی کرد و تەمەنی (٥٣ ساڵ) بوو گەیشتنە ١٠٠٠ بەرگ! کتێبخانە تایبەتییەکان لە زوربەیماڵەکانی شارە گەورەکاندا هەبوون و کتێبخانە گشتییەکانیش بە تایبەتی لە شارۆچکە و لادێکاندا زۆر بوون، بە تەنها لە (قورتوبە) و دەوروبەریدا ٧٠ کتێبخانەی گشتی هەبووە ئەمە بێجگە لەو دوکان و بازاڕە زۆرانەی کتێب فرۆشتنیش، (إبن حزم) باسی ئەوە دەکات کە ژمارەی پێڕستەکانی کتێبخانەی کۆشکی (الحكم) ٤٤ دانە بوون کە هەریەکێکیان ٥٠ لاپەڕە بووە و تەنها ناوی کتێبەکانی تێدابووە! ژمارەی کتێبەکانی گەیشتنە ٤٠٠ هەزار بەرگ، کاتێکیش کە گواستیانەوە بۆ شوێنی نوێی خۆی لە کۆشکەکەدا ماوەی ٦ مانگ خەریکی گواستنەوەی کتێبەکان بوون.

ئەمە لە کاتێکدا بوو کە (شارل)ی پێنجەمی پاشای فەرەنسا کە بە دانا (الحکیم) ناسراوە لە کۆتایی سەدەی هەشتەمی کۆچی (١٤ی زایینی)دا ویستی زۆرترین ژمارەی کتێب لە وڵاتی خۆی و سەردەمی خۆی کۆبکاتەوە، نەیتوانی کە زیاتر لە ٩٠٠ بەرگ کۆبکاتەوە کە زوربەیان کتێبی ئایینی بوون !

کەواتە بۆمان سەلما کە کاریگەریی عەرەب لەسەر ڕۆژئاوا وەك کاریگەرییان بووە لەسەر ڕۆژهەڵات، ئەورووپاش منەتباری موسوڵمانانە بۆ شارستانییەتەکەی، وەك بینیمان سەنتەرەکانی ڕۆشنبیری لە ڕۆژئاوادا بریتی بوون لەو تەلار و بورجانەی کە کاربەدەستە دەرەبەگە وەحشییەکان تێیدا نیشتەجێ بوون کە شانازییان بە لاوازی و دەست بەسرانەوەیان دەکرد.

موسوڵمانان بە تەنیا مامۆستای نەتەوە مەسیحییەکان بوون بۆ چەندین سەدە، ئێمەی ڕۆژئاوایی تەنها بەهۆی هەوڵەکانی موسوڵمانانەوە بوو کە توانیمان میراتی یۆنانییەکان ببینین، خوێندن و زانست لە زانکۆکانی ئێمەدا تا سەردەمانێکی نزیکیش نەیتوانی پشت نەبەستێت بەو کتێبە عەرەبییانەی کە وەرگێڕدران بۆ زمانەکانی ئێمە، ئەم وەرگێڕانانەی کتێبە زانستییە عەرەبییەکان تاکە سەرچاوەی فێرکردن بوون لە زانکۆکانی ئەورووپادا بۆ ماوەی زیاتر لە ٥ سەدە ! دەتوانین بڵێین کە کاریگەریی موسوڵمانان لە هەندێك زانستدا وەك پزیشکی تا ئەم ڕۆژانەی ئێمەش بەردەوامە، کە ڕاڤەی کتێبەکانی (ئیبن سینا) لە (مۆنبلییە) لە کۆتایی سەدەی ڕابووردوودا (سەدەی ١٩) کرانەوە.

جیهان هەمووی منەتباری فەزڵی ئیسلامە، موسوڵمانان چەندین خزمەتی بەرزی زانستە گەردوونییەکانیان کرد، پەیمانگا زانستییەکانی

رۆژئاوا بریتی بوون لە چەند قەڵایەکی پووچەڵ کە پاپاکان و سەرانی کڵێسا رابەرایەتییان دەکرد لە حاڵەتێکی نامۆدا، و شانازییان بە نەزانینیانەوە دەکرد لە هەموو شتێکدا، کەواتە بناغە و دامەزرێنەری زانستەکانی ئێمە و سەرچاوەکانیان بریتی بوو لە زانستەکانی موسوڵمانان، هەرئەوەندە بەسە بزانین کە پەروەردەی ئەوروپا لە رووی رەووشتی و ژیرییەوە منەتباری ئەوانە و هەر ئەمانیش بوون کە مەدەنییەت و شارستانییەتیان هێنا بۆ ئەورووپا[١٤٦]، کاریگەریی و دەسەڵاتی ئەخلاقی ئیسلامی نەتەوە ئەورووپییە وەحشیگەرەکانی خستە سەر رێی مەدەنییەت، پاشان دەڵێت: بیرە مەزنەکانی موسوڵمانان دەرگاکانی زانستەکان و هونەر و فەلسەفەیان کردەوە کە ئێمەی ئەورووپی پێیان زۆر نەزان بووین، موسوڵمانان مامۆستای ئێمە بوون بۆ ماوەی زیاتر لە ٦٠٠ ساڵ!.

موسوڵمانان بۆ ماوەیەکی زۆر پشتیان نەبەست بە کتێبەکانی یۆنان بەڵکو بۆیان دەرکەوت کە تێڕوانین و تاقیکردنەوە لە کتێب باشترە، هەربۆیە پێشی ئەورووپایان دایەوە بۆ ئەم کردارەی کە درایە پاڵ (بیکۆن) بەوەی کە یەکەم کەسێك بێت تاقیکردنەوە و تێڕوانینی بەکارهێنابێت کە بڕبڕەی پشتی پرۆگرامە زانستییە نوێکانن، بەڵام موسوڵمانان دەستپێشخەر بوون بۆ سیستمی تاقیکردنەوە لە زانستەکاندا[١٤٧].

– ئەوەی مایەی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە داگیرکەران و ئیستیعمار لەم ماوەیەی کۆتاییدا هەموو دۆزینەوەکانی موسوڵمانانیان دایەپاڵ کەسانی

---

[١٤٦] بڕوانە کتێبی (مەدەنییەتی عەرەبی La civilic sation des Arabes)، دانراوی: (Gustave Lebon).
[١٤٧] بڕوانەوە هەمان سەرچاوە.

تر، كه له‌وانه‌یه خۆشی نه‌یبیستبێت، مسته‌ر (ترند) مامۆستای زمانی ئیسپانی زانكۆی (كه‌مبریدج) به‌ئاشكرا باسی ئه‌مه ده‌كات و ده‌ڵێت: زانكۆكانی فه‌ره‌نسا و ئه‌مریكا هاتن هه‌موو شتێك و هه‌موو دۆزینه‌وه‌یه‌كیان گێرایه‌وه بۆ سه‌رچاوه‌یه‌كی لاتینی! هه‌ر له‌به‌ر ئه‌مه مێژوونووسه نوێكان وایان لێهات كه گرنگی نه‌ده‌ن به میرات و پاشماوه‌ی مه‌زنی زانستی موسوڵمانان كه له سه‌ده‌كانی پێشتردا بۆیان به‌جێهێڵاین، له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا ده‌بێت بزانین كه زوربه‌ی ئه‌وانه‌ی ئه‌مڕۆ دراونه‌ته‌پاڵ سه‌رچاوه لاتینییه‌كان پێش ته‌نها یه‌ك سه‌ده درابووه پاڵ موسوڵمانان![148].

– (مسته‌ر وێڵز) كه یه‌كێكه له گه‌وره‌ترین مێژوونووسه‌كانی به‌ریتانیا ده‌ڵێت: ئه‌و ئاینه راسته‌ی كه بینیم هه‌میشه له‌گه‌ڵ شارستانییه‌ت و مه‌ده‌نییه‌تدایه بریتییه له ئاینی ئیسلام، و ئه‌گه‌ر داوام لێبكرێت كه پێناسه‌ی ئیسلام به یه‌ك ده‌سته‌واژه بكه‌م ده‌ڵێم: ئیسلام بریتییه له‌و مه‌ده‌نییه‌ته‌ی چاوه‌ڕوان كرابوو، هه‌روه‌ها ده‌ڵێت: ئه‌ورووپا منه‌تباری موسوڵمانانه له به‌شی هه‌ره زۆری یاساكانی به‌ڕێوه‌بردن و بازرگانیدا، ئه‌و شه‌ریعه‌ته‌ی كه بینیم له‌گه‌ڵ مه‌ده‌نییه‌تدا ده‌ڕوات شه‌ریعه‌تی ئیسلامی بوو، ئه‌گه‌ر یه‌كێك بیه‌وێت شتێك له‌مه بزانێت بابچێت قورئان بخوێنێته‌وه و ئه‌وه‌ی كه تێیدایه له بیردۆزه زانستی و یاساكانی به‌ستنه‌وه‌ی كۆمه‌ڵگا، چونكه كتێبێكی ئاینی زانستی كۆمه‌ڵایه‌تی پاككه‌ره‌وه‌ی ره‌ووشتیی مێژووییه، كه زۆرێك له یاساكانی تا مانی دونیا به‌كاردێن، من ته‌حه‌ددا ده‌كه‌م كه یه‌كێك بتوانێت باسی سه‌رده‌مێكم بۆ بكات كه تێیدا شه‌ریعه‌تی ئیسلامی پێچه‌وانه‌ی پێشكه‌وتن و مه‌ده‌نییه‌ت بووبێت!.

---

[148] بروانه گۆڤاری (مكتب إسلام) ژماره ١١ ساڵی ١٣٨٧ك.

– (هنری دی شامپون) دەڵێت: ئێمەی رۆژئاوایی قەرزاری گەلە موسوڵمانەکانین بۆ هەموو شتە چاکەکانی شارستانییەتمان لەبواری زانست و هونەر و پیشەسازیدا، ئەوەندەمان بەسە کە بزانین نموونەی کاملّی مرۆڤایەتی بووە بۆ زیاتر لە ٨ سەدە، کە ئێمە لەو کاتەدا نموونەی دڕندەیی بووین.

– دکتۆرە (ئەلیس لیختسندەر) مامۆستای ئیسلامییات لە زانکۆی (فرانکفۆرت) لە ئەڵمانیا دەڵێت: لە کتێبەکەمدا (ئیسلام و سەردەمی نوێ) ئەوەم سەلماند کە چۆن موسوڵمانی سەردەم باوەڕی وایە کە ئەو کتێبەی بۆی هاتۆتە خوارەوە ڕێی دەدات (ئەگەر لەسەریشی فەرز نەکات) کە چارەسەری کێشەکان و پرۆژەکانی سەردەمی خۆی بەپێی ئەوەی دەنگونجێت لەگەڵ ئاینەکەیدا چارەسەر بکات، بەبێ ئەوەی ئەو شتانەی زانستی نوێ فەراهەمی کردووە لەدەست خۆی بدات، ئەوەش تەئکیدە کە بانگخوازانی چاکسازی دەتوانن سەنەدی بەهێز لە قورئانی پیرۆزدا بدۆزنەوە بۆ هەموو ئەو نوێگەرییانەی بانگەشەی بۆ دەکەن، لەسەر ئەو بنەمایەی کە گرنگترین خاسییەتەکانی ئیسلام ئەوەیە کە کۆتایین ئاینە ئاسمانییەکانە، و لەگەڵ هەموویاندا لە بنچینەکانی باوەڕدا یەکدەگرێتەوە بەڵام لە چوارچێوە گشتییەکەیدا لەگەڵیان جیاوازە، کە نەبەستراوەتەوە بە پەیامێکی دیاریکراوەوە کە لەگەڵ ڕۆیشتنی سەردەمیدا نەمێنێت، یان بە نەتەوەیەکی تایبەتییەوە، بەڵکو ئیسلام کۆتایی پەیامەکانە و مەبەست پێی بەردەوامیدانە وگونجانە بۆ هەموو جیلێك وهەموو سەردەمێك.

– ئیمپراتۆر (گلیۆم) ئیمپراتۆری ئەڵمانیا دوای سەردانی بۆ قودس لەساڵی (١٨٩٧ن)دا ووتی: من ئەوەم دەووت لەدڵی خۆمدا کە ئەگەر خاوەنی دیانەتی خۆم نەبوومایە دوای گەیشتنم بۆ شاری (قودس) ئەوا

به دڵنیاییەوە موسوڵمان دەبووم، چونکە تەعالیمەکانی لەگەڵ هەموو خەڵکیدا و بۆ هەموو سەردەمێك دەگونجێت.

– مامۆستا (شیرل) راگری کۆلیجی ماف لە زانکۆی (ڤییەننا) لە کۆنگرەی مافناسەکان لە ساڵی (١٩٢٧ز) ووتی: مرۆڤایەتی شانازی دەکات بەوەی کە کەسێکی وەك (محمد) مرۆڤ بووە، چونکە لەگەڵ ئەوەشدا کە نەخوێندەوار بووە توانیویەتی تەشریعێك بهێنێت کە ئێمەی ئەورووپی تەواو شاد و کامەران دەبین ئەگەر بتوانین دوای ٢٠٠٠ ساڵ بگەین بە لوتکەکەی!!.

– مامۆستا (درییەر) لە کتێبەکەیدا کە بە (المنازعة بين العلم والدين) وەرگێڕدراوە دەڵێت:

خەریکبوونی موسوڵمانان بە زانستەوە دەگەڕێتەوە بۆ فەتحیان بۆ شاری ئیسکەندەریە لە ساڵی (٦٣٨ز)دا (واتە پاش مردنی محمد بە ٦ ساڵ)، دوای ئەمە دوو سەدەیان تێنەپەڕی بەسەرا تاوەکو هەموو کتێبە یۆنانییەکانیان وەرگێڕا بۆ عەرەبی و نرخی راستەقینەی خۆیان پێدان، کاتێکیش کە خیلافەت گەیشتە (المأمون) لە ساڵی (٨١٣ز)دا شاری بەغدا بوو بە پایتەختی زانستیی هەرە گەورەی دونیا، کە خەلیفە تێیدا ژمارەیەکی ناکۆتا لە کتێبی کۆکردەوە و زانایانی بۆلای خۆی نزیك کردەوە و زیادڕەوی کرد لە ڕێزپێدانیان.

– زانا (ل. أ. سیدیو) لە کتێبی (مێژووی گشتی موسوڵمانان)دا دەڵێت: موسوڵمانان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا پێشەنگ و چالاك بوون لە زانست و فەلسەفە و هونەردا کە بۆ هەر شوێنێك چووبن لەگەڵ خۆیاندا بڵاویان کردۆتەوە، و لەمانەوە چوو بۆ ئەورووپا و بوونە هۆکاری پێشکەوتن و بەرزبوونەوەی.

- (لیبیری)یش دەڵێت: ئەگەر بهاتایە و موسوڵمانان لەسەر شانۆی مێژوودا دەرنەکەوتنایە ئەوا پێشکەوتن و شارستانێتی ئەوروپا چەندین سەدە دوادەکەوت.

- زانای فەرەنسی (کلود فارین) ئەندامی ئەکادیمیای زانستی فەرەنسی دەڵێت: لە ساڵی (٧٣٢ز)دا کارەساتێکی گەورە تووشی مرۆڤایەتی هات کە لەوانەیە شومترین کارەساتێك بووبێت لە مێژووی سەدەکانی ناوەڕاستدا، کە بەهۆیەوە جیهانی رۆژئاوا بۆ ماوەی ٨ سەدە نوقمی زۆنگاوی بەربەرییەت و وەحشیگەریی بوو، کە پاشان هاتنی سەردەمی رابوونەوە و راپەرین ئینجا کەمێك ئەم بەربەرییەی رەواندەوە، بەڵام سەردەمی چاکسازی جارێکی تر هێزی پێدایەوە، ئەو کارەساتە بریتی بوو لەو سەرکەوتنە قێزەونەی کە وەحشییەکانی (هارکاس) لە جەنگاوەرە فەرەنکییەکان بە سەرکردایەتی (شارل مارتل) لە نزیك (بواتیە) بەدەستیان هێنا بەسەر کەتیبە عەرەبی و موسوڵمانەکاندا کە سەرکردەکەیان (عبدالرحمن) نەیتوانی بە تەواوەتی کۆیان بکاتەوەو رێکیان بخات، بۆیە شکستیان هێنا و پاشەکشەیان کرد، هەر لەم رۆژە شوومەدا مەدەنییەت و شارستانی ٨ سەدە پاشەکشێی کرد.

چونکە هەر ئەوەندە بەس بوو کە مرۆڤ سەیری باخەکانی ئەندەلوس و پاشماوە سەیر و سەرسوڕهێنەرەکانی پایتەختەکانی وەك (ئیشبیلیە و غەرناتە و قورتوبە و تولەیتەلە)ی بکردایە بۆ ئەوەی بە سەرسوڕمانێکی تەواوەوە ئەو رادەدە بەرزەی شارستانییەتی بۆ دەرکەوتایە کە شارەکانی فەرەنسا لەوانە بوو پێی بگەشتنایە و چۆن لە کیسیان چوو؟!! کە ئیسلامی زیرەك و فەیلەسوف و ئاشیخواز و سنگفراوان دەیتوانی لەو مەرگەسات و کارەساتانەی کە ناونابرێن و ناوەڕاستی ئەوروپای داپۆشی

رزگاری بکردنایە، کە سەرەتا بۆ باندە (ئۆستراژی)یە وەحشیگەرەکان ملکەچ بوو، پاشان لەت لەت کرا و نوقمی خوێن و فرمێسك بوو، دواتریش جەنگەکانی خاچپەرستان پیاوی تێدا نەهێلا، و بەهۆی جەنگە ناوخۆییەکان و دەرەکییەکانیشەوە پڕبوو لە لاشەی مردوو، ئەمە لە کاتێکدا جیهانی ئیسلامی لە دۆڵی گەورەوە بۆ ئەندەلوس گەشەی دەکرد و سەرکەوتنی ئاشتییانەی بەدەست دەهێنا لە سایەی ئومەوی و عەبباسی و سەلاجیقەکانەوە، لێرەدا پرسیار ئاراستەی فەرەنسییەکان دەکەم: چۆن بیردەکەنەوە دەربارەی سەرکەوتنمان لە ساڵی (٧٣٢ن) بەسەر موسوڵمانانداا؟ و ئایا لەگەڵ مندا یەکناگرنەوە لەوەدا کە ئەم شکستەی گەلێکی مەدەنی و پێشکەوتنخواز لەسەر دەستی گەلێکی بەربەری و دواکەوتوو تووشی هات کارەستێکی گەورە بوو بۆ هەموو مرۆڤایەتی؟!!...

- مێژوونووسی هۆڵەندی (رینهارت دوزی) لە کتێبی (چەند تێڕوانینێك بۆ مێژووی ئیسلام)دا دەڵێت: لە کاتێکدا خەڵکی ئەوروپا نوستبوون لەژێر تاریکایی نەزانیی و نەفامیدا و رووناکییان تەنها لە کونی دەرزییەوە دەبینی، لەپڕێکدا رووناکییەکی بەهێز لەلایەن ئوممەتی ئیسلامییەوە پرشنگیدایەوە لە زانستەکان و ئەدەب و فەلسەفە و پیشەسازی و دەسترەنگینی و غەیری ئەمانەش، چونکە شارەکانی بەغدا و بەسرە و سەمەرقەند و دیمەشق و قەیرەوان و میسر و فارس و غەرناتە و قورتوبە چەند سەنتەرێکی مەزنی زانست و زانیاریی بوون، و لێیانەوە زانستەکان و هونەر و ئەدەبیات لەنێوان میللەتانی جیهاندا بڵاوبوویەوە کە سوودێکی گەورە و فراوانیان لێوە بینی، لەلایەکی ترەوە بەنزیکیی هەموو تاکێکی کۆمەڵگای ئیسلامی خوێندنەوە و نووسینی دەزانی.

– یەکێك لە ناوازەترین شایەتییەکانی غەیری موسوڵمانان دەربارەی ئیسلام شایەتی (جەواهر لال نەهرۆ) بوو لە نامەکانیدا بۆ کچەکەی (ئەندیرا گاندی)، کە تێیدا سەرسوڕمانی خۆی دەردەبڕێت دەربارەی ئەم ئوممەتەی کە بۆ چەندین سەدە لەبیرکرابوو و دوور بوو لە رووداوەکانی جیهانی دەوروبەری، کە لەپڕ راپەری و هەستا بە ئەنجامدانی چالاکییەکی سەرسوڕهێنەر بۆ هەموو جیهان و هەڵیگێڕایەوە، پاشان (نەهرۆ) بۆ کچەکەی دەگێڕێتەوە کەمێك لە مێژووی موسوڵمانان و بڵاوبوونەوەیان لە ئاسیا و ئەفریقا و ئەورووپادا و ئەو شارستانییەتە پێشکەوتوو و مەدەنییەتە بەرزەی پێشکەشی هەموو جیهانیان کرد، و بە یەکێك لە سەمەرەکانی مێژوو دادەنرێت، پاشان دانی بەوەدانا بۆ کچەکەی کە پاڵنەری ئەم رابوونە عەرەبییە بریتی بوو لە ئیسلام و ئەوەی کە کردی بە بەری شوێنکەوتووانیدا لە گیانی برایەتی و دادپەروەری و یەکسانی نێوان هەموو مرۆڤەکاندا.

– دکتۆر (گرینییە) کە ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی فەرەنسا بوو موسوڵمان بوو، کاتێك کە دەربارەی هۆکاری موسوڵمان بوونی لێیان پرسی ئەویش ووتی:

من بەدوای هەموو ئەو ئایەتە قورئانییانەدا چووم کە پەیوەندییان بە زانستی پزیشکی و تەندروستی و سروشتییەکانەوە هەیە کە من لە منداڵییەوە خوێندوومن و چاك شارەزام تێیاندا، بینیم ئەم ئایەتانە بە تەواوەتی یەکدەگرنەوە لەگەڵ زانیارییە نوێکانماندا، هەربۆیە موسوڵمان بووم چونکە لەوە دڵنیابووم کە محمد (ﷺ) حەق و راستی ئاشکرای هێناوە پێش زیاتر لە ١٠٠٠ ساڵ، ئەگەر هەر شارەزایەکی هونەرێك لە هونەرەکان یان زانستێك لە زانستەکانیش هەستێت وەکو من بە بەراورد

کردنی هەموو ئەو ئایەتانەی پەیوەندییان هەیە بەو شتەوە کە ئەو دەیزانێت ئەوا بەبێ گومان موسوڵمان دەبێت وەك من، ئەگەر بێتو دڵ و مێشکی خاڵی بێت لە مەبەستە تایبەتییەکان.

– کەواتە هیچ جۆرە بەربەستێك نییە لەنێوان ئیسلام و زانستدا، و ئەو تەنگژەیەی کە کەوتە نێوان زانستەوە لەگەڵ ئاینی مەسیحیدا بوو بەتایبەتی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا کە لە هەموو شوێنێکی ئەورووپادا ئاینی کەنیسە دادگای تەفتیش و لێپرسینەوەیان دانا بۆ کوشتنی هەموو بیردۆزێکی سروشتی کە جیاوازبێت لە بۆچوونی قەشەکان.

(مارسن کاشن) دەڵێت: دادگاکانی تەفتیش و ڕێکخراوی (ئینکیزیسیۆن)[149]ی سەر بە کەنیسەی کاسۆلیکی هەستان بە لەسێدارەدانی زیاتر لە ٥ ملیۆن کەس بە تۆمەتی دەرچوون لە بیروباوەڕی کەنیسە!

هەروەها لە ماوەی کەمتر لە ١٨ ساڵدا ١٠٢٢٠ کەسی بیریاری سووتاند و ٩٧٣٢٠ زانای سروشتیشی ئەشکەنجەدا! ئەوانەشی کە بە زیندوویی لە خاکدا نێژران ژمارەیان زیاتربوو لە ٣٥٠ هەزار بیریار! هەروەها سەدان کتێبی حەرامکرد لەسەر شوێنکەوتووانی کە بیخوێننەوە و تا ئەمڕۆش ١٠٠ کتێبی بە حەرام داناوە کە شوێنکەوتووانی کەنیسە بیخوێننەوە[150].

بەڵام ئیسلام کە هیچ کاتێك لە ئاستێکدا ناوەستێت بۆ دژایەتی کردنی زانستی سروشتی بەڵکو بەرگێکی پیرۆز دەکات بە بەری لێکۆڵینەوەی زانستیدا وبە پەرستن و ئەرکی سەرشانی موسوڵمانی دیاریکردووە:

---

[149] ئەو ڕێکخراوە بوو کە پاپا (گریگۆری نۆیەم) لە ساڵی (١٢٣٣ن)دا دایمەزراند و لەکارە توندڕەوەکانیاندا تا کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم بەردەوام بوون.

[150] بڕوانە کتێبی (التثقیف الذاتي) نووسەری مەسیحی (سلامة موسى).

﴿طَلَبُ العِلْمِ فَرِيضَةٌ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ﴾ [151].

لە هەموو مێژووشدا نموونەیەك نەسەلماوە كە زانایەك (سیفەتی هەرچۆنێك بوبێت) لەسەر زەوی خۆیدا بەهۆی مەوقیف و بۆچوون و دۆزینەوەكانی لەلایەن ئیسلامەوە ئەشكەنجە درابێت.

– (روم لاندو Rom Landou) لە كتێبی (مآثر العرب في النهضة الأوربية)دا دەڵێت: لەبۆچوونی ئیسلامیدا هەموو شتێك لەلایەن خوداوەیە، هەر لە ترس وزیكری سۆفی، و سۆزی دایك، و خۆشەویستی، تا دەرچوونی تیر، و ئەو تاعونەی كە وڵات كاوڵ دەكات و تەنانەت پێدانی مێشوولەش، هەموو یەكێك لەمانە دەسەڵاتی پەروەردگار دەردەخات هەربۆیە شایەنی لێوردبوونەوە و لێكۆڵینەوەیە، لە ئیسلامدا ئاین و زانست پشتیان لەیەكتر نەكردووە و هەریەكەو رێگەی خۆی بگرێت! بەڵكو یەكەمیان هاندەرێكی سەرەكی دووەم بووە.

كەواتە ئاینی ئیسلام تەنها هاندەر و رابەری زانستەكان بووە ئیتر سروشتی بووێت یان غەیری ئەم، هەر ئەمیش بووە كە ئوممەتێكی نەفامی بەرزكردەوە بۆ لوتكەی زانست و زانیاری و لە زەوییەكەیدا مەزنترین شارستانێتی مرۆڤی چاند، ئیتر موسوڵمانان ئەم چرای رۆشنبیرییەیان هەڵگرت و بە هەموو لایەكی زەوی تاریكدا بڵاویان كردەوە بە مەبەستی روونكردنەوە و رێنیشاندانی مرۆڤەكان بۆ رێگاكانی چاكە و دادپەروەری و جوانی، گۆڤاری زانست (Science)ی ئەمریكی دەڵێت: هۆكاری بڵاوبوونەوەی زانستەكان لەگەڵ دەركەوتن و بڵاوبوونەوەی

---

[151] ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) ئیمامی (إبن ماجة وأبويعلى وابن عبدالبر) گێراویانەتەوە و (الألباني) دەڵێت: فەرموودەیەكی (صحيح)ە. بڕوانە (صحيح سنن إبن ماجة).

ئیسلامدا بریتییه له قورئان خۆی، که دەرباز بوونی وولاتانی ئیسلامی تەنها به فێربوون و شوێنکەوتنەوەی قورئان سەرلەنوێ دەبێت، هەروەها (جاستۆن) دەڵێت: قورئان ئەو بنەمایانەی تێدایە که بناغەی شارستانێتی جیهانه[152].

- مسیو (دیفونیت) دەڵێت: دەبێت دان بەوەدا بنێین که ئەو زانستانەی که ئەوروپایان بووژاندەوه له سەدەی دەیەمی زایینییەوه له قورئانەوه وەرگیراون، موسوڵمانانیش مامۆستای ئەوروپا بوون له سەردەمی وەحشیگەرییەکەیدا له سەدەی نۆیەمەوه بۆ سەدەی سیانزەیەم[153].

هەروەها فەیلەسوفی ئینگلیزی هاوچەرخ (برتراند راسل) دەڵێت: راست نییه که ساڵەکانی نێوان (٦٩٩-١٠٠٠ز) بە سەردەمی تاریکی ناوبنێین چونکه شارستانێتی ئیسلامی لەم سەردەمانەدا له هیندستانەوه بۆ ئەندەلوس لەوپەڕی مەزنی و پرشنگدارییدا بووە، بەکارهێنانی ئەم زاراوەیەش ئەوەی لێدەخوێنرێتەوه که شارستانییەت تەنها بریتییه له شارستانییەتی رۆژئاوا، که تەنها رووپەکێتی[154].

- ئەگەر کتێب بەڵگە بێت لەسەر شارستانێتی میللەتان و خۆشەویستییان بۆ زانست، دەبا گوێبگرین بۆ (جورجی زەیدان) له باسەکەیدا دەربارەی کتێبخانەکانی دەوڵەتی ئیسلامی، که دەڵێت: ژمارەی کتێبەکانەی کتێبخانەی شارێکی وەك (تەرابولس) بە تەنها گەیشتە ٣ ملیۆن، پاشان بەراورد دەکات لەنێوان ئەم و کتێبخانەی پایتەختێکی گەورەی ئەمرۆی ئەوروپا وەك (پاریس) که بەناوبانگترین

---

[152] بڕوانە کتێبی (النبوة والعقل) لا ٦٤.

[153] بڕوانە کتێبی (الإعتذار الى محمد والقرآن) دانانی (جان دیود بورت).

[154] بڕوانە کتێبی (History of Western Philosophy) لا ٤١٠.

کتێبخانـەی (کتێبخانـە ئەهلی)یەکـەی بـووە، ژمـارە کتێبـەکانی گەیشـتە ٢ملیۆن و ٧٠٠ هەزار بەرگ، واتە کەمتر لە کتێبخانەی (تەرابولس) بـە ٣٠٠ هەزار کتێب!![١٥٥]

– قسەکانی (جاکوب سی رایلی) ئەمە دووپات دەکاتـەوە کـە دەڵێـت: بۆ ماوەی زیـاتر لـە ٥ سـەدە ئیسـلام کۆنترۆڵی هـەموو جیهـانی کـرد بـە هێـزی و زانسـتەکانی و شارسـتانییەتە پێشـکەوتووەکەی، کـە میراتگـری فەلسەفە و زانستەکانی ئیغریق بووە، و پاشان هەستا بە گوێزانەوەی ئـەم گەنجینانە پاش ئەوەی کە دەوڵەمەندتری کرد بە فیکر و زانستی خۆی بۆ ئـەورووپا لـە سـەدەکانی ناوەڕاسـتدا، کـە کاریگەرییـە قووڵـەکانی خـۆی بەجێهێڵا لەسەر ژیان و بیرکردنەوەی ئەورووپییەکان[١٥٦] .

– بیریاری بەناوبانگ (سپێنسەر ئەبراهام) دەڵێت: گوێم لە یەکێك لـەو ئینگلیزییانـە بـوو کـە موسـوڵمان بووبـوو دەیـووت: ئایـا هـەموو فەیلەسووفەکانی دونیا دەتـوانن تـەنها یـەك هەڵە لەسـەر قورئـان بگـرن، ئەگەر پشتیش ببەستن بە هەموو ئەو زانیـاری و زانسـتە نوێیانـەی ئـەمڕۆ هەیانە؟!

هەرگیز ناتوانن، ئەگـەر بـە گریمانـەش شـتێك بدۆزنـەوە و وابـزانن کـە هەڵەیە بابزانن کە هەڵەکە لە زانستەکەی ئەواندایـە نـەك قورئـان، چـونکە زانستەکان ڕۆژانە دەگـۆڕێن کـە بـەردەوام دەبنـە هـۆی دەرخسـتنی مانـا دڵـڕفێن و سەرسـوڕهێنەرەکانی ئایەتـەکانی قورئـان کـە پێشـتر نەماندەتوانی بیزانین تاوەکو زانست پێشکەوت، نموونەی ئەمەش ئەوەیـە کـە فەلەکییـەکان سـەرەتا دەیـانووت زەوی جـێگیرە و خـۆر دەجووڵێـت،

---

[١٥٥] بڕوانە (تأريخ التمدن الإسلامي) بەرگی ٣ لا ٢٣٠.

[١٥٦] بڕوانە گۆڤاری (Islamic Review) ژمارەی نیسانی ١٩٦٥.

دوایی ووتیان زەوی دەجوولێت و خۆر جێگیرە، لەکۆتاییشدا ووتیان هەموویان دەجوولێن و خۆریش بۆ ئارامگایەکی خۆی دەجوولێت[١٥٧]، کەواتە لەمانەوە دڵنیا دەبینین کە زانستەکان دەگۆڕێن بەڵام قورئان جێگیرە، هەروەها دەڵێت: لە سەردانێکمدا بۆ شاری (بوتارلییە) چووم بۆ بینینی (د. گرینییە) مامۆستای فەرەنسی بەناوبانگ و ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەران کە بیستم موسوڵمان بووە بە مەبەستی پرسیار کردن دەربارەی هۆکاری موسوڵمان بوونی، کاتێك پرسیارم لێکرد بەم شێوەیە وەڵامی دامەوە: من بەدوای هەموو ئەو ئایەتە قورئانییانەدا چووم کە پەیوەندییان بە زانستە پزیشکی و تەندروستی و سروشتییەکانەوە هەیە کە من لە منداڵییەوە خوێندوومن و چاك شارەزام تێیاندا، بینیم ئەم ئایەتانە بە تەواوەتی یەکدەگرنەوە لەگەڵ زانیارییە نوێکانماندا، هەربۆیە موسوڵمان بووم چونکە لەوە دڵنیابووم کە محمد (ﷺ) حەق و راستی ئاشکرای هێناوە و ئیسلام دژایەتی زانست ناکات ... ئەگەر هەر شارەزایەکی هونەرێك لە هونەرەکان یان زانستێك لە زانستەکانیش هەستێت وەکو من بە بەراورد کردنی هەموو ئەو ئایەتانەی پەیوەندییان هەیە بەو شتەوە کە ئەو دەیزانێت ئەوا بەبێ گومان موسوڵمان دەبێت وەك من، ئەگەر بێتو دڵ و مێشکی خاڵی بێت لە مەبەستە تایبەتییەکان[١٥٨].

[١٥٧] بڕوانە ئەم ئایەتە پیرۆزانە: ﴿وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ﴾ (الأنبياء:٣٣) واتە: خوای پەروەردگارە کە شەو و رۆژ و خۆر و مانگی دروستکردووە و هەموو بە خولگە دەجوولێن، ﴿وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَهَا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ﴾ (یس:٣٧) واتە: خۆر بەرەو ئارامگایەکی خۆی دەڕوات بەخێرایی، کە ئەمە ئەندازەبۆدانانی ئەو خودایەیە کە خاوەنی عیززەت و زانستە.

[١٥٨] بڕوانە گۆڤاری (أجوبة المسائل الدينية) دەورەی ٦ ژمارە ١١ لا ٣٤٧.

- (تۆماس ئارنۆڵد) ڕۆژهەڵاتناسی بەریتانی لە کتێبی (بانگەوازکردن بۆ ئیسلام)دا دەڵێت: ئیسلام لە ناوکرۆکیدا دینێکی عەقڵییە، بە هەموو مانا فراوانە زمانەوانی و مێژووییەکەی ئەم وشەیە، پێناسەی ڕێگەی ژیریی بەوەی کە بریتییە لە هەڵسەنگاندنی بیروباوەڕە ئاینییەکان لەسەر بناغەی عەقڵ بە تەواوەتی بەسەریدا دەچەسپێت[159].

- (Deutsch) دەڵێت: قورئان بریتی بوو لەو پاڵنەرەی کە بووە هۆی بەرز کردنەوەی ئاستی موسوڵمانان و پاڵنانیان بۆ ئەورووپا بۆ ئەوەی کە پاشا و دەسەڵاتداری بن، و بۆ ئەوەی کە مینبەری ئینسانییەت بەرز کەنەوە لەکاتێکدا کە تاریکایی باڵادەست بوو لە هەموو لایەك، بە پاڵنەری قورئان موسوڵمانان ئاڵای حیکمەتیان بەرز کردەوە و خزمەتی زانست و زانیارییان کرد، و زانستەکانی پێش خۆیان زیندوو کردەوە، و بوونە مامۆستای فەلسەفە و فەلەك و پزیشکی و هونەری بیناسازی لە ناوازەترین شێوەیدا بۆ ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواش، کە ئەمە بواری داین بگەینە پێشکەوتنی زانستی نوێ، هەربۆیە دەبێت لە گریان نەوەستین هەرکاتێك کە ئەو ڕۆژەمان بیربکەوێتەوە کە (غەرناتە) تێیدا کەوت و داگیرکرا.

- پرۆفیسۆر (دالماس) ڕاگری کۆلێجی پزیشکی زانکۆی مونبلییە (Montpellier) لە کۆڕێکیدا دەربارەی مێژووی دامەزراندنی ئەو زانکۆ بەناوبانگە ووتی: کاتێك خەڵکی (مونبلییە) لە سەرەتای سەدەی دوانزەیەمی زایینیدا ویستیان زانکۆکەیان دامەزرێنن، بینییان لە شارەکەیاندا ئەو مامۆستا و زانا خاوەن شارەزاییە پێویستەیان نییە بۆ دروستکردنی زانکۆ و ووتنەوەی وانە زانستییە ئاست بەرزەکان، هەربۆیە

---

[159] بڕوانە کتێبی (الدعوة الى الإسلام) لا ٤٥٤- ٤٥٥.

بیریان لەوە کردەوە کە داوای یارمەتی لە زانکۆکانی تر بکەن بۆ ئەم مەبەستە، سەرەتا سەیری زانکۆی (پاریس)یان کرد و بینییان حاڵی لەخۆیان باشتر نییە، پاشان بیریان لە (رۆما) کردەوە و بینییان کە خەڵکی (مونبلییە)ی خۆیان حاڵیان زۆر لەوان باشترە، ئینگلتەرا و ئەڵمانیاش لە هەنگاوە سەرەتاییەکانی زانست و رۆشنبیریدا بوون، دوای گەڕانی زۆر بۆیان دەردەکەوت کە هیچ چارەیەکی تر نییە تەنها داوای یارمەتی نەبێت لەو تەنها وڵاتەی کە دەتوانێت بە مامۆستا و زانای شارەزا تەزویدیان بکات کە ئەویش دەوڵەتی ئیسلامی بوو لە ئەندەلوس، هەربۆیە پەیوەندییان پێوەکرد و هەژارییە زانستییەکەی خۆیان خستە بەردەستیان و پێویستی زۆریان بۆ مامۆستا و شارەزا روونکردەوە، دەوڵەتی ئیسلامیش داواکەی بۆ جێبەجێکردن و بۆ شاری (مونبلییە) ٣ دانەی لە گەورەترین زانایانی پزیشکی و زانستەکان و فەلسەفەی بۆ ناردن، ئەمانیش دەستیان کرد بە ئیشەکەی خۆیان بە گەرمی و زانکۆکەیان رێکخست، بە تایبەتی کۆلیجی پزیشکی لەگەڵ مامۆستا فەرەنسییەکاندا، و بۆ ماوەی ٣ساڵیش بەردەوام بوون لە ووتنەوەی وانە و موحازەرە زانستییەکانیاندا[١٦٠] .

– هەردوو پرۆفیسۆر (Ballasterros) و (Ribera) دەڵێن: قوتابخانەکانی منداڵان لە دەوڵتی ئیسلامیدا بەنزیکەیی بەشی هەموو منداڵانی دەکرد، و خوێندنی باڵاش کۆلیج و پەیمانگای تایبەتی بۆ دروستکرابوو، لەگەڵ ئەمانەشدا ماڵەکانی گەورە زانایان و وەزیرەکان و کاربەدەستان و دەوڵەمەندان پڕ بوو لە کۆڕ و کۆبوونەوە زانستییەکان و خزمەتکار و پارێزەری زانست بوون، یەکەم کۆمەڵگەی زانستی کە

---

[١٦٠] بڕوانە گۆڤاری (العربي) ژمارە ١٠٩ی شەعبانی ١٣٧٨ك.

دروستکرا (بیت الحکمة) بوو لە بەغدا، کۆمەڵگەی زانستی دووەم ئەو کۆمەڵە کۆلیجە بوون کە ناویاننرا (النظامیة) کە وەزیری سەلجوقی (نظام الملك) دایمەزراندن و بەشی ناوخۆییشیان هەبووە، زانا (Reuben levy) باوەڕی وایە کە زانکۆ ئەوروپییە سەرەتاییەکان لەسەر شێوازی (النظامیة) دامەزران[١٦١].

لە قوتابخانە باڵاکانی تر (الرشیدیة والأمینیة والطرخانیة والخاتونیة والشریفیة) لە دیمەشق و (الناصریة والصلاحیة) بوون لە میسر، هەروەها دەڵێت: هیچ شارێکی گەورەش خاڵی نەبووە لە قوتابخانەیەکی لەو جۆرە وەك شارەکانی: قاهیرە و نەیسابوور و سەمەرقەند و بەلەخ و حەلەب و غەزنە و لاهور و غەیری ئەمانەش، لە ئیسپانیاش پەیمانگە زانستییەکان زۆر بڵاوبوون تەنانەت دەڵێن بە تەنها لە (قورتوبە)دا چەند سەد دانەیەك لەم پەیمانگایانە هەبوون، لە هەموو ئەم شوێنە زانستییانەدا فەلسەفە و ئەدەبیات و مێژوو و لقەکانی زانست دەخوێنران بە هاوشانی خوێندنە ئاینییەکان، لە ئیسپانیادا چەندین پەیمانگای زانستی باڵا (کە ئێستا پێی دەووترێت زانکۆ) دامەزران کە لە بەناوبانگترینیان زانکۆکانی: قورتوبە و ئیشبیلیە و مالقە و غەرناتە بوون، لەسەر دەرگای سەرەکی زانکۆی غەرناتە ئەم دەستەواژەیە هەڵکەنراوە: یاسای جیهان لەسەر ٤ بناغە دامەزراوە: دادپەروەری پاشایان و زانستی دانایان و پەرستشی عابیدان و ئازایەتی و چاونەترسی ئازایان، بۆ ئەم زانکۆیانەی موسوڵمانان قوتابییە ئەوروپییەکان دەهاتن بۆ خوێندن و لێکۆڵینەوە[١٦٢].

---

[١٦١] بڕوانە (A. Bayhad. Chronicle).

[١٦٢] بڕوانە کتێبی (الفکر الإسلامي) لا ٥٤– ٥٥.

– (بوکود) دەڵێت: زانکۆکانی موسوڵمانان بە گەرمی پێشوازی لە قوتابییە گاور و جوولەکەکان دەکرد و لەسەر حیسابی خۆی خەرجی بۆ دەکردن، مەسیحییەکان ئەوپەڕی سوودیان لەم بەخششانە دەکرد، هەربۆیە بە بەردەوامی قوتابییان دەنارد بۆ هەموو وڵاتە موسوڵمانەکان، ئەوروپییەکانیش شانازییان بەوەوە دەکرد کە قوتابی زانکۆ ئیسلامییەکان بوون.

لە کۆتاییدا باسی ئەوە دەکەم کە شارستانێتی ئیسلامی لەبەرئەوەی لەسەر بنەماکانی ڕێزلێنانی مرۆڤەکان و باشتر کردنی ژیانیان (لەڕێی هاندانی پێشکەوتنە زانستییەکانەوە) دەمەزراوە، بە درێژایی مێژووەکەی کەمترین راددەی خوێنرشتنی بەرپا کردووە لە مێژوودا.

تەنانەت ئەگەر قوربانیانی هەموو جەنگە ئیسلامییە راستەکان بەدرێژایی ١٤٠٠ ساڵی مێژووی موسوڵمانان کۆبکەینەوە ناگاتە ژمارەی قوربانیانی تەنها هەردوو جەنگە جیهانییەکەی سەدەی بیستەم، فەرموون ئێوە و چەند سەرژمێرییەکی جیهانی لەم بوارەدا:

– کۆی گشتی هەموو کوژراوەکانی جەنگ لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) کە لە ساڵی دووەمی کۆچییەوە تا نۆیەمی کۆچی خایاند بریتی بوو لە (١٠١٨)کەس، کە (٢٥٩)یان موسوڵمان بوون، و (٧٥٩)یان بێباوەڕ بوون.

– بەڵام لەلایەکی ترەوە بابزانین دەوڵەتە داگیرکەرەکانی ئەوروپا و ئاسیا لەم سەدانەی دواییدا بۆ داگیرکردن و ژێردەست کردنی وڵاتانی جیهان بە مەبەستی رووتاندنەوەیان، چ خوێن ڕشتنێکیان بەرپا کردووە:

١– بەریتانییەکان تەنها بۆ ئیستیعمار و داگیرکردنی صین زیاد لە ٢٠ ملیۆن کەسیان لەناوبرد (وەك نەهرۆ دەڵێت)[١٦٣].

---

[١٦٣] بڕوانە: لمحات من تأريخ العالم – جواهر لال نهرو.

تەنها لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا (١٩١٤-١٩١٨ن) کە لەنێوان وڵاتە رۆژئاواییەکاندا روویدا (٢١) ملیۆن کەس بوونە قوربانی، کە لە جەنگدا ٧ ملیۆن کەس کوژران، و ئەوانی تر بە کاریگەرییەکانی جەنگ لەناوچوون.

مستەر ماکستۆن (Maxton) کە ئەندامی پەرلەمانی ئینگلتەرایە وایداناوە کە ژمارەی قوربانیانی جەنگی جیهانی دووەم (١٩٣٩-١٩٤٥) لە سەربازان و کەسانی مەدەنی لە ١٠٠ملیۆن کەس کەمتر نەبووە، ٥٥ ملیۆن کەس کوژران لەگەڵ زیاد لە ٤٥ ملیۆن بریندار و وونبوو، کوشتنی تەنها یەك کەس (١٠٠٠٠) جونەیهی تێچووە، کۆی تێچوونی جەنگ بریتی بووە لە ٣٧ ملیار جونەیهی ئیسترلینی بە پارەی ئەو کاتە، کە تەنها تێچوونی ١ کاتژمێر جەنگ ١ ملیۆن جونەیە بووە !!!!

کۆی گشتی خەسارەت و زیانە ماددییەکانی جەنگ گەیشتە زیاد لە ٤٠٠ ملیار دۆلار!! ئابووریی ناسان دەڵێن: بڕی ئەو پارەیەی کە مرۆڤ لەو جەنگەدا سووتاندی بەدڵنیاییەوە بەشی ئەوەی دەکرد کە بۆ هەر خێزانێك لە وڵاتەکانی: (بەریتانیا، و ئوسکوتلەندا، و ئێرلەندا، و بەلجیکا، و روسیا، و ئەمریکا، و ئەڵمانیا، و کەنەدا، و ئوسترالیا) کۆشکێکی ئامادەکراو بە هەموو ئەساسێکی نایاب دروستکرایە!!

تەنیا قوربانیانی چەکی ئەتۆمی بەکارهێنراو لە (هیرۆشیما و ناگازاکی) یابان لە جەنگی جیهانی دووەمدا لەلایەن ئەمریکاوە گەیشتە (٢٠٠.٠١٠) کەس کە راستەوخۆ گیانیان لەدەستدا بێجگە لە ملیۆنان بریندار و کوێر و شەل و ئیفلیج، تا ئەمڕۆش بەهۆی کاریگەرییەکانی تیشکدانی ناووکیی پاشماوەی بوردومانەکەوە زیاتر لە ٣٠٠هەزار کەسی تر گیانیان لەدەستداوە.

(لینین) بۆ جێگیر کردنی کۆمۆنیستی ٨ ملیۆن کەسی لەناوبرد، و لە قسەیەکی بەناوبانگیدا دەڵێت: من بەلامەوە ئاساییە کە ٢/٢ی

دانیشـتوانی زەوی لـەناو ببـەم بـۆ ئـەوەی کـە ١/٣کـەی تـر بـبن بـە کۆمۆنیست!.

(ستالین) تەنها بۆ جێگیرکردنـی سیسـتمی کێڵگە هەرەوەزییـەکان لـە روسـیادا زیـاد لـە ٢٢ ملیـۆن کەسـی کوشـت و زیـاد لـە ١٠ ملیـۆنی تـری دەربەدەر کرد.

شۆڕشی کۆمۆنیستی صینی بووە هۆی لـەناوبردنی زیـاد لـە ٥ ملیـۆن کەس، چەسپاندنی کۆمۆنیستی لـە تورکسـتانی ئیسـلامی و داگـیر کردنـی لەلایـەن چینیە کۆمۆنیسـتەکانەوە بـووە هـۆی کوشـتنی ٦ ملیـۆن کـەس وەك لە گۆڤاری (ترکستان ملی)دا هاتووە!

ئـەوەی هیندییـە بـت و مانگـا پەرسـتەکان کردیـان بـە موسـوڵمانان لەکاتی جیابوونەوەی پاکستاندا هیچی کەمتر نەبوو لـە کارەکـانی تەتـەرە کۆنەکان، لە پەلامارە دڕندەکانیاندا بۆ سەر موسوڵمانان زیاد لە ٨ ملیـۆن موسوڵمان ئاوارە بوون و روویانکردە پاکسـتان، لەمانـە تـەنا ٣ ملیۆنیـان گەیشتنە پاکستان و ئیتر ٥ ملیۆنەکەی تر لـە رێگـادا گیانیـان لەدەسـتدا، چـونکە بانـد و چـەتەکانی دەوڵـەتی هیندسـتان رێگـەیان پێگـرتن و لـەناویانبردن، و لاشـەکانیان قـەل وداڵ خواردیـان، ئەمـەش دوای شـپرزە کردن و لووت و گوێ بڕینیان!

با کارەساتی ئەو شەمەندەفەرەش بوەستێ کـە وا بڕیـاربوو ٥٠ هـەزار مووچەخۆری دەوڵەت بگوێزێتەوە بۆ پاکستان، کـە سـواری شـەمەندەفەر بـوون و بـەو تونێلـەدا رۆیشـتن کـە دەکەوێتـە نێـوان هیندسـتان و پاکسـتانەوە، جەندرمـە و چـەتەکانی هینـد دەسـتیان لێکردنـەوە و سەرەنجام زۆربەیان لەناوبرد و بریندار کرد[١٦٤].

---

[١٦٤] بڕوانە (في ظلال القرآن) بەرگی چوارەم — لا ١٥١ بۆ ١٥٣.

کەمترین لەم قەسابخانانە فەرەنسا بەرپای کرد کە تەنها لە جەزائیر لەکاتی شۆڕشی سەربەخۆییدا زیاد لە ١.٥ ملیۆن کەسی لەناوبرد!!!

سەرانی سۆسیالیستی وولآتی یۆگۆسلافیا (بەتایبەتی جۆزێف تیتۆ) لەدوای جەنگی جیهانی دووەمەوە زیاد لە ١ ملیۆن موسوڵمانی بێتاوانیان لەناوبرد بۆ جێگیرکردنی ڕژێمەکەیان.

ئەمریکا لە جەنگی ڤێتنامدا کە نزیکەی (١٢) ساڵی خایاند زیاد لە ٢ ملیۆن کەسی ڤێتنامی لەناوبرد لەگەڵ نزیکەی ١٠٠ هەزار قوربانی خۆیدا، بەتەنها هێرشە ئاسمانییەکان بۆ سەر باکووری ڤێتنام زیاد لە ١ ملیار دۆلار زیانی ماددییان گەیاند، لە بەرامبەردا لەو هێرشە ئاسمانییانەدا زیاد لە ٣٠٠٠ فڕۆکەی جەنگی ئەمریکی خرانە خوارەوە کە بایی زیاد لە ٨ ملیار دۆلار بوون، ئەمە بێجگە لە زیانە ماددییەکانی تر کە بە ملیارەها دۆلاری تر مەزەندە کراوە.

هەر ئەوەندەش بەسە کە بزانین چەندین ڕۆژهەلآتناس و زانای ناسراوی ڕۆژئاوا دوای لێکۆڵینەوەی لایەنە ناوازەکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بیروباوەڕی تەواویان بەوە هێنا کە تەنها دینی راست و دروستە، و موسوڵمان بوونی خۆیان بە هەموو دونیا راگەیاند، لەوانە: نووسەری فەرەنسی (ألفونس إيتين دينيه)، ڕۆژهەلآتناسی بەریتانی (لۆرد هدلی)، نووسەری ئینگلیزی (تۆماس کارلیل)، نووسەری نەمساوی (لیوبۆڵد فایس) کە موسوڵمان بوو ناوی خۆی گۆڕی بۆ (محمد أسد)، پرۆفیسۆری فەرەنسی مارکسی (ڕۆجێە گارودی) کە ناوی خۆی گۆڕی بۆ (رەجاء گارودی)، و پزیشکی بەناوبانگی فەرەنسی (مۆریس بۆکای) و چەندینی تریش.

# دوا سەرنج

لە کۆتایی ئەم بابەتەدا پێم خۆشە کەمێك باسی ئەو هۆکارانە بکەین کە بوونە هۆکاری دواکەوتنی جیهانی ئیسلامی و موسوڵمانان لە رەوتی شارستانییەت و پێشکەوتنی زانستی.

دیارە هۆکارەکانی بارودۆخێکی ئاوەها ئاڵۆز و پەلدارن و پێویستی بە لێکۆڵینەوەی دوورودرێژ هەیە، بەتایبەتی بۆ ئەم چەند سەدەیەی دوایی ژیانی موسوڵمانان، و هەروەها بۆ هۆکارەکانی پێشکەوتنی میللەتانی تر بەتایبەتی گەلانی رۆژئاوا، بەڵام ئەوەی من لێرەدا مەبەستمە ئەوەیە تیشك بخەینە سەر هێڵە گشتییەکانی ئەم بابەتە، ولە دەرەنجامی گشتی ئەو باسانەی لەم کتێبەدا تاوتوێمان کردن ئەم خاڵانەی خوارەوە دەتوانین کۆبکەینەوە:

١- لە سەردەمانی زێرینی ئیسلامیدا پێشرەوی و جڵەوی جیهانی ئیسلامی (وهەموو جیهانیش) بەدەست کەسانێکەوە بوو کە هەر یەکێکیان بریتی بوون لە موعجیزەیەکی گەورە بۆ پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) لەرووی بیروباوەڕ و کار وکردەوە و رەووشت و پەروەردە و نەرمی و پاك وپوختی و بەرزیی دەروون و کاملّی و ناوەندیی لە هەموو کارێکیاندا، هەریەکێك لەمانە لەهەمان کاتدا پارێزکار و زاهید و پاڵەوان و زانا و دادپەروەر و فەقیە و کاربەدەستێکی لێزان و دەستپاك و سیاسییەکی لێهاتوو بوون، بەڵام ئەوەی کە جێگەی داخە و لە خراپی بەختی هەموو جیهانیشە ئەوەیە کە لە سەردەمانی دواییدا کەسانێك

بـوون بــه كاربەدەســت و پێشــەنگ كــه لێهــاتوو و بــەتوانا نــەبوون و پەروەردەیەكی پێویستی ئاینی و دونیایی نەكرابوون وەك كەسـانی پـێش خۆیـان بـۆ ئـەوەی كـه بتـوانن بـەو ئەركـه گەورەیـەی سەرشـانیان وەك پێویست هەڵبستن، ئەمـەش بـه تایبـەتی دەبیـنین لـه كۆتـایی سـەردەمی عەبباسییەكان و سەردەمی عوسمانییەكاندا.

٢- ڕوودانی چەندین دەستكاریی و تێكدان له ژیانی موسوڵماناندا، كـه بوونه هۆی پەیدابوونی درزی گەوره له بینای شارستانی ئیسلامیدا كـه تـا ئەمڕۆش نەتوانراوه دابخرێن، لەو لادانه گەورانەی ژیانی ئیسلامی بریتییـه لەجیاكردنەوەی دین له دەوڵەت بەشێوەیەكی پراكتیكی بـەپێی بۆچـوونی عەلمانی، كه ئەمه چاولێكەری بوو بۆ كەسانی تر بەتایبەتی بۆ ڕۆژئـاوا، و وویسترا ئەو تاقیكردنەوەیەی ئەویێ بەسەر ژیانی ئێمەدا جێبەجێ بكرێـت، و جیاوازییـه گـەورەكانی نێـوان ئێـره و ئـەوێ پشـتگوێ خـران، ئەمـه لـه ژیـانی ئێمــەی موســوڵماندا لێــدانێكی گــەورەبوو، چــونكه ئــەم كــرداره لەئەورووپادا بووه هۆی لابردنی كۆسپی سـەر ڕێـی پێشـكەوتن (كـه ئـاینی مەسیحییەت بوو).

بەڵام لەلای ئێمه بووه هۆی نەمانی ئەو پاڵنـەره دەروونییـه بـەهێزەی كــه هانــدەری زانایــانی پێشــوومان بــوو بــۆ تێـڕوانین و لێكۆڵینــەوه و بەرەوپێش چوون، كه وەك بینیمـان لـه باسـەكانی ئـەم كتێبـەدا زانایـانی ئێمــه هانــدەری گــەورەیان بــۆ دۆزینــەوه و داهێنــان بریتــی بــوون لــه ئایەتـەكانی قورئـانی پـیرۆز و فـەرمودەكانی پێغەمبـەر (ﷺ)، هـەروەها ســـەرهەڵدانی ناكۆكییـــه جاهیلییـــەكان لـــەنێوان پیـــاوانی دەوڵـــەت و

هاوولاتیانـدا، و خـەڵکی پشـتیان لێکـردەوە و تـەنها بـە خۆشـییەکانی ژیانەوە سەرقاڵ بوون کە بەهۆی ئەمـەوە پێشـەنگییەکەیان لەدەستدا، و هـەر میللـەتێك بـەو شـێوەیە بکەوێتـە نـاو نـاکۆکی و سـەرقاڵ بـوون بـە خۆشییەکانی ژیانەوە ئەوا ناتوانێت کە رابەرایەتی بگرێتە دەسـت لـە هـەر بـوارێکی ژیانـدا، و تەنانـەت ناتوانێـت کـە ژیـان و سەربەسـتی خۆیشـی بپارێزێت ﴿سُنَّةَ اللَّهِ فِي الَّذِينَ خَلَوْا مِن قَبْلُ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلًا﴾ (الأحزاب:٦٢).

٣- سـەرقاڵ بـوونی زیـاد لـە رادده بـە زانسـتە فەلسـەفییەکان و ئیلاهییـەکانی یۆنانییـەکان بـە تایبـەتی لـە سـەدە دواییەکانـدا، کـە لـە راسـتیدا زوربـەی بۆچـوونەکانیان بریتییـە لـە ئاکـامی بتپەرسـتی ئیغریقییەکان و پۆشاکی فەلسەفەیان کرد بە بەریدا و بریتین لە گومـان و مەزەنـدە کـردن و رازاندنـەوەی ووشـەکان کـە هـیچ جـۆرە راسـتییەك و مانایەکی سوودبەخشی نییە.

خـوای گـەورە موسـوڵمانانی لـەم نـەفامی وئاڵۆزکارییـە پاراسـتووە بەوەی رێ رۆشنکەرەوەیەکی ئاشـکرای بـۆ نـاردوون لـەم بـوارەدا کـە لـە دەقەکانی قورئان وسوننەتدا روونکراونەتەوە، و لە هیلاکی و ماندووبوونی گـەڕان و پشـکنین بـەدووری خسـتوون، بـەڵام موسـوڵمانان بەگشـتی و زانایانیـان بەتایبـەتی سوپاسـگوزاری پـەروەردگار نـەبوون لەسـەر ئـەم نیعمەتـە و بـۆ مـاوەی چـەندین سـەدە لـە رۆژهـەڵات و رۆژئـاوادا لـەبری سەرقاڵ بوون بە زانستە سروشتییە پراکتیکییەکان کە بۆ ژیانی رۆژانەیان پێویسـتە و مایـەی پێشـکەوتن و خۆشـگوزەرانییانە، ئـەوان زیـاتر بـە

موجادەلە و گفتوگۆ فەلسەفییەکان و کەلامییەکانەوە سەرقاڵ بوون کە ناتگەیەنێتە ئەنجام، و زووربەی کاتەکانیان بەبێ هودە بەسەرچوو و زیرەکی و عەقڵی خۆیان لەو بوارانەدا سەرفکرد.

٤- پشگوێ خستنی زانستە سروشتییە پراکتیکییە بەسوودەکان لەلایەن زانایانی سەردەمە دواییەکانەوە، و سەرقاڵ بوونیان بە تەواوەتی بە دووبارە کردنەوە و قووڵ کردنەوەی زانستە شەرعییەکان بەشێوەیەکی هیلاککەر، کە تەنها کاریان بریتی بوو لە کورتکردنەوەکان و راڤەکان و پەراوێزدانان لەسەر کتێبە زانستییەکانی پێشتر، لەگەڵ ئەمەشدا وەك ئاماژەمان پێدا ئەم سەردەمانەی دوایی خاڵی نەبووە لە دەرکەوتنی کەسانێکی هەڵکەوتوو لەبوارە زانستییە جۆراوجۆرەکاندا، کە ژمارەیان کەمبووە و ئەوەی کە بەجێیان هێلا لە پاشماوە زانستییەکانیان زۆر کەمە لەچاو ئەو بەرهەمە زانستییە گەورەیەی کە رۆژئاوا بەرهەمیانهێنا بەتایبەتی لە سەدەکانی ١٧ و ١٨ی زایینیدا.

٥- هەروەها با کاریگەریی گەورەی فاکتەرە دەرەکییەکانمان لەبیرنەچێت، کە هەروەك باسمانکرد هێرشی مەغۆلەکان بووە مایەی کاولکردنی جیهانی ئیسلامی بەشێوەیەکی نزیك لە تەواو، و فەوتاندنی میراتە زانستییە هەرە گەورەکەیان، پاشان لە سەدەکانی دواتریشدا داگیرکردنی وولاتانی جیهانی ئیسلامی لە سەدەکانی ١٨ و ١٩ و ٢٠ی زایینی لەلایەن وولاتە داگیرکەرە رۆژئاواییەکان و بە تالان بردنی خێروبێرەکانیان، ئەوەندەی تر بارودۆخەکەی ناخۆشتر و دواکەوتووتر کرد.

کەواتە کۆبوونەوەی فاکتەرە ناوخۆیی و دەرەکییەکان پێکەوە بوونە هۆی بەرهەم هێنانی ئەم بارە دواکەوتوو و ناهەموارەی ئەمڕۆ جیهانی ئیسلامی تێیکەوتووە، و ئاشکراشە کە هەرکاتێك موسوڵمانان دەستیان گرتبێت بە راستی بە ئاینەکەیانەوە و بە تەواوەتی ئامۆژگاری و فەرمانەکانی پەروەردگاریان جێبەجێ کردبێت ئەوا هەمیشە سەرکەوتوو و پێشەنگ بوون، وئەم فەرمانبەردارییەیان مایەی خۆشگوزەرانییان بووە لە هەموو بوارەکانی ژیانیاندا.

لە کۆتاییدا دەڵێم (ئەو کەسە کەسە ئەلفێکی بەسە)، ئیتر با حاڵەتی نائاسایی ئەمڕۆی موسوڵمانان نەکرێت بە بەڵگە بەسەر شارستانییەتی ئیسلامییەوە، و مرۆڤ دەبێت بە بیرێکی فراوان و هەمەلایەنەوە مەسەلەکان لێکبداتەوە.

ئیسلامیش هەموو کاتێك ئەو فاکتەرە پێویستانەی تێدایە کە دەبێتە هۆی پێشکەوتنی موسوڵمانان بە مەرجێك موسوڵمانان ئیسلام بەرپابکەن لە ژیان و کۆمەڵگاکەیاندا.

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين.




هەندێك لە دیارییەكانی ( هارون الرشید ) بۆ شارلەمان





كتاب الخوارزمي

خەواریزمی و یەكێك لە دانراوەكانی لە بیركاریدا



چەند نوسراوێکی بیرکاری و هەندەسی زانا موسوڵمانەکان



وێنەی کۆمەڵە ئەستێرەی (ڕووبار) وەك بە خەیاڵی زانا (الصوفی)دا هاتووە



لاپەڕەی یەکەمی کتێبی (القانون المسعودي) لە دانراوی زانای موسوڵمان (البيروني) کە دەربارەی بیرکاری و گەردوونزانییە



وێنەیەك لە کتێبی (الزيج) دانراوی زانا (ابن الشاطر) لە گەردوونزانیدا، لێرەدا بارەکانی مانگ ڕووندەکاتەوە



**چەند وێنەیەکی ئامێری (الإسطرلاب) یان (ئاوێنەی ئەستێرە بینین) بە جۆرە جیاوازەکانیەوە (تەخت و خڕ و خاوەن ئەڵقە)، کە لەلایەن موسوڵمانانەوە دروستکراون**






**کۆمەڵە ئەستێرەییەکانی ئاسمان هەروەك بە خەیاڵی زانا (الصوفی)دا هاتووە و لەسەر گۆیەك کێشراوە کە لە دروستکردنی موسوڵمانانە**



**گۆیەکی ئاسمانی کە لە وڵاتی فارس لە ساڵی (١٣٦٢ز)دا دروستکراوە، و لە مۆزەخانەی مێژووی زانست لە زانکۆی (ئۆکسفۆرد) پارێزراوە**



وێنەیەکی بینگەی ( جایپور ) لە خوارووی رۆژئاوای شاری ( دەلهی ) لە هیندستان، کە لەسەر شێوازی بینگەی ( مەراغە ) دروستکراوە، لە وێنەکەدا ئەو زنجیرە بینا گەورانە دەبینین کە بەکار دەهێنران بۆ تێڕوانینی جوولەی خۆر و دانانی لە بازنەی بورجەکاندا، هەروەها کاتژمێرێکی خۆریش دەبینین بۆ دیاری کردنی کات



ئەم دوو وێنەیە لە کتێبێکی گەردوونزانی موسوڵمانانەوە وەرگیراوە ( عجائب المخلوقات للقزويني )، کە دیاردەی خۆرگیران و مانگگیران روون دەکاتەوە، لە ئەنجامی سووڕانەوەی زەوی بەدەوری خۆردا و مانگ بەدەوری زەویدا، لێرەوە دەبینین کە چۆن زانایانی موسوڵمان باوەڕیان بە خڕێتی زەوی و مانگ و خۆریش هەبووە، هەروەك لە وێنەکانەوە رووندەبێتەوە



چەند لا پەڕەیەك لە كتێبی ( عجائب المخلوقات وغرائب الموجودات ) دانراوی ( القزويني )



وێنەیەكی ڕوونكەرەوەی بارەكانی مانگ

لە كتێبی ( التفهيم )ی زانا ( البيروني )

وەرگیراوە ( لا پەڕە ٣١ )



چەند وێنەیەكی ئەو ئامێری ( الإسطرلاب )انەی كە لە وولأتانی مەغریب و ئەندەلوسی ئیسلامیدا دروستدەكران. ئەم نموونانە لە مۆزەخانەی مێژووی زانست لە زانكۆی ( ئۆكسفۆرد ) پارێزراون.



ما الكواكب الثابتة والسيارات

وێنەی لاپەڕەیەکی یەکێك لە کتێبەکانی زانا (بەیرونی) کە تێیدا تاقیکردنەوە ئەنجام دەدات لەسەر هێزی کێش کردنی زەوی، و باسی هەسارەکان وجووڵەی زەوی و مانگ دەکات، ئەم نوسراوە لە مۆزەخانەی بەریتانیدا پارێزراوە.





چەند وێنەیەکی قیبلەنوما کە لەلایەن موسوڵمانانەوە دروستکراوە بۆ دیاریکردنی ئاراستەکان لەسەر رووی زەوی.





چەند وێنەیەکی تری قیبلەنوما کە لەلایەن موسوڵمانانەوە دروستکراوە بۆ دیاریکردنی ئاراستەکان، بەتایبەتیش بۆ دیاریکردنی شوێنی شاری مەککەی پیرۆز



ڕووی پێشەوەی کاتژمێرێکی ئاوی کە لە شێوەی قەڵایەکدایە لە دروستکردنی زانای موسوڵمان ( الجزری )یە و لە کتێبەکەیدا لە بابی یەکەم/ فەصلی یەکەمدا هێناویێتی، ئەم کتێبە لە کتێبخانەی ( بودلیان )دا پارێزراوە



کتێبی ( الزیج ) دانراوی کوڕانی موسی بن شاکر



کتێبی ( الحیل ) دانراوی موسی بن شاکر




ئامێری قووچەکی ( بەیروونی ) کە ( خازین ) لە کتێبەکەیدا هێناویێتی و بەکاردێت بۆ دەرهێنانی کێشی جۆری تەنەکان، ئەم دەفرە پڕدەکرا لە ئاو تاوەکو لێواری خوارەوەی کونی ( F )، کاتێك نموونەی ئەو ماددەیە دەخرایە ئاوی کە دەیوویست لێی بکۆڵێتەوە، ئاوەکەی ئاوی بەرز دەبووەوە و لە بۆری ( D )یەوە دەهاتە دەرەوە، ولەسەر تەرازووی ( C ) دەکێشرا. ئەگەر کێشی تەنێك لە هەوادا ( W1 ) بێت و بڕی ئاوی لادراو ( W2 ) بێت، ئەوا کێشی جۆری ئەو تەنە = W2÷W1.

وێنه و هێلکارییەك كه ئامێری تەرازووی حیکمەت ( میزان الحكمة ) یان ( الميزان الجامع ) له دروستکردنی زانای موسوڵمان ( خازین ) روون دەکاتەوه، که بۆ دەرهێنانی کێشی جۆری تەنەکان بەووردیی بەکاردەهێنرا








هێلکاری چەند دەفرێکی بلیمەتانەیە له دروستکردنی کوڕانی ( موسی بن شاکر )ە، له کتێبێکیاندا که ( ١٠٠ ) ئامێری بەسوودی جۆراوجۆری لەخۆگرتووه ( له ساڵی ٨٥٠ز )دا نووسیویانه و ئەم ئامێره نموونەی ( چل و چوارەمه )، که بەکاردەهێنرێت بۆ دەرهێنانی ٣ جۆر شلەمەنی جیاواز بەدوای یەکدا




هێلکاریی ئامێری رژێنەری جێگیر له دروستکردنی کوڕانی ( موسی بن شاکر ) ژماره ( ٧٧ )، وەسفی کاری ئەم ئامێرەیان بەوه کردووه که بەردەوام لێی دەرببێنێت بەڵام ئاستەکەی هیچ کەمناکات. ئەمه بۆ کەسێك بووه که نهێنی ئەم ئامێرەی نەزانیایه، مەبەستی سەرەکی له دروست کردنی بۆ خۆشی و گاڵتەوگەپ بووه




هێلکاریی جەرخەیەکی ئاسۆیی لەناو ئامێری فوارە ( ئافورە )ی کوڕانی ( موسی بن شاکر )دا ، ژمارە ( ٩٣ )، کە ئەم ئافورەیە هەر سەعاتەی بەجۆرێك ئاو فرێ دەدات : بەرێکی، بە پانی و شێوازی تریش




هێلکاریی ئامێری ( چرای کوڕانی موسا ) لە دروستکردنی کوڕانی ( موسی بن شاکر ) ژمارە ( ٩٧ )، کە بریتیە لە چرایەك کە خۆی بۆ خۆی سووتەمەنی دەدات و هاوسەنگی دەکات




ئامێرێکی مۆسیقی لە دروستکردنی کوڕانی ( موسی بن شاکر ) کە خۆی بۆ خۆی ئیش دەکات



**چرایەکی ئۆتۆماتیکی لە دروستکردنی ( محمد بن موسی بن شاکر )**







**چەند لاپەڕەیەك لە کتێبی ( الجامع بین العلم والعمل النافع في صناعة الحیل ) لە دانانی زانا ( ابن الرزاز الجزري )**



**بەلەمێك كە خۆی بۆ خۆی دەجوولێت ( ذاتي الحرکة ) لە کتێبی ( في معرفة الحیل الهندسیة ) دانراوی زانا ( الجزري ) ( بابی دووەم/ فەصلی چوارەم )**





دوو وێنەی ئامێرێکی مۆسیقا کە خۆی بۆ خۆی ئیش دەکات، لە دروستکردنی زانا ( جەزری ) لە کتێبی ( الجامع بین العلم والعمل النافع في صناعة الحیل ) دا بابی چوارەم/ فەصلی هەشتەم، ( نوسخەی کتێبخانەی بودلیان )




ئامێرێکی میکانیکی کە خۆی بۆ خۆی دەجووڵێت لە دروستکردنی زانای کورد بدیع الزمان ( الجزری )





وێنەی سەعاتی فیلەکە،کە یەکێکە لەگرنگترین داهێنراوەکانی زانا ( جەزری )، لەگەڵ نموونەیەکی راستەقینەی ئەو سەعاتە کە لە مۆزەخانەی ( ئەبو زەبی ) لە وولاتی ئیمارات دروستکراوە



کاتژمێری مۆمەکە، لە دروستکردنی زانا ( جەزری )، کە لە کتێبەکەیدا (في معرفة الحيل الهندسية ) بابی یەکەم/ فەصلی هەشتەم هێناویێتی. وێنەی لای راست لە کتێبەکەوە وەرگیراوە و هێلکاری لای چەپ روونکەرەوەی وێنەکەیە.




هێڵكاریی كاتژمێرێكی ئاوی لە دروستكردنی زانا ( جەزری )، كە لە كتێبەكەیدا هێناونی لە فەصلی یەكەم و سێیەمدا




كاتژمێری ( طاوسەكان ) لە داهێنانی زانا ( جەزری )



ترومپا ( مضخة )ی زانا ( جەزری ) كە لە كتێبەكەیدا هاتووە، بابی پێنجەم/ فەصلی پێنجەم، بۆ ئاو هەڵكێشان بەكاردێت

ئەودیو: ٢ هێڵكاری بە كۆمپیوتەر دروستكراوی هەمان داهێنراوەكەی ( جەزری )یە كە ووردەكارییەكەی بەئاشكرا دەردەخات








ئامێرێکی میکانیکی لە داهێنانی زانا (جەزری)، کە لە کتێبەکەیدا هێناویێتی



ئامێرێکی دەستشۆری میکانیکی لەداهێنانی ( جەزری ) لە کتێبەکەیدا







**چەند ئامێرێکی تری میکانیکی لە کتێبەکەی زانا ( جەزری )دا**










ئامێرێکی بەرز کردنەوەی ئاو لە کتێبی ( الجامع بين العلم والعمل النافع في صناعة الحيل )، بابی پێنجەم/ فەصلی چوارەم ( کتێبخانەی بودلیان )، لەگەڵ هێلکاریی بەشێکی ئەم ئامێرە میکانیکییە



ئامێرێکی بەرز کردنەوەی ئاو لە کتێبی (الجامع بین العلم والعمل النافع في صناعة الحيل)ی (جەزری) بابی پێنجەم/ فەصلی سێیەم (کتێبخانەی بودلیان)، ئەم ئامێرە ترومپایەکی خاوەنی پستۆنە، کە یەکەمە لەجۆری خۆی لە هەموو جیهاندا، مێژوونوسانی زانست و تەکنەلۆجیا وەك (نیدهام) دەڵێن: (دەستکەوتێکی گرنگی مێژووی هەندەسەی میکانیکە)





فوارەی ئاوی زانا جەزری لەگەڵ ئامێرێکی تری بەرز کردنەوەی ئاو لە کتێبەکەیەوە (الجامع بین العلم والعمل النافع في صناعة الحيل) وەرگیراوە، کتێبخانەی (بودلیان)



قولاپی راکێشەری دەفری (مەحار) لە دروستکردنی کورانی موسا، نموونەی ژمارە(١٠٠) کە بەکاردەهێنرا بۆ دەرکێشانی گەوهەر لە دەریاوە، هەروەها بۆ دەرهێنانەوەی ئەو شتانەی دەکەوتنە ناو بیرەکان و روبار و دەریاوە

ترومپا (مضخة)ی خاوەن ٦ پستۆنی لە دروستکردنی زانا (تقی الدین) (٩٦٦ك - ١٥٥٩ز)، کە زۆر پراکتیکیە بۆ راکێشان و بەرزکردنەوەی ئاو، و لەسەر بیرۆکەیەکی میکانیکی زۆر وورد و داهێنراو کاردەکات

ئامێرێك کە خۆی بۆ خۆی کاردەکات، لە دروستکردنی زانا(المرادي)، لە کتێبی (الأسرار في نتائج الأفكار)، لە کتێبخانەی (لورنسین) لە فەرەنسا پارێزراوە، ئەم زانایە لە سەدەی پێنجەمی کۆچی (یانزەیەمی زایینی)دا ژیاوە

لای راست وێنەیەك لە کتێبی (جەزری) کە هێلکاری ئامێرێکی هەلگرتنی زانیارییە، لای چە پیش ئامێرێکی میمۆری کۆمپانیای (کینگستۆن) بەتوانای خەزنی (١ تێرابایت)






ئیمام جەعفەری سادیق ( ٧٦٨ز مردووە ) دەڕوانێتە کیمیازانی بەناوبانگ ( جابیری کوڕی حەییان )، ئەم دانراوە لە کتێبخانەی بەریتانی پارێزراوە.



کرداری دڵۆپاندن ( التقطير ) لە دەستنووسێکی موسوڵمانانەدا ڕوونکراوەتەوە





چەند وێنەیەك لە کتێبی جوگرافیایی زانا ( ئیدریسی ) کە چەندین نەخشەی جۆراوجۆری تێدایە



نەخشەی
هەموو جیهان
بە بۆچوونی
زانای
موسوڵمان
( ئیدریسی )




نەخشەی شاری ( مارسیلیا )ی
فەرەنسی لەکێشانی
( الشريف الإدريسي )




نەخشەی هەموو جیهان کە لەلایەن چەند زانایەکی موسوڵمانەوە کێشراون



نەخشەی هەموو جیهان دانراوی حاجی (زینج هی) کە زانایەکی موسوڵمانی خەڵکی صینە، لەساڵی (١٤١٨ز) کێشاویێتی، لەم نەخشەیەدا بەئاشکرا هەردوو ئەمەریکاکە دەبینین!؟ ئەمە پێش دۆزینەوەیەتی لەلایەن (کریستۆڤ کۆلۆمبۆس)ەوە



دەستنووسێکی موسوڵمانان لە جوگرافیادا

وێنەی وولاتە ئیسلامیەکان بە پێی شاری مەککەی پیرۆز کە لەلایەن زانا (الصفاقسی )یەوە کێشراوە لە کتێبێکیدا لە ساڵی( ٩٥٨ك - ١٥٥١ز)دا

رحلة ابن جبير الاولى من غرناطة الى سبتة وعبر البحر المتوسط الى الاسكندرية وثم براً الى عيذاب ومنها بحرا عبر البحر الاحمر الى جدة فمكة ومنها الى المدينة والكوفة والى بغداد والموصل وثم الى حلب ودمشق ومنها عودة للبحر الى صقلية حيث مكث قليلا وبعدها الى موطنه غرناطة

رێڕەوی گەشتەکانی گەریدەی موسوڵمان ( ئیبن جوبەیر )

رێڕەوی گەشتەکانی گەریدەی موسوڵمان ( ئیبن بەتووتە )



بەشێك لە كتێبی (Rockets، Missiles and Space Travel) كە باسی دروستكردنی ساروخەكان دەكات لەلای موسوڵمانان، و نموونەیەكی لە كتێبی (حسن الرماح)ەوە هێناوەتەوە



ئەم دەستنووسەی ئاژەڵناسی موسوڵمانان باسی هەندێك زیندەوەری ئاوی دەكات

چەند لاپەڕەیەك لە هەندێك كتێبی رووەكناسی موسوڵمانان، كە وەسفی هەندێك رووەك و سوودە پزیشكییەكانی دەكات











توێکاری مرۆڤ لە کتێبێکی پزیشکی موسوڵمانانداتوێکاری چاو لە کتێبێکی نیبنولهەیسەمدا



چەند کتێبێکی پزیشکی کلینیکیی موسوڵمانان وشێوازی پشکنینی نەخۆشەکان






چەند لاپەڕەیەکی هەندێك دەستنووسی پزیشکی موسوڵمانان




ئامێرە پزیشکیەکان لە چەند لاپەڕەیەکی دەستنووسێکی ( أبوالقاسم الزهراوی )
دەربارەی پزیشکی ونەشتەرگەری



زانای مێژوونوسی موسوڵمانی کورد ( ئیبنولموستەوفی ئەربیلی )
و نوسراوەکەی لەسەر مێژووی هەولێر ( تأریخ إربل )




سندوقێکی دارین لە رازاندنەوەی موسوڵمانان

## هەندێك نموونە لەو كتێبە دەستنوسانەی كە موسوڵمانان لە بوارە زانستییە جۆراوجۆرەكاندا دایانناوە:

### __بیركاریی:__



كتێبی (الأعداد المتحابة) دانراوی (ثابت بن قرة) كەلە كتێبخانەی (**ئایا سۆفیا - ئیستەمبوڵ**) پارێزراوە، ئەم كتێبە سەرچاوەیەك بوو بۆ ئەوروپا تا سەدەی شانزەیەم

(الباهر في الجبر) دانراوی: (السموٴال بن يحيي المغربي) (١١٧٤ز) مردووە (مۆزەخانەی ئایا سۆفیا)، ئەم نووسەرە لێرەدا ئەوەی (الكرجي) نووسیوێتی لەسەر (سێگۆشە ژمێرياريیەكان) نەقڵ دەكات، كە ئەمە یەكەم جارە لە مێژووی بیركاریدا باسی (سێگۆشە ژمێرياريیەكان) كرابێت

كتێبی (مفتاح الحساب) دانراوی (غياث الدين جمشيد بن مسعود الكاشي) (توپكاپی سەرا: ئیستەمبوڵ)، ئەم لاپەڕەیە بریتیە لە خشتەیەك بۆ دەرهێنانی ڕەگی پێنجەمی ئەم ژمارانە: ١٧٩، ٥٠٦، ٨٩٩، ٢٤٠، ٤٤

لاپەڕەیەكی تری كتێبی (الباهر في الجبر)، بڕوانە ئەم خشتە جەبرییە وورده



کتێبی (في قطوع الإ سطوانة وبسیطها) دانراوی (ثابت بن قرة) (ئایا صۆفیا)، ئەم زانایە حیسابی هەرە ووردی تەواو بەرەو پێش برد، لەم کتێبەیدا حیسابێکی ووردی لوولە ناتەواوەکان دەکات

کتێبی (پوختەی دانراوی کوڕانی موسی لەسەر رووبەری شێوە سادە و گۆییەکان)، دانراوی (نصیرالدینی طوسی)، (کتێبخانەی نیشتمانی لە قاهیرە) ئەم نامەیە وەرگێڕدراوە بۆ زمانی لاتینی



کتێبی (في مساحة قطع المخروط المكافیء) دانراوی (إبراهیم بن سنان بن ثابت)، (کتێبخانەی نیشتمانی لە قاهیرە)، چەندین بیرۆکەی زیرەکانەی داهێناوە بۆ دۆزینەوەی رووبەری برگەی قووچەکی هاوتا



کتێبی (في البركار التام) دانراوی (أبوسهل القوهي)، (کتێبخانەی نیشتمانی لە قاهیرە)، لەم کتێبەدا چۆنیتی کێشانی تەنە هەندەسییەکان بەبەکارهێنانی پرگاڵ باسکراوە

کتێبی (في استخراج مساحة الجسم المكافيء) دانراوی (أبوسهل یحیی بن رستم القوهي) (سەدەی دەیەمی زایینی)، (مۆزەخانەی ئایا صۆفیا)، کە لەسەر بنەمای حیسابە ووردەکانی (ثابت بن قرة) دایناوە

# گەردوونزانی:



کتێبی (إستیعاب الوجوة الممكنة في صنعة الإسطرلاب) دانراوی (ئەبی رەیحانی بەیرونی)، کە دەربارەی دروستکردنی ئامێری ئیستێرلابە





کتێبی (الزیج) دانراوی (محمد کوڕی موسای خەواریزمی) (سەدەی سێیەمی کۆچی)، لە پوختەکردنی (مسلمة المجریطي) (سەدەی چوارەمی کۆچی) و وەرگێڕانی (ئەدیلارد دو باپ)، ئەم کتێبە دەقە عەرەبیەکەی نەماوە تەنها ئەم وەرگێڕانە لاتینیە نەبێت کە لە کتێبخانەی زانکۆی (ئۆکسفۆرد) پارێزراوە



کتێبی (التذكرة)ی (نصیرالدین الطوسي) (سەدەی سیانزەی زایینی) لە راڤەکردنی (نظام الدین النیسابوري)، کە کتێبێکی گەردوونزانی‌یە و لێرەدا راڤەیەکی جوان دەبینین بۆ خولگەکانی هەسارەی (مەریخ)





دوو لاپەڕە لە کتێبی (عجائب المخلوقات)ی زانا (قەزوینی) کە لە کتێبخانەی (فلۆرانس) لە ئیتاڵیا پارێزراوە، دەبینین ئەم زانایە دیاردەی خۆرگیران و مانگگیران بە وێنە روونده‌کاتەوە



چەند لاپەڕەیەك لە کتێبی (القانون المسعودي) دانراوی زانا (بەیرونی) (٤٢٦ك-١٠٣٥ز) لە کتێبخانەی نیشتمانی لە قاهیرە پارێزراوە



چەند وێنەیەکی کتێبی (صور الكواكب الثابتة) دانانی زانا (الصوفي) (٩٠٣-٩٨٦ز)، لەم وێنانەدا ئەم زانایە خۆی وێنەی بورجەکان و کۆمەڵە ئەستێرەکانی ئاسمانی کێشاوە، کە بریتین لە: وورچە بچکۆلە، کاوڕ، و فەریك



کتێبی (رسالة في كيفية الإرصاد) دانراوی (موئەیەدودینی عەرەزی) (سەدەی سیانزەی زایینی)، ئەم کتێبە تەرخانکراوە بۆ دیزاینی ئەو ئامێرانەی بۆ بینگەی (مەراغە) پێویست بووە



کتێبی (نهاية الإدراك في دراية الأفلاك) دانراوی زانا (قطب الدين الشيرازي) (١٣١١ز مردووە)، کە دەربارەی زانستی فەلەکە (کتێبخانەی نیشتمانی لە قاهیرە)

## سروشتزانی (فیزیا)، زانستی میکانیك (علم الحيل):



لاپەڕەی یەکەمی کتێبی (المناظر)ی ئیبنولهەیسەم (١٠٤٠ز مردووە)، لە کتێبخانەی (الفاتح)ی ئیستەمبوڵ پارێزراوە، ئەم کتێبە یەکێکە لە دانراوە کاریگەرەکانی مێژووی زانست کە دەربارەی ڕووناکیزانی (علم البصريات) دواوە، کاریگەریی گەورەی کردە سەر فیزیای نوێ لە ئەورووپا لە سەدەی حەڤدەیەمی زایینیەوە



کتێبی (الأسرار في نتائج الأفكار) دانراوی (ابن خلف المرادي) (سەدەی ١١ی زایینی)، لە کتێبخانەی (فلۆرەنسا) پارێزراوە، یەکێکە لە کتێبە گرنگەکانی زانستی (الحیل) کە ٣١ ئامێری لەخۆ گرتووە لەوانە ١٩ کاتژمێر بە جۆرە جیاوازەکانیەوە:

ئاویی و جیوەیی .... هتد





چەند لاپەڕەیەك لە کتێبی (میزان الحكمة) دانراوی (خازین) لە ساڵی (٥١٥ك–١٢١١ز)، کە تێیدا تەرازویەکی ووردی دروستکردووە بۆ دەرهێنانی کێشی جۆری تەنەکان



لە سەرەوە: وێنەی ئامێری (میزان الحكمة) لە کتێبی خازیندا

لەخوارەوەش: هێلکارییەکەیەتی



چەند لاپەڕەیەك لە كتێبی (الحيل في الفنون الغريبة) دانراوی (جەزری)، كە لێرەدا بەشی سەرەكی سەعاتێكی ئاوی ڕووندەكاتەوە لەگەڵ گواستنەوەی جووڵە بۆ بەشەكانی تری كاتژمێرەكە



چەند لاپەڕەیەك لە هەمان كتێب، لێرەدا سیستمێكی جووڵاندن دەبینین كە بە خەیاڵی (جەزری)دا هاتووە، كە هاوبەشە لەنێوان ئاژەڵ و هێزی ئاویی





چەند لاپەڕەیەك لە كتێبی (في معرفة الحیل الهندسیة) دانراوی (جەزری) كە بریتییە لە گرنگترین دانراوی موسوڵمانان لە جووڵەزانی (علم الحیل)دا، لێرەدا باسی سیستمێكی ئاودێری دەكات كە بە ئاو دەجووڵێت



ئەم ئامێرەش كە لەسەر شێوەی تاووسە ئاو بۆ دەستنوێژ دەڕژێنێت





کتێبی (الطرق السنية في الآلات الروحانية) دانراوی زانا (تقی الدين) له (١٥٥٩ز)، پاش ئەوەی له سەرەتای کتێبەکەدا باسی ئامێرە جەنگییەکان دەکات دوایی گرنگی داوه به ئامێرەکانی ئاو بەرز کردنەوە، لێرەدا یەکێك لەو ئامێرانه دەبینین.



لاپەڕەیەك له کتێبی (تنقيح المناظر لذوي الأبصار والبصائر) دانراوی (كمال الدين الفارسي) که ئەم کتێبه پوختەی (المناظر)ی زانا (إبن الهيثم)ە، لێرەدا ئیبنولهەیسەم باسی هەڵخەڵەتانی بینین دەکات له ئەنجامی وێنەدانەوەی ئاوێنەوە، به تایبەتی له ئاوێنەکانی جۆری: تەخت و گۆیی و لوولەیی و قووچەکی، جا قۆقز بن یان چاڵ



لەم لاپەڕەیەی کتێبی (تنقيح المناظر لذوي الأبصار والبصائر) که وەرگیراوه له (المناظر)، ئیبنولهەیسەم لێکۆڵینەوە دەکات لەسەر دیاردەی بڵاوبوونەوەی رووناکی، که به دوورودرێژی باسی کاری ئامێرێك دەکات که ناوی ناوه (ئامێری پەرچ دانەوە)، که بەکاردێت بۆ سەلماندنی یاسای پەرچ دانەوە له بارە جیاوازەکاندا، له تەختە و مس دروستکراوە



لاپەڕەیەکی تری هەمان کتێبی پێشوو، لێرەدا لێکۆڵینەوەی کردووە لەسەر شکانەوەی ڕووناکی لەناو گۆیەکی ڕووندا، کەبەهۆیەوە لادانی گۆیی دۆزیوەتەوە



لەم لاپەڕەیەی کتێبی (تنقيح المناظر لذوي الأبصار والبصائر) کە وەرگیراوە لە (المناظر)، ئیبنولهەیسەم لێکۆڵینەوەی لەسەر خۆرگیران و مانگگیران کردووە و بەشێکی کتێبەکەی بۆ تەرخان کردووە، لەم لاپەڕەیەی کتێبەکەدا بەهێڵکاری ئەم کردارەی ڕوون کردۆتەوە



لاپەڕەیەکی تری کتێبی پێشوو، کە دەبینین هەردوو زانا (ئیبنولهەیسەم) و (كمال الدين الفارسي) سەرکەوتوو بوون لە شەرح کردنی دیاردەی ڕەنگاڵە (قوس قزح) پێش (أنطوان دو دومینیس **Antoine de Dominis**) و (دیکارت)، هەروەها لە دیاردەی (الهالة)شیان کۆڵیوەتەوە کە لێرەدا (هالەی سپی) دەبینین





دوو لاپەڕەی تری کتێبی پێشوو، ئیبنولهەیسەم بە تەواوەتی بۆچوونی (بینین)ی گۆڕی، پێش ئەم وایاندەزانی بینین بەهۆی دەرچوونی تیشکێك دەبێت لە چاوەوە بۆ تەنەکان، بەڵام ئەم بۆ یەکەم جار لە مێژوودا راستیەکەی دەرخست کە بە پێچەوانەوەیە، و ئەم دۆزینەوەیە وای لێکرد بەشێوەیەکی باشتر لە چاو بکۆڵێتەوە و چۆنێتی وەرگرتنی تیشکەکان لە تەنەکانەوە، لێرەدا ئەم بۆچوونەی ئینولهەیسەم بە روونی دەبینین

## زیندەوەرزانی:



لاپەڕەیەکی کتێبێکی کشتیاریی دانراوی موسوڵمانان



لاپەڕەیەکی کتێبێکی ئاژەڵناسی و لێکدانەوەی سروشت و ڕەووشتەکانی گیانداران کە لە دانراوەکانی موسوڵمانانە



چەند لاپەڕەیەکی کتێبێکی تری ئاژەڵناسی و لێکدانەوەی سروشت و ڕەوشتەکانی گیاندارانی کە لە دانراوەکانی موسوڵمانانە




توێکاری ئەسپێک کە لە کتێبێکی ئاژەڵناسی موسوڵمانانەوە وەرگیراوە

## جوگرافیا:



کتێبی (نزهه المشتاق فی اختراق الآفاق) دانراوی زانا (ئیدریسی)، نەخشەیەکە وێنەیەکی تەواوی جیهان دەردەخات لە مەغریبەوە بۆ هیند بەپێی وەسفکردنی زانا (ئیدریسی)






چەند لاپەڕەیەك لە کتێبی (صورة الأرض)، لای ڕاست: نەخشەیەکی هەموو جیهانە، ولای چەپ: نەخشەیەکی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامییە

## زانستی پزیشکی:







بەرگی کتێبی (القانون في الطب) دانراوی (ئیبن سینا)، کە وەرگێڕدراوە بۆ لاتینی و لە شاری (ڕۆما)ی ئیتاڵیا لە ساڵی (١٥٩٣ز)دا چاپکراوە



کتێبێکی تری (ئیبن سینا) بە ناوی (کتاب النجاة مختصر الشفاء)





چەند لاپەڕەیەکی کتێبی نەشتەرگەری (الجراحة) دانراوی (شرف الدین) کە ساڵی (١٤٦٦ز) دایناوە بە پشت بەستن بە کتێبی (الزهراوي)، لەم وێنانەدا چەند پرۆسەیەکی پشکنین و چارەسەری نەخۆش ڕووندەکاتەوە







چەند لاپەڕەیەکی کتێبی نەشتەرگەری (الجراحة) دانراوی (أبو القاسم الزهراوي)، کە لە کتێبخانەی (لیدن) لە (هۆڵەندا) پارێزراوە، لە سەرەوە: وێنەی چەند ئامێرێکی نەشتەرگەری کێشاوە، و لە خوارەوەش: چەند ئامێرێکی ددان پاك کردنەوەیە.



وەرگێڕانی کتێبی (نەشتەرگەری) لەلایەن (جیراردی کریمۆنی)،کە بیری نەچووە وێنەکانی (زەهراوی) بکێشێتەوە دەربارەی ئامێرەکانی نەشتەرگەری، ئەم وەرگێڕانە چەندین جار چاپکراوەتەوە، و کاریگەریی گەورەی کردە سەر ئەورووپا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا



لاپەڕەیەکی تر لە کتێبەکەی (زەهراوی) کە چەند ئامێرێکی تری نەشتەرگەری ڕوون دەکاتەوە



کتێبی توێکاری (تشريح المنصوري) لە دانانی (منصور بن محمد بن أحمد بن فقيه إلياس) کە لە کتێبخانەی نیشتمانی (پاریس) پارێزراوە، لە سەدەی نۆیەمی کۆچی– پانزەیەمی زاییینیدا نوسراوە، یەکێك لە پزیشکەکانی شاری شیراز نوسیوێتی و سەرچاوەیەکی فێربوون بووە، ئەم وێنەیە سیستمی دەماریی مرۆڤ دەردەخات



لاپەڕەیەکی تری کتێبی توێکاری (تشريح المنصوري) کە لە مۆزەخانەی بەریتانی لە (لەندەن) پارێزراوە، ئەم وێنەیەش پێکهاتنی کۆرپەلە لە سکی دایکیدا روون دەکاتەوە



چەند وێنەیەکی وەرگیراو لە کتێبی پزیشکی توێکاری (ابن إسحاق)، لەم دوو وێنەیەدا توێکارییەکی جوانی چاو و مێشك دەبینین لەگەڵ باسکردنی کارەکانیاندا



لاپەڕەیەکی کتێبی (الكافي في الأدوية) دانانی (عبدالرشيد بن صالح) لەم کتێبەدا رێکخستنێکی ئەبجەدی دەبینین بۆ رووەکە جۆراوجۆرەکان لەگەڵ وێنەیان و بەکارهێنانە پزیشکییەکانیان، کەواتە پوختەیەکی دانراوەکانی پێش خۆیەتی

# سەرچاوەکان


- قورئانی پیرۆز.

- تەفسیری ئاسان بۆ تێگەیشتنی قورئان/ م. بورهان موحەممەد ئەمین/ چاپی شەشەم – ٢٠٠٤.

- فتح الباري شرح صحيح البخاري/ الإمام ابن حجر العسقلاني/ مكتبة دار السلام/ الطبعة الثالثة – ٢٠٠٠.

- صحيح مسلم بشرح الإمام النووي/ الإمام يحيى بن شرف النووي/ دار المعرفة/ الطبعة السادسة – ١٩٩٩.

- سلسلة الأحاديث الصحيحة/ محمد ناصرالدين الألباني/ مكتبة المعارف– الرياض/ ٢٠٠٤.

- سنن الترمذي/ حكم على أحاديثه وعلق عليه: محمد ناصرالدين الألباني/ مكتبة المعارف – الرياض.

- سنن النسائي/ حكم على أحاديثه وعلق عليه: محمد ناصرالدين الألباني/ مكتبة المعارف – الرياض.

- سنن ابن ماجة/ حكم على أحاديثه وعلق عليه: محمد ناصرالدين الألباني/ مكتبة المعارف – الرياض.

- من روائع حضارتنا – د. مصطفى السباعي– دار ابن حزم– ٢٠١٠.

- کتێبی (العلم والإيمان في الفضاء والطيران)/ دانراوی (د. أحمد بن ظافر القرني)/ دار الشريف للنشر والتوزيع –١٩٩٧.

- العلوم والهندسة في الحضارة الإسلامية (لبنات أساسية في صرح الحضارة الإنسانية)/ دانراوی (دونالد ر. هیل)/ وەرگێڕانی (د. أحمد فؤاد باشا)/ لە بڵاوکراوەکانی (عالم المعرفة – الكويت)، زنجیرە: ٣٠٥ / یۆلیۆ–٢٠٠٤.

- دراسات في تأريخ الحضارة الإسلامية/ د. حسان حلاق/ دار النهضة العربية– بيروت/ الطبعة الثانية–١٩٩٩.

- المرجع في الحضارة العربية الإسلامية/ د. إبراهيم سلمان الكروي، د.عبدالتواب شرف الدين/ منشورات ذات السلاسل/ الكويت–١٩٨٧.

- فصول من تأريخ الحضارة الإسلامية/ د. طه ندا / دار النهضة العربية - بيروت.
- موسوعة الحضارة العربية (العصر الأندلسي)/ د. قصي حسين/ دار البحار- بيروت/ الطبعة الأولى-٢٠٠٥.
- تأريخ العرب وحضارتهم في الأندلس/ د.خليل إبراهيم السامرائي، د. عبدالواحد ذنون طه، د. ناطق صالح مطلوب/ دار المدار الإسلامي/ الطبعة الأولى - ٢٠٠٤.
- الأمة الأندلسية الشهيدة (تأريخ ١٠٠ عام من المواجهة والإضطهاد بعد سقوط غرناطة)/ عادل سعيد بشتاوي/ المؤسسة العربية للدراسات والنشر/ الطبعة الأولى/ بيروت - ٢٠٠٠.
- العرب والتربية والحضارة - الإختيار الصعب/ د. محمد جواد رضا/ منشورات ذات السلاسل/ الكويت-١٩٨٧.
- قطوف دانية من مآثر المسلمين وظلام الغرب/ إبراهيم النعمة/ مطبعة الزهراء/ الموصل-٢٠٠٣.
- المسلمون والعلم الحديث - عبدالرزاق نوفل.
- موسوعة العلامة عبدالمجيد الزنداني/ إعداد: د. علي أبوالخير/ دار الخير/ بيروت - دمشق - ٢٠٠٦.
- بناء الكون ومصير الإنسان/ هشام طالب/ دار المعرفة/ بيروت - ٢٠٠٦.
- إسهام علماء المسلمين في الرياضيات/ د. علي عبدالله الدفاع/ دار الشروق/ بيروت - ١٩٨١.
- أعلام الفلك في التأريخ العربي/ د. علي حسن موسى/ منشورات وزارة الثقافة في الجمهورية السورية/ دمشق - ٢٠٠٢.
- المنجد في اللغة والأعلام/ المطبعة الكاثوليكية/ دار المشرق - بيروت/ الطبعة الأربعون - ٢٠٠٣.
- ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمين/ أبوالحسن علي الحسني الندوي/ مكتبة الإيمان- مصر.
- الإسلام أبداً / هادي المدرسي/ دار الصادق/ بيروت - ١٩٧٣.
- مقدمة ابن خلدون/ عبدالرحمن بن محمد بن خلدون/ دار الأرقم - بيروت.
- مروج الذهب ومعادن الجوهر/ أبي الحسن علي بن الحسين المسعودي/ دار المعرفة/ الطبعة الأولى - ٢٠٠٥.

- الجامع بين العلم والعمل النافع في صناعة الحيل- بديع الزمان اسماعيل بن الرزاز الجزري- تحقيق: د.محمد طاهر العقبي- دار آراس/ منشورات الجمل-ط١: ٢٠١٧.
- الغناء والمعازف في الإعلام المعاصر/ د. محمد عبدالرحمن المرعشلي/ دار المعرفة/ بيروت-٢٠٠٦.
- الكامل في التأريخ/ عزالدين بن علي الجزري/ دار الطباعة-القاهرة.
- تأريخ البيمارستانات في الإسلام/ د. أحمد عيسى بك/ دار الرائد العربي - لبنان ١٩٨١.
- التأريخ الإسلامي (١-٢٢)/ محمود شاكر/ المكتب الإسلامي- ط٨/ بيروت -٢٠٠٠.
- تأريخ الإسلام السياسي الديني الثقافي الإجتماعي (الأجزاء: ١-٤)/ د. حسن إبراهيم حسن/ دار الجيل/ الطبعة الخامسة عشرة - ٢٠٠١.
- العراق في التأريخ/ مجموعة من الأساتذة/ بغداد - ١٩٨٣.
- أهم الأحداث التأريخية (١٦٠٠ قبل الميلاد - ١٩٩٣م)/ حمدو طماس/ دار المعرفة/ بيروت - ٢٠٠٣.
- التفسير الإسلامي للتأريخ/ د. عمادالدين خليل/ الطبعة الرابعة - ١٩٨٦.
- دراسات تأريخية/ د. عمادالدين خليل/ دار إبن كثير/ الطبعة الأولى-٢٠٠٥.
- الموقف من التأريخ الإسلامي وتأصيل الهوية/ د. حامد محمد الخليفة/ دار القلم/ دمشق - ٢٠٠٥.
- تجارة المحيط الهندي في عصر السيادة الإسلامية (٤١-٩٠٤هـ : ٦٦١-١٤٩٨م)/ د. شوقي عبدالقوي عثمان/ له بلاوكراوەکانی (عالم المعرفة-الكويت)، زنجيره: ١٥١ / يۆليۆ-١٩٩٠.
- أطلس التأريخ العربي الإسلامي/ د. شوقي أبوخليل/ دار الفكر/ دمشق - ٢٠٠٢.
- أطلس تأريخ العرب والإسلام/ د. سيف الدين الكاتب/ المؤسسة العلمية للوسائل التعليمية - ٢٠٠٥.
- أطلس تأريخ العرب والعالم/ د. سيف الدين الكاتب/ المؤسسة العلمية للوسائل التعليمية - ٢٠٠٥.
- الأطلس الإسلامي الجديد/ كمال هاشم محمود/ دار القلم العربي.
- موسوعة تأريخ العلوم العربية (الجزء الأول)/ علم الفلك النظري والتطبيقي/ إشراف: رشدي راشد/ مركز دراسات الوحدة العربية/ الطبعة الأولى-١٩٩٧.

- موسوعة تأريخ العلوم العربية (الجزء الثاني)/ الرياضيات والعلوم الفيزيائية (الرياضيات العددية، الجبر، الهندسة، المثلثات، الرياضيات التحليلية، الموسيقى، الستاتيكا، المناظر والطبيعيات)/ إشراف: رشدي راشد/ مركز دراسات الوحدة العربية/ الطبعة الأولى-١٩٩٧.
- موسوعة تأريخ العلوم العربية (الجزء الثالث)/ التقانة - الكيمياء - علوم الحياة (الهندسة المدنية والميكانيكا، الجغرافيا الإنسانية، الفلاحة، الكيمياء، الطب)/ إشراف: رشدي راشد/ مركز دراسات الوحدة العربية/ الطبعة الأولى-١٩٩٧.
- القانون في الطب/ الشيخ الريس أبوعلي المعروف بابن سينا/ دار إحياء التراث العربي/ الطبعة الأولى - ٢٠٠٥.
- سەرجەمی بەرهەمی (محەممەد ئەمین زەکی بەگ) (یەکەم بەرگ)/ سدیق سالح/ بنکەی ژین/ سلێمانی- ٢٠٠٥.
- دائیرەتولمەعاریف (فەرهەنگی زانیاری و هونەر) - بەشی یەکەم/ ئەندازیار خوسرەو جاف/ چاپخانەی شڤان/ چاپی دووەم-٢٠٠٧.
- ئینسایکلۆپیدیای گشتی/ یاسین صابر صالح/ چاپ و پەخشی سەردەم/ سلێمانی - ٢٠٠٥.
- شەوکار (فەرهەنگێکی تایبەتمەندی کیمیایە)/ جەمال عەبدول/ لەبڵاوکراوەکانی ناوەندی رۆشنبیر/ ١٩٩٨.
- فەرهەنگی (ژین)/ عەرەبی - کوردی/ رزگار کریم/ سلێمانی- ٢٠٠٧.
- توخمەکان/ ئەسعەد قەرەداخی/ چاپی یەکەم- ٢٠٠٦.
- ئاشتی لە ئیسلامدا/ ئەحمەد کاکە مەحموود/ لەبڵاوکراوەکانی گۆڤاری (النفیر)/ چاپی یەکەم - ١٩٩٢.
- پەروەردە لە ئیسلامدا/ ئەحمەد کاکە مەحموود/ چاپخانەی ئەسعەد - ١٩٨٥.
- سەربەستی لە ئیسلامدا/ ئەحمەد کاکە مەحموود/ چاپخانەی نەورەس/ سلێمانی - ١٩٨٣.
- ساڵنامەی (١٩٩٨)ی سلێمانی/ ئامادەکردن و کۆکردنەوەی: فازل علی عەباس/ وەزارەتی ناوخۆ-پارێزگای سلێمانی.
- رۆژمێری هاوسەر- ١٩٩٠/ هۆشیار محەممەد عەزیز/ لەبڵاوکراوەکانی پرۆژەی هاوسەر (٤١)- سلێمانی.
- رۆژمێری هاوسەر- ٢٠٠٢/ هۆشیار محەممەد عەزیز قەفتان/ لەبڵاوکراوەکانی پرۆژەی هاوسەر (١٥٠)- سلێمانی.

- موسوعة أعلام الكرد المصورة (الأجزاء: ١-٢)/ خسرو الجاف/ دار الشؤون الثقافية العامة/ بغداد: ٢٠٠٢، ٢٠٠٤.
- أعلام كرد العراق/ جمال بابان/ منشورات وزارة الثقافة/ السليمانية - ٢٠٠٦.
- مشاهير الكرد وكردستان/ تأليف: محمد أمين زكي بەك/ مؤسسة (ژين)/ السليمانية - ٢٠٠٥.
- معجم أعلام الكرد (في التأريخ الإسلامي والعصر الحديث في كردستان وخارجها)/ د. محمد علي الصويركي/ مؤسسة (ژين)/ السليمانية - ٢٠٠٦.
- قصة الحضارة - المجلد السابع (١٣-١٤)- عصر الإيمان (الحضارة الإسلامية)/ تأليف: ول ديورانت/ ترجمة: محمد بدران/ دار الجيل- بيروت/القاهرة - ٢٠١٠.
- قصة الحضارة - المجلد التاسع (١٧-١٨)- عصر الإيمان ٠ عصر النهضة (إنتقال المعارف)/ تأليف: ول ديورانت/ ترجمة: محمد بدران/ دار الجيل- بيروت/القاهرة - ٢٠١٠.
- الغرب نحو الدرب/ محفوظ العباسي/ مطبعة الزهراء/ الموصل-١٩٨٧.
- بابەتی: (أوائل المسلمين في العلوم التجريبية)/ نووسینی: د. أحمد هجوان/ لەئینتەرنێتەوە وەرگیراوە، سایتی:
(الهيئة العالمية للإعجاز العلمي في القرآن والسنة).
- سایتی: (موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة)/ بابەتەکانی:
  - ❖ الحضارة العربية الإسلامية في العصور الوسطى والتحدي المعاصر: أ. د. مسلم شلتوت (أستاذ بحوث الشمس والفضاء المعهد القومي للبحوث الفكية والجيوفيزيقية بحلوان).
  - ❖ شبهة حول مد الأرض ودحوها وكرويتها: بقلم الأستاذ عبد الرحيم الشريف (ماجستير في تفسير القرآن وعلومه).
  - ❖ كتاب (عجائب المخلوقات وغرائب الموجودات للقزويني): إعداد الدكتور نظمي خليل أبو العطا.
  - ❖ علماء الإسلام يجمعون على كروية الأرض: بقلم الأستاذ عبد الرحيم الشريف.
  - ❖ علماء الإسلام يجمعون على كروية الأرض الجزء الثاني: بقلم الأستاذ عبد الرحيم الشريف.
  - ❖ نقد شبهة أن علماء الإعجاز ( يسرقون جهود ) علماء الغرب وينسبونها للإعجاز القرآني: بقلم الأستاذ عبد الرحيم الشريف.

❖ هكذا كانوا يوم كنا: الدكتور حسان شمسي باشا (طبيب وكاتب إسلامي سوري مقيم في السعودية).
- سايتی (www.islamweb.net)/ بابەتی: فضل الحضارة الإسلامية على العلوم الطبية: (د . هناء إسماعيل).
- سايتی (www.husseinhilmi.jeeran.com)/ بابەتی: من روائع حضارتنا الإسلامية: (د.حسين حلمي السرابي).
- پێگەی (www.moe.edu.kw) کە سایتی (وەزارەتی پەروەردە)ی کوێتە/ بابەتی (التوجية العام للعلوم: أضف إلى معلوماتك).
- سايتی (www.dmweblog.net): بابەتی: (Digital Mind: كتاب (أحمد زويل) عصر العلم).
- Rockets, Missiles and Space Travel \ Willy ley\ Revised Edition-1958.
- Dictionary of Technical Terms for Aerospace use\ William H. Allen\ First Edition-1965\ National Aeronautic and Space Administration, Washington, D.C. NASA.
- Flight: 100 Years of Aviation\ R. G. Grant\ DK multimedia\ UK-2002.
- Encyclopedia Britannica ultimate reference suite DVD: history of medicine: E. Ashworth Underwood, Philip Rhodes: The roots of Western medicine: Christian and Muslim reservoirs of learning: Arabian Medicine.
- Microsoft Encarta reference library DVD: The Greatest Medical Discoveries of the Millennium.
- http://www.wikipedia.org: Wikipedia, the free encyclopedia that anyone can edit.
- لەگەڵ چەندین کتێب و بابەتی جۆراوجۆری تر کە لە کاتی باسەکاندا ناویان هاتووە ئەگەر یەکێك دەیەوێت بگەڕێتەوە بۆی، هەروەها چەندین سایتی ئینتەرنێتی جۆراوجۆری کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی سوودیان لێوەرگیراوە بۆ ئامادەکردنی بابەتەکان.

# پێڕست

## بەشی دووەم

## هەندێك لە زانا موسوڵمانە هەڵكەوتووەكان لە بوارە زانستییە

## بەشی سێیەم

## بەشی چوارەم

## بەشی پێنجەم

**- د. کاوە فەرەج سەعدون.**

– لەدایکبووی: ساڵی ١٩٧٣ لە شاری سلێمانی.

– هەڵگری بڕوانامەی بەکالۆریۆسە لە هەناوی ونەشتەرگەری گشتیدا (M. B. Ch. B) لە زانکۆی سلێمانی ساڵی:١٩٩٧-١٩٩٨.

– بڕوانامەی ماستەر (M.Sc.) لە نەخۆشییەکانی سنگ – ٢٠١٠.

– ماوەی ٢٠ ساڵە کاردەکات لە نەخۆشخانەکانی شاری سلێمانی و دەوروبەریدا وەك پسپۆڕی نەخۆشیەکانی سنگ و کۆئەندامی هەناسەدان.

– ماوەی ٢٥ ساڵ زیاترە کاردەکات لە بواری ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا بە نووسین و وەرگێڕان و ووتاردان.

– بەشداری چەندین کۆنگرە و کۆنفرانسی زانستی کردووە لە ناوەوە و دەرەوەی کوردستان.

– خاوەنی دەیان بابەت و توێژینەوە و نوسینی پەروەردەیی، زانستیی، و پزیشکییە، هەروەها دەربارەی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا کە لە چەندین گۆڤار و ڕۆژنامە و سایتەکانی ئینتەرنێت و تۆڕە کۆمەڵایەتیەکاندا لە کوردستان بڵاوکراونەتەوە.

– سەدان بەرنامەی تەلەفیزیۆنی و رادیۆیی تۆمارکردووە دەربارەی بابەتە پزیشکییەکان، وزانست و ئیمان، وئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا کە لە چەندین کەناڵی سەتەلایت و ناوخۆیی و کەناڵی رادیۆییەوە پەخشکراون.

**دانراوەکانی نووسەر:**

١- بەڵگە ئاشکراکان

٢- ڕۆژوو موعجیزەیەکی زانستییە

٣- ئاماژەکانی کۆرپەلەزانی لە قورئان و سوننەتدا

٤- قەیرانی وویست و وویژدانی موسوڵمان

٥- محمد (ﷺ) ڕێبازی ژیان – بەرگی پێنجەم: چەند موعجیزەیەکی پرشنگدار لە فەرموودە و ڕەووشتی پێغەمبەری ڕێزدار

٦- ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا – بەرگی یەکەم

٧- ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا – بەرگی دووەم

٨- ڕۆڵی زانایانی موسوڵمان لە پێشکەوتنە زانستییەکاندا